نـــــــاوی کتێب: شەرحی (أصول السنه) ی پێشەوا أحمد بن حنبل.
دانانـــــــــــــی: د. إحسان برهان الدين.
نۆرەو سـالّی چـــاپ: یەکەم، سالّی ٢٠٢٣.
ژمـارەی سپـــــاردن: (  )ی سالّی (٢٠٢٣) ی پێدراوە.

---

دەزگای چاپ و پەخشی نارین
هەولێر/ بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی
Website: www.nareenpub.com
E-mail: nareenpub@gmail.com
مۆبایل: ٠٠٩٦٤٧٧٣٤٠٦١٠١٠

# شەرحی

# ( أصول السنه ) ی

# پێشەوا أحمد بن حنبل

## لەگەڵ پاشکۆیەکی پێناسەکردنی فیرقە و تاقمەکان


دانانی

د. إحسان برهان الدين



دەزگای چاپ و پەخشی

ئاریـن

# پیشەکی

الحمد لله وكفى وصلى الله وسلم على نبيه المصطفى وعلى آله وصحبه ومن وفى.

تەوحید کۆڵەکەی هەرە مەزنی ئیسلامە، هەموو پێغەمبەرانیش علیهم السلام، بۆ چەسپاندنی ئەو بنەمایە لەلایەن الله عزوجل ڕەوانە کراون، ئەمەش وا دەکات واجبی یەکەمی موسوڵمان گرنگیدان بێت بە زانستی عەقیدە، لە ڕووی زانستییەوە بایەخی پێ بدات و لە ڕووی بەرجەستە کردنیشەوە لە ژیانی ڕۆژانەیدا و لە هەموو کاروبارێکیدا ڕەنگ بداتەوە.

موسوڵمان دەبێت هەموو شتێك لە ژیانی خۆیدا ببەستێتە بە عەقیدەوە و بنەماکانی ئیمان و تەوحید وسوننەت بکات بە مەشخەڵی ڕێگا بۆ خۆی، لە عیبادەتەکانی و لە ڕەفتار و مامەڵەکانی لەگەڵ دەروبەردا، لە تێڕوانینی بۆ هەموو پرسە جۆراوجۆرەکان و لە هەموو ئەوەی لە ژیانیدا پەیوەندی بە سیاسەت و ئابوری و کۆمەڵایەتی وهەر لایەنیکی ترەوە هەیە، دەبێت ڕەهەندێکی عەقیدەو بیروباوەری لێ دەربهێنێت و لەو ڕوانگەوە تەماشای بکات و وەرگرتن و رەتکردنەوەی بۆ هەر پرسێك پێویستە لە ڕۆشنایی ئەو بیروباوەڕەیدا بێت.

بیروباوەڕی پەسەند و وەرگیراو لەلای الله تعالى بیروباوەڕ و عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت و فەرموودەناسانە، جگە لەئەوان هەموو تێگەیشتن و تاقمەکانی تر لە ڕێگای ڕاستی کیتاب و سوننەت لایانداوە و بۆ کەس درووست نییە شوێنکەوتوویان بێت.

لە درێژایــی مێژووشــدا هــیچ زەبرێکــی کوشــندە و زیــانبەخش بەر موســوڵمانان نەکەوتووە، ئەوەندەی دوورکەوتنەوەیان لە فێربوونی تەوحیـد و عەقیـدەی ڕاسـت، ئەوە بەڕاستی ڕێگای مەینەتـی دونیـا و دواڕۆژە بۆیـان و لەبەرانبەریشـدا تەوحیـد ودوورکەوتــنەوە لە بیــدعەی عەقیــدەو هەمــوو بیــدعەیەکی لە ئیســلامدا ڕێگــای بەختەوەری و خۆشییە بۆیان.

لەم سەردەمەشــدا بەداخەوە نەشــارەزایی موســوڵمانان لە دینەکەیــان و بەتــایبەتی لاوازییــان لە بوارەکــانی تەوحیــد و ئیمانــدا، ڕێــگەی بــۆ نەیــارانی دینەکەیــان خۆشکردووە بۆ هەر مەبەستێکی ناکۆك لە گەڵ بنچینەکـانی دینەکەیانـدا بەکاریـان بهێنن و چەواشەیان بکەن و هەموو هۆکارێك بەکار بهێنن بۆ درێژەدان بەو ئاگـایی و خەوە قورســەی موســوڵمانان، هانــدەر و هۆکــاری درێــژەدانیش بەم حــاڵەتە نەخوازراوە ئەوەیە، موسوڵمان لە بابەتەکانی عەقیدە بەگشتی و لە مەسەلەی (الولاء والبراء) بەتایبەتی کە بەشێکە کە لە کرۆکـی تەوحیـد وئـیمانە لەلایـان لاواز بـووە وسـنوورەکانی نێـوان موسـوڵمانان و موشریـك و بـێ بـاوەڕان زۆر کـاڵبووەتەوە و گـوێنەدان بە پرسـەکانی عەقیـدە بـووەتە بەشـێك لە پێشـکەوتن و بـووە بە مـۆرکی کۆمەڵگای پێشکەوتوو!

بۆ نموونە بەلای خەڵکی ئەم سـەردەمەوە ئەگەر کەسـێك بڕوانـامەیەکی ئەکـادیمی نەبێت، ئەوە کەمتەرخەمی و عەیبەیەکی کۆمەڵایەتییە، ئەگەر لە زۆر بـواری ژیانـدا وەکو سیاسەت و تەکنەلۆجیا وزانینی زمانی ئینگلیزی بۆ نموونە لاواز بێت هەست بەکەمـی دەکـات، بەڵام لە دینەکەیـدا بە گشـتی و لە عەقیـدەدا بەتـایبەتی ئەگەر

جاهل بێت و هیچی لێ نەزانێت نە بەلای خۆیەوە گرفتە و نە کۆمەڵگاش بە گرفتی دەزانن، ئا لێرەشەوە نەوەیەکی دوور لە دینەکەیان درووست بوو، هاوکات خەڵکانێکی زۆری خاوەن بەرژەوەندی بەناو ئیسلامەوە بەناوو سیفەتی جۆراوجۆرەوە هەمیشە بەو خەڵکە دەڵێن ئێوە لەسەر حەقن و ڕێگای ڕاستتان گرتووە، بەوانەش کە دەیانەوێت لە خەوی بێ ئاگایی ڕایانچڵەکێنن پێیان دەڵێن ئێوە توندڕەون و دینێکی نامۆتان هێناوە و جۆرەها ناووناتۆرەیان لی دەنێن بۆ ئەوەی ئەو ئیسلامەی لە کیتاب و سوننەتدا هاتووە پێشکەشی خەڵکی نەکەن.

بۆیە شارەزابوون لە تەوحید و لە پرسەکانی ئیمان وسوننەت، پێویستییەکی گەورەو گرانی ژیان و دواڕۆژە بۆ هەموو موسوڵمانێك، پێویستییەکی فیترییە بۆ مرۆڤ بۆ ئەوەی ئامانجێکی هەبێت لەم دونیایە لە پێناویدا بژێت و ڕێگای دواڕۆژی بۆ ڕوناك بکاتەوە. تەوحید یەکەم واجب و کۆتا واجبە کە ئەبێت موسوڵمان بیکاتە نەخشە ڕێگای دنیای خۆی و لەسەر ئەم دنیایە بەجێ بهێڵێت: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ * لَا شَرِيكَ لَهُۥ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾الأنعام: ١٦٢-١٦٣.

یەکێك لەو کتێبانەی ئەم لایەنەی موسوڵمان تۆکمە دەکات و فێری کۆمەڵێك لە بنەماکانی دینەکەی دەکات، کتێبی (أصول السنة)ی پێشەوای ئەهلی سوننەت أحمد بن حنبل ە بەڕەحمەت بێت، لەم کتێبەدا و لە ڕوناکی قسەی زانایاندا کە ئەم مەتنەیان شەرح کردووە شەرحێکی پوخت و کورتمان بۆی ئامادە کردووە کە لە زۆربەی شەرحەکانی ئەم مەتنە و کتێبی تری عەقیدە سوودمان بینیوە، بەو هیوای

کە هەوڵێك بێـت بـۆ چەسـپاندنی سـوننەت وعەقیـدەی ڕاسـت و درووسـت کە لە ڕاستیدا ئەو دوو زاراوەیە بە یەك واتا دێن.

ئەو کتێبـانەی کە بـۆ ئەم شـەرحە لێیـان سـوودمەند بـووم، چەنـد شـەرحێکی هاوچەرخ بوون بۆ مەتنەکە، وەکو: شەرحێکی شێخ عبدالله بن جـبرین بەڕەحـمەت بێت و شـەرحێکی لەو فـراوانتری شـێخ عبـدالعزیز الراجحـي وچەنـد شـەرحێکی تریش، هەروەهـا گەڕاومەتەوە بـۆ کۆمەڵێـك کتێبـی عەقیـدە یـان بەڕاسـتەوخۆ بـۆ سەرچاوەکە یان بەناراستەوخۆ و بەوەرگرتن لەسەرچاوەی تر، لەوانە (الشریعة)ی الآجري و (الإبانة)ی ابن بطة و (شرح العقیدة الطحاویة)ی ابن أبي العز و نـاصر البراك و سفر الحوالي، هەروەها لە کتێبی (مجموع الفتاوی) وچەند کتێبێکی تـری ابن تیمیة سوودم بینیوە وجگە لەمانەش لە کۆمەڵە کتێبێکی تر کەڵکم وەرگرتـووە وەك(و مختصر الفقه الإسلامي) التویجري و(المبین في قواعد التکفیر) و هەروەهـا بۆ هەندێ باسی تایبەت بە عەقیـدە و بەفەرموودەکـان بـۆ سـایتی (الـدرر السـنیة) گەڕاومەتەوە وهەندی سەرچاوەی تریش کە لە پەراوێزەکاندا ئاماژەم بۆ کردوون.

داواکارم لە الله عزوجل ئەم کتێبە سەرەڕای بچوکی وکەمیی لاپەڕکانی بکات بە مایەی خێر و ڕۆشنبوونی ڕێگا بۆ موسوڵمان و من و ئەوانیش بکاتە شـوێنکەوتووی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر و پێشـەوامان وصـلی اللـه وسـلم وبـارك علـی محمـد ووعلی آله وصحبه وسلم تسلیما کثیرا والحمدلله أولا وآخرا.

إحسان برهان الدین

٢٥ ذوالقعدة ١٤٤٤/ ١٤ حزیران ٢٠٢٣

سلێمانی/گرین سیتی

# پێناسەیەك بۆ كتێبی (أصول السنة) ودانەرەكەی

كتێبی (أصول السنة)ی پێشەوا أحمد بن حنبـل، كتێبێكـی زۆر بـە ناوبانگـە لـە بواری بیروباوەڕدا و شارەزا بوون لێی بۆ هەموو موسوڵمانیك گرنگە ، ئەوەش لەبەر چەند هۆكارێك:

١- لەبەر ئەوەی دانەرەكە ی زانایكی گەورەیە كە ئەویش (أحمد بـن حنبـل) ە، یەكێكە لە پێشەوایانی ئەهلی سـوننەت و جەماعەتـە و لەناویانـدا تایبەتمەنـدی و پێگەی دیار و بەرزی خۆی هەیە.

٢- چونكە بنچینەو بنەما سەرەكییەكانی ئەهلی سـوننەتی تێـدا ڕوونكردووەتـەوە كە پێچەوانەی ئـەهلی بیدەعـە ولە دێـر زەمـانەوە ئەو كتێـبە بـایەخی زۆری لەلای زانایان و فێرخوازانی زانست پێ دراوە.

٣- لەبـەر ئـەوەی بیروبـاوەڕی (الفرقـة الناجیـة) ڕوون دەكاتـەوە وبەو پێـیەش هەموو موسوڵمانێكی موەحیدی ئەهلی سوننەت پێویستی پێیەتی.

# كورتەیەك دەربارەی ژیاننامەی دانەر

پێش ڕوونكردنەوەی ئەو بنەمایانە باشترە پوختەیەك دەربارەی دانەر باس بكەین ، بۆ ئەوەی پێش هەموو شتێك بزانین ئەحمەدی كوڕی حەنبەل كێیە: ناوی ( أبو عبد الله أحمد بن محمد بن حنبل بن هلال بن أسد بن إدريس بن عبد اللـه) ە ، لە ساڵی ١٦٤ی كۆچی لە بەغدا لە دایكبووە ، هەر لە مناڵییەوە باوكی وەفاتی كردووەو خۆی فەرموویەتی: (لم أر جدي ولا أبي) واتە: نەباپیرەو نەباوكم نەبینیوە، باوكی لە تەمەنی سی ساڵیدا بە گەنجی وەفاتی كردووە و ئیتر لە گەڵ هەندێ كەس و كاری لە بنەماڵەكەیاندا دایكی پەروەردەی كردووە ، باوكی خانوویەك و چەند دوكانێكی هەبوو بۆی بەجێهێشتبوون لە خانووەكە نیشتەجێ بوون وبە داهاتی دوكانەكانیش -هەرچەند كەمیش بوو- بژێوی خۆیان پێ دابین دەكرد و بەوشێوەش لە خەڵكی بێ نیاز بوون .

لە بنچینەدا بنەماڵەكەی خەڵكی بەسرە بوون، بەڵام ئەحمەد لە بەغدا پەروەردە بوو كە زانستخوازان لە هەموو لایەكەوە ڕوویان تێدەكرد لەو سەردەمە، هەر لە سەرەتای پێگەیشتنی قورئانی پیرۆزی لەبەر كرد و زانستەكانی زمانەوانی و نووسین و شەرعناسی و فەرموودەو زانستەكانی تری وەرگرت ، كاتێك كە مناڵ بوو جێگای متمانەی مامۆستایان و خوێندكاران و باوكەكانیان بوو ، بەڵكو زۆرێك لە باوكی خوێندكارەكان ئومێدەوار بوون كوڕەكانیان وەكو ئەحمەد بێت بە هۆی ئەو ئاكارە جوانانەو و زانست و زیرەكییەی كە پێی دەناسرا .

ئەحمەد لەبەر سەرقال بوونی بە زانست و کۆکردنەوەی فەرموودەوە، ژنهێنانی دواکەوت بۆ دوای تەمەنی چل ساڵی، دوای ئەوەش بەتەواوی خۆی یەکلا کردەوە بۆ فێرکردن و فەتوا و نووسین ، وەکو ابن الجوزي دەربارەی دەڵێت: (کان رضي الله عنه شديد الإقبال على العلم، سافر في طلبه السفر البعيد، ووفر على تحصيله الزمان الطويل، ولم يتشاغل بكسب ولا نكاح حتى بلغ منه ما أراد).[١] واتە: أحمد اللە لێی ڕازی بێت زۆر بایەخی بەزانست دەدا و بەرەو ڕووی دەڕۆیشت، لە پێناویدا گەشتی بۆ شوێنی دوور دەکرد وسەردەکانێکی لە تەمەنی لەڕێگەی بەدەستخستنیدا بەسەر برد، تەنانەت خۆی نە بە ژنهێنان و نە بە کاروکاسبی سەرقاڵ نەکرد تاکو گەیشتە ئەوەی کە مەبەستی بوو.

یەکەم خێزانی ناوی( العباسة بنت الفضل) بوو، ئەحمەد دەربارەی ئەو خێزانەی فەرموویەتی:( أقامت معي أم صالح ثلاثين سنة فما اختلفتُ أنا وهي في كلمة) واتە: سی ساڵ لەگەڵ دایکی صالح دا پێکەوە ژیاین، ڕۆژێك قسەیەکی ناخۆش لە نێوانماندا ڕووی نەدا .

ئەحمەد لەسەرەتای فێربوونیدا خەریکی زانستی (فقه) بوو ، بەڵام دواتر بە تەواوی خۆی بۆ زانستی فەرموودە یەکلا کردەوە ، سەرەتا فەرموودەی لە ئەبو یوسفی هاوەڵی ئەبو حەنیفە وەرگرت ، دواتر بۆ ماوەی چوار ساڵ لە لای پێشەوا

(١) كتاب مناقب الإمام أحمد: ٧٢.

(هشيم بن بشير الواسطي)[١]فەرموودەی لێ وەرگرت و ئینجا ڕووی کردە وڵاتان بۆ بینینی زانایان و فەرموودەناسان بۆ نووسینەوەی فەرموودە لێیان وموسنەدەکەی بەو شێوە کۆکردەوە کە سی هەزار فەرموودەی موسنەدی تێدایە ، لە گەڵ یەحیای کوڕی موعینی هاوڕێیدا چوونە حەج و بەنیاز بوون لەوێوە بچنە صنعاء بۆ وەرگرتنی فەرموودە لە عبدالرزاق،[٢] لە حەج عبدالرزاق یان بینی و یەحیا پێی وت ئەوە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە بە نیازە فەرموودەت لێ وەربگرێت، مەبەستی ئەوە بوو نەچن بۆ یەمەن کات و خەرجی ڕێگەیان لە کیسە بۆ بمێنێتەوە، بەڵام ئەحمەد سەرزەنشتی یەحیای کرد لەسەر ئەو داواکاریەو وفەرمووی نیەتی خۆم لەلای اللە ناگۆڕم، دەبێت لە یەمەن بچمە خزمەتی ، لە ڕێگەی صنعاء پارەی پێ نەما و ناچار بۆ ماوەیەك حەماڵی دەکرد بۆ ئەوەی بگاتە جێگای مەبەست .

ئەحمەد دوای ئەوەش گەیشتە ئاستێکی بەرز لە زانستدا و ناوبانگی پەیدا کرد و وەکو پێشەوای موسوڵمانان تەماشا دەکرا ، هەر بەردەوام بوو لە گەڕان بەدوای زانست و فەرموودەدا و دەیفەرموو: (مع المحبرة إلى المقبرة) واتە:تاکو دەمرم

---

(١) هشيم بن بشير بن القاسم بن دينار ، لە ساڵی ١٠٤ی کۆچی لە دایکبووە و لە ساڵی ١٨٣ی کۆچی وەفاتی کردووە. بۆ ژیاننامەکەی بڕوانە: سير أعلام النبلاء، الذهبي، ٢٨٧/٨.

(٢) عبد الرزاق بن همام الصنعاني ، فەرموودەناسی بەناوبانگی یەمەن، لە ١٢٦ی کۆچی لەدایك بووە و لە ٢١١ی کۆچی وەفاتی کردووە. بۆ ژیانامەکەی بڕوانە: سير أعلام النبلاء: ٥٦٤/٩.

خەریکی فێربوون و زانست دەبـم، هـەروەها دەفـەرموو: «أنـا أطلـب العلـم إلى أن أدخل القبر» واتە: تاکو دەچمە ناو گۆڕەکەمەوە هەر بەدوای زانستەوە دەبم.

ئەحمـــەد ڕۆژ لـــە دوای ڕۆژ ناوبـــانگی زیـــاتر بـــڵاو دەبوویـــەوە و ، متمانـــەو خۆشەویستی خەڵك و زانایان و فێرخوازانی زانسـتیش زیـاتر بـە دەسـت دەهێنـا، دەگێڕنـەوە پێـنج هـەزار کـەس لـە وانـەکانی دادەنیشـتن و پێـنج سـەد کەسـیان قسەکانیان دەنووسیەوە ، لەسەر ئەو حاڵەتەش بەردەوام بوو تا ئەو کاتـەی تووشـی ئەو ناڕەحەتی و مەینەتییە بوو لەسەر مەسـەلەی (خلـق القـرآن) و ئەوپـەڕی ئـارام گرتن و جێگیربوونی لەو تاقیکردنەوەدا نیشان دا ، بۆیـە ئەوەنـدەی تـر لـە چـاوی موسوڵمانان‌دا گەورە بوو.

ئەحمەد پیاویکی شکۆدار و بەهەیبەت بوو ، زۆر گرنگی بە پاك و خاوێنی و ڕێك و پێکـی جـل و بەرگـەکانی دەدا ، ڕوخسـاریکی جـوانی هـەبوو ، هـەرگیز گاڵتـەو سوعبەتی نەدەکرد و دەیوت ئەوە بۆ کەسێك فەرموودەی پێغەمبەر صـلی اللـه علیـه وسلم بگێڕێتەوە شیاو نییە ، بەڵکو جارێکیان یەزیدی کوڕی هارون[1] کـە شـەیخی ئەحمەد بوو گاڵتەی کرد و پێکەنی لە گەڵ کەسێکدا و دواتر کە زانـی ئەحمـەد لـە کۆڕەکەدا دانیشتووە وتی بۆ ئاگەدارتان نەکردمەوە ئەحمەد لێرەیە بۆ ئەوەی گاڵتـەم نەکردایە.

(١) یزید بن هارون زانایەکی گەورەی سەردەمی خۆی بووە، لە ساڵی ١١٨ ك لە دایکبووە ولە ٢٠٦ك وەفاتی کردووە، بۆ ژیاننامەکەی بڕوانە: سير أعلام النبلاء، (٣٨٥/٩).

ئەحمەد ڕەحمەتی الله ی لێ بێت لەسەردەمی المأمون و دواتر المعتصم و الواثق یشدا ئازارو ئەشکەنجەی زۆر درا بۆ ئەوەی بڵێت قورئان درووستکراوێکە وەکو درووستکراوەکانی الله و کەلامی خۆی نییە و بچیتە سەر ڕێبازی موعتەزیلەکان کە دەوری ئەو خەلیفانەیان دابوو و قایلیشیان کردبوون کە بە زۆر خەلك و زانایان ناچار بکرێن بچنە سەر ئەو بۆچوونە ، بەڵام ئەحمەد هەرگیز چۆکی دانەدا و جاری وابوو لە ژێر ئەشکەنجە دەبورایەوە، بەڵام قسەیەکی نەدەکرد ئەوان پێیان خۆش بێت ، چونکە دەیزانی هەموو موسوڵمانان تەماشای هەڵوێستی ئەو ئەکەن ، الواثق لە زیندان ئازادی کرد، بەڵام وانە وتنەوەی لێ قەدەغە کرد بۆ ماوەی پێنج ساڵ وانەی نەوتەوە تاکو مردنی الواثق و هاتنی المتوکل کە ئەو جیاواز بوو لە خەلیفەکانی پێش خۆی.

ئەحمەد بە رەحمەت بێت بە هەژاری و نەداری ژیانی بەسەر برد و هەرگیز یارمەتی لەکەس وەرنەدەگرت، تەنانەت کاتێك المتوکل بە دیاری بڕیکی زۆر پارەی پێدا و ناچار بوو وەریگرێت نەوەك لێکدانەوەی خراپی بۆ بکرێت ، هەر لەو ڕۆژەدا هەرهەموو پارەکەی بەو کیسەشەوە کە پارەکەی تێدا بوو بە خشی و هیچی لەلای خۆی نەهێشتەوە.

ئەحمەد پیاوێکی زانا و خاوەن تەقوا و شکۆدار بوو ، بەردەوام خەریکی عیبادەت بوو ، دەگێڕنەوە ڕۆژانە سێ سەد ڕکات نوێژی دەکرد ، بەڵام لە کاتی زیندانییەکەیدا کە لاواز بوو کەمی کردەوە بۆ سەدو پەنجا ڕکات، حەوت ڕۆژ جارێکیش قورئانی خەتم دەکرد.

ئەم زانا پایەبەرزە کە پێشەوای یەکێکە لە چوار ڕێڕەوە بە ناو بانگەکانی ئیسلام لە فیقهدا ، خاوەنی چەندین کتێبە کە موسوڵمان وەکو بنچینەیەکی گرنگ تەماشایان کردووە لە درێژایی مێژوودا بۆ فێربوونی زانست، لەوانە کتێبی (المسند) کە سی هەزار فەرموودەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ی تێدا کۆکردووەتەوە و بەگەورەترین کتێبی فەرموودە دەژمێردرێت ، هەروەها:( العلل ومعرفة الرجال ، الأسامي والكنى. سؤالات أبي داوود.العلل ومعرفة الرجال،.مسائل الإمام أحمد، أصول السنة. العقيدة برواية أبي بكر الخلال.الورع، الرد على الجهمية والزنادقة. الزهد.العلل ومعرفة الرجال، الأشربة.فضائل الصحابة.سؤالات الأثرم لأحمد بن حنبل.أحكام النساء).

شایانی باسە ئەحمەد چاوی بە پێشەوا شافیعی کەوتبوو لە کاتی سەردانی ئەو پێشەوایە بۆ بەغدا ، دەربارەشی فەرموویەتی: «خرجتُ من بغداد وما خلَّفتُ بها أحداً أورع ولا أتقى ولا أفقه من أحمد بن حنبل» واتە: بەغدام بە جێهێشت و لە ئەحمەد بە وەرەع و تەقواتر و زاناترم تێیدا بە جێنەهێشت.

لەساڵی ٢٤١ ی کۆچی لە مانگی ربيع الأول لە بەرەبەیانی هەینیدا وەفاتی کرد و لە پاش نوێژی عصر لە بەغدا لە گەڕەکی حەیدەرخانەی ئێستا بە خاك سپێردرا. (١)

(١) کتێب زۆر هەیە دەربارەی ژیاننامەی أحمد بن حنبل ، دەکرێت بۆ نموونە خوینەر بۆ ئەم کتێبانە بگەڕێتەوە:

- مناقب الإمام أحمد بن حنبل، عبدالرحمن بن الجوزي.
- أحمد بن حنبل بين محنة الدين ومحنة الدنيا. أحمد بن عبدالجواد الدومي.

# دەشتگرتن بە سوننەتی پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم

پێشەوا أحمد بن حنبل لە سـەرەتای کتێبەکەیـەوە فەرموویـەتی: (أُصُـولُ اَلسُّـنَّةِ عِنْدَنَا:

**اَلتَّمَسُّكُ بِمَا كَانَ عَلَيْهِ أَصْحَابُ رَسُولِ اَللَّهِ ﷺ وَاَلْاقْتِدَاءُ بِهِمْ، وَتَرْكُ اَلْبِدَعِ، وَكُلُّ بِدْعَةٍ فَهِيَ ضَلَالَةٌ، وَتَرْكُ اَلْخُصُومَاتِ، وَالْجُلُوسِ مَعَ أَصْحَابِ اَلْأَهْوَاءِ، وَتَرْكُ اَلْمِـرَاءِ وَالْجِدَالِ وَالْخُصُومَاتِ فِي اَلدِّينِ)** واتە: بنچینەو بنەماکانی سوننەت لە لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت بـریتین لـە دەسـتگرتن و جەختکردنـەوە لەسـەر کـار کـردن بەوەی کە هاوەڵانی پێغەمبەر صـلی اللـە علیـە وسـلم لەسـەری بوونـە لـە هـەموو بوارەکانی عیبادەت و دینداریدا ، بە تایبەتی لە پرس و باسەکانی عەقیدهدا ، ئەوان پێشەنگ و پێشەوای ئێمەن و بە گشتیی ئیسلام و ئیسلامەتی لەوانەوە پێویسـتە فێـر ببین ، بەمەش ئەهلی سوننەت لە ئەهلی بیدەع جیا ئەبنـەوە کـە ئـەوان ئـەم پێـوەرە زۆر گرنگ نییە بە لایانەوە ، زۆر بە ئاسانی بە عەقڵ و بیرکردنەوەی خۆیـان قسـەو تێگەیشـتنی هـاوەڵان ڕەتدەکەنـەوە و قسـەو بۆچـوونی خۆیـان پـێش دەخـەن و دەقەکانی پێ شەرح دەکەن ، ئەمەش دەرگایەکی زۆر پڕ لە مەترسی و زیانە کە دین لە هاوەڵان وەرنەگریت کە ئەوان وابەستەی رسول الله بوون صلی الله علیـە وسـلم و ئامادەی دابەزینی وەحی بوون و لە پێناو دینی الله ماڵیان کرد بە قوربانی و اللـە عزوجل عزوجل لێیان ڕازی بووەو ستایشی کردووە ن.

---

- أحمد بن حنبل : حياته وعصره، آراؤه وفقهه ، محمد أبو زهرة.

(أصول) کۆیه و تاکەکەی أصل ه، واته ئەو بنچینەی که جگه له خۆی لەسەر بونیات دەنرێت، ئەو بنچینەش که سوننەتەکانی لەسەر بونیات دەنرێت، بریتییه له دەستگرتن بەوەی که هاوەڵانی لەسەر بوون و شوێنکەوتنیان ودوورکەوتنەوە له هەموو جۆره بیدعەیەك له دیندا، واته ئیمام ئەحمەد بەڕەحمەت بێت دەیەویت بڵێت: ئێمەی ئەهلی سوننەت، بنچینەو بنەماکانی سوننەت لەلامان ئەوەیه دەست بەوه بگرین که هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم ی لەسەر بوون وشوێنکەوتووی ئەوان بین و له بیدعەکردن له دیندا بەدوور بین.

هاوەڵانیش الله له هەموویان ڕازی بێت چاکترین کەسانێکن، هەرگیز کەسانی وەکو ئەوان دووبارە نابێتەوە، پێناسەی هاوەڵیش ئەوەیه ئەو کەسه چاوی به پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم کەوتبێت و به ئیمانداری بەدیداری گەیشتبێت و لەسەر ئیسلام و موسوڵمانێتیش وەفاتی کردبێت. ئەو تایبەتمەندی و پلەو پایەش که هاوەڵان هەیانه هیچ کەسێکی تر نه له تابیعین نه کەسی تر نییەتی، هاوەڵانیش هەموویان سەرڕاست و دادگەرن، کاتێکیش که هەندێ ویستیان بەراوردێك له نێوان معاوية الله لێی ڕازی بێت و عمر بن عبدالعزیز بەڕەحمەت بێت ئەنجام بدەن، هەندێ له ئەهلی عیلم وتیان: ئەو تۆزەی چووەته لووتی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان له کاتی جیهاد کردنیدا له گەڵ پێغەمبەرصلی الله علیه و سلم له عومەری کوڕی عبدالعزیز باشتره، سەرەڕای دادگەری وعیبادەت و زوهدی و ئەو کەڵه پیاوەی ئیسلام.

سوننەت دژو پێچەوانەی بیدعەیە، بیدعەش داهێنانە لە دیندا، وەکو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه، فهو ردٌّ)[١] لە ڕیوایەتێکەی پێشەوا مسلم دا هاتووە کە فەرموویەتی: (من عمل عملاً ليس عليه أمرنا، فهو ردٌّ)[٢].

هەروەها سوننەت بریتییە لەوەی جێگیر بووە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه و سلم، چی (قول) بێت واتە گوفتار یان (عمل) بێت واتە کردار، یان (تقریر) بێت واتە کارێك لەبەردەمیدا ئەنجام درابێت و ئەویش لێی بێ دەنگ بووبێت.

**(والإقتداء بهم)** واتە: واتە پێویستیی شوێنکەوتن و شوینپێ هەڵگرتنیان ، وەکو پیغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (فإنه من يعش منكم فسيرى اختلافا كثيرا ً فعليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين) [٣].هەروەها فەرموودەی الفرقة الناجية کە تێیدا حەق و ڕاستی لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و هاوەڵاندا دیاری کراوە.

ابن مسعود اللە لێی ڕازی بێت فەرموویەتی: (من كان منكم متأسياً فليتأس بأصحاب محمد صلى الله عليه وسلم، فإنهم كانوا أبر هذه الأمة قلوباً، وأعمقها علماً، وأقلها تكلفاً، وأقومها هدياً، وأحسنها حالاً، قوماً اختارهم الله لصحبة نبيه صلى الله عليه وسلمن وإقامة دينه، فاعرفوا لهم فضلهم، واتبعوهم في آثارهم،

(١) صحيح البخاري: (٢٦٩٧ )، صحيح مسلم: (١٧١٨ ).

(٢) صحيح مسلم: (١٧١٨ ).

(٣) رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح.

فإنهم كانوا على الهدى المستقيم) [١].واتـە: هەركەسێك ئەیـەویت كەسێك بكاتـە پێشەنگی خۆی با هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بكاتە پێشەنگی خـۆی ، چونكە ئەوان لە هەموو ئوممەت دڵیان پاكتر بـوو ، زانسـتیان زۆرتـر بـوو ، بـە بـێ خۆتێكدان و زۆر لە خۆ كـردن، بـە چـاكترین شـێوە لەسـەر ڕێگـای ڕاسـت بـوون ،ئەوانـە كەسـانێك بـوون اللـە تعـالی بـۆ هـاوەڵێتی پێغەمبەرەكـەی و بـەرپاكردنی دینەكەی هەڵیبژاردن ، بۆیە بە فەزل و چاكەیان بزانن و لە قسـەو فەرمایشـتەكانیان شوێنكەوتوویان بن، چونكە بە ڕاستی ئەوانە لە سەر ڕێگای ڕاست بوون.

**(والإقتداء بهم)** واتە: شوێنكەوتنی هـاوەڵان یەكێكـە لـە گـرنگترین بنـەماكانی سوننەت ، وەكو الله تعالی فەرموویەتی: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا﴾انساء/١١٥. ئەمەش وەكو ئاماژەمان پێكرد سنوورێكی جیاكەرەوەیە لە نێوان شوێنكەوتوانی سوننەت و ئەوانەی كە لە واقیعدا بە سوننەت ڕازی نابن ئەگـەرچی بە قسەو بانگەشە كردن وا ئەڵێن.

**(وترك البدع وكل بدعة ضلالة)** واتە: یەكێك لە بنـەماكانی سـوننەت ئەوەیـە لـە عیبادەت و دینداریدا بە گشتی بیدعە نەكەیت، چونكە هەموو بیدعـەو داهێنراوێـك لەو بوارەدا گومڕاییە.

(١) أخرجه ابن عبد البر في "جامع بيان العلم وفضله" (١٨١٠) ،والهروي في "ذم الكلام" (ص١٨٨) من طريق سلام بن مسكين ،عن قتادة قال :قال ابن مسعود ـ رضي الله عنه

زانایان دەڵێن: بیدعه هەموو داهێنراوێکه له دیندا، واته ئەوەی که دەدرێتە پاڵ شەریعەت و پێوەی دەلکێنرێت و شەریعەتیش لێی بەرییه. ئیتر ئەو بیدعه ئەگەر له بواری بیروباوەر بێت یان له کردەوه جەستەییەکان بێت یان له گوفتارەکاندا بێت ، چونکه الله عزوجل دینی تەواو کردووەو له کۆتایی ژیانی پێغەمبەرەکەیدا صلی الله علیه وسلم ئەم ئایەتەی دابەزاندووە: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ﴾ المائدة/٣. ئینجا پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم هیچی نەهێشتووەتەوە لەو بوارانەدا ڕوونی نەکردبێتەوە ، تەنانەت شێوازی چوونە سەر ئاویش، ئەوەشی ڕاگەیاندووە ئوممەتەکەی دەبنە حەفتاو سێ بەشەوە ، هەموویان دەچنە دۆزەخەوە یەك بەشیان نەبێت، ئەوانەش بریتین له (ما أنا علیه وأصحابی) واته: ئەوەی پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم و هاوەڵەکانی لەسەرە الله لیان ڕازی بێت.

ئینجا رسول الله علیه الصلاة والسلام له چەندین فەرموودەی صحیح دا ئوممەتەکەی له بیدعه وریاکردووەتەوە وفەرموویەتی وەکو ئەو فەرموودەی که له سەحیحی بوخاریدا هاتووه :(من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد ) ئەو فەرموودەش که له سەحیحی موسلیمدا هاتووه: ( من عمل عملا ليس عليه أمرنا فهو رد)

بۆیه ئەگەرچی هەموو بیدعەکان وەکو یەك نین وجیاوازی له نێوانیاندا هەیه له حوکمیاندا ، بۆ نموونه بیدعه هەیه له عەقیدەدایه و کاریگەری زۆر خراپی هەیه بۆ له خشتەبردنی خەڵك و دوور خستنەوەیان له بیروباوەڕی ڕاست ، بیدعەش هەیه

زانایان ناویان ناوە (البدع الحقيقية) کە بە هیچ شێوەیەك بنەماو بەڵگەی لەسەر نییە لەدینی ئیسلامدا ،وەکو بیدعەی جەهمییەکان و موعتەزیلەکان لە باسەکانی ئیمان و قەدەر و بینینی الله و خەلقی قورئاندا .

بیدعەش هەیە ناویان ناوە (البدع الإضافية) ئەمەیان ئەسڵی هەیە بەڵام لە شێوازو کات و بڕ وجۆر و هۆکار و هەندێ ڕواڵەتی تر سەرپێچی تێدایە، بۆ نموونە ئەگەر کەسانێك شەوێك لە هەموو هەفتەیەك تەرخان بکەن بۆ شەونوێژ وەکو شەوی هەینی، ئەم کارە بیدعەیەوە جائیز نییە ئەگەر چی شەو نوێژ ئەسڵی هەیە بەڵام بەو شێوە بیدعەیە!

یان دەنگ بەرزکردنەوە بە نیەت لە کاتی دەست پێکردنی نوێژدا ، بەڵام ئەم دوو جۆرە حوکمەکانیان جیاوازە ، ئەگەر چی لە کۆتاییدا هیچ بیدعەیەك نییە لە شەریعەتدا شتێکی باش بێت و پێی بوترێت (بدعة حسنة) یان (بدعة مباحة أو بدعة مندوبة) هیچ بیدعەیەك لە دیندا جائیز نییە، بیدعە نییە باش بێت، بەڵام بیدعە هەیە خراپە و هەیە خراپترە، چونکە هەبوونی بیدعەی چاك لە دیدا ئەوە تۆمەتبارکردنی ئیسلامە بەوەی کە کەم و کورتی تێدایە و ئەم بیدعەکارە قەرەبووی ئەو کەم و کورتییە دەکاتەوە بە بیدعەکەی.

یەکێکی تر لە بنەماکانی سوننەت کە پێشەوا ئەحمەد لە (أصول السنة)دا باسی دەکات ئەوەیە کە فەرموویەتی:

**(وترك الخصومات وترك الجلوس مع أصحاب البدع)** واتە: شوێنکەوتووی سوننەت زۆر خۆی بە مشت و مڕ و شەڕە قسەی بێ سوودەوە خەریك ناکات ، لەو

کەسانەش نزیك نابێتەوە کە ئەو ئاکارەیان هەیە و بەردەوام سەرقاڵی قسەو دەمە دەمەو کات کوشتنن بەوەی کە پشت بە قورئان و فەرموودەو قسەی سەلەف نابەستن و زیاتر پشت بە قسەو بەڵگەکانی ئەهلی بیدەع دەبەستن.

بەڵکو ئەوانەی کە ڕێز لە سەلەف ناگرن و متمانەیان پێیان نییە بە زمانی حاڵ و بۆچوونەکانیان ڕەتدەکەنەوە، پێویستە لێیان دوور بکەویتەوە بۆ ئەوەی کاتت بە زایە نەچێت لە گەڵیان و هەروەها بۆ ئەوەش بە دوور بیت لەو بیدعەو گومانانەی لە دیندا دەیوروژێنن ، هەم بۆ ئەوەش نەبێتە هۆکارێك بۆ بڵاو بوونەوەی بیدعەکەیان بۆ ئەوەش هەست بە نامۆیی و کەمی خۆیان بکەن.

بەڵام لەم حاڵەتەی کوردستاندا کە ئەوانەی بیدعەی موعتەزیلە و خەواریج و قورئانییەکان وبیدعەی تری تێدا بڵاودەکەنەوە، خەلکیش زانستیان لە شەریعەت و لە زانستە ئیسلامییەکان و لە مەنهەجی سوننەت و بنەماکاندا لاوازە، باشترەو بەڵکو لەوانەیە واجب یش بێت زانایان و فێرخوازانی زانست بەرپەرچی ئەو کەسانە بدەنەوە کە بە نووسین و بە قسە کردن لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن ولە ڕێگەی ترەوە گومان دەربارەی بیرباوەڕو شەرعی ئیسلام بە گشتی بڵاو دەکەنەوە ، ئیتر ئەو کەسانە چی ئاڵای دژایەتی دین وشەریعەتیان بەرز کردبێتەوە و بەڕاستەوخۆ ئەو کارە بکەن، یان بە ناوی بانگەوازو بەرچاو ڕوونکردنەوەی موسوڵمانان و ڕاستکردنەوەی چەمك و بەبەهانەی خوێندنەوەی نوێ وبەخۆداچوونەوەو و تەفسیرکردنی هاوچەرخ بۆ دەقە شەرعییەکان کار وچالاکی بکەن.

لە ڕاستیشدا جۆری دووەم لە جۆری یەکەم کاریگەری خراپترە، لەبەر ئەوەی تێیدا پشت بە وروژاندنی گومان دەبەسترێت و بەناو ئیسلامیشەوە کارەکە دەکرێت، بۆیە مەترسی لەسەر خەڵکی بێ زانست و عەوام ولە خشتە بردنیان زۆرە.

جا بە پێی ئەم بنەمایەی پێشەوا ئەحمەد، دانیشتن و ڕووبەڕوونەوە لە گەڵ ئەو موبتەدیع و مونحەریفانەدا کارێکی باش نییە وەکو ئەوەی لە ڕاگەیاندنەکان و لە سۆشیال میدیا مونازەرەیان لەگەڵدا بکرێت، وچەندە سوودی هەبێت بۆی دوو هێندە زیانی هەبێت، ئەوە کارێکی باش نییە و دەرەنجامە خراپەکانی لە دەرەنجامە چاکەکانی زۆرترە، چونکە ئەهلی بیدەع هەموو گومانێك لە زاری بێ باوەڕ و بیدعەکارێك هاتبێتەدەر ، یان لە کتێبێکدا نووسرابێت ئەوان کۆیان کردووەتەوە و لەبەریان کردووە و ڕووبەڕووتی دەکەنەوە، لەوانەیە تۆ لە هەندێك لەو گومانانەدا شارەزاییت نەبێت و رابوەستیت ونەتوانیت وەڵامی بدەیتەوە، ئەو کاتە بەسەر مەنهەجی ئەهلی سوننەتدا بشکێتەوەو بینەران و بیسەرانی ئەو مونازەرەیە لەوە تێنەگەن ئەوە لاوازی ونەشارەزایی تۆیە نەك لاوازی مەنهەجەکە.

هەروەها خەڵکی جاری وا هەیە دەچنە ژێر کاریگەری گومانێکەوەو بە ڕوونکردن و بەرگریکردنەکەی تۆ لە حەق تێناگەن و قایل نابن، بەڵکو گومانەکە کاریان لێ دەکات وبەوە قایل دەبن، جگە لەوەی کە وروژاندن و گەورە کردنەوەی ئەو جۆرە مەسەلانە وەکو بێدارکردنەوەیە بۆ فیتنەو ئاژاوە لە ناو ئوممەتدا و خۆی کەسانێکی دیاریکراو لەو مەسەلەو گومانانە ئاگادارن بەڵام لەڕێگەی ئەو مونازەرەوە خەڵکانێکی زۆر لێی ئاگادار دەبن و هەر یەکەو بە شێوازو جۆرێك لە

مەسەلەکە تێدەگەن، ڕێگەی چارەی باش و گونجاویش بۆ ئەو گرفتە ئەوەیە بەرپەرچی بیرۆکە و گومانەکان بدەیتەوە بەبێ ئەوەی ناوی خاوەن بیرۆکەکان و موبتەدیع و ئەو کەس و کەسایەتییانە بهێنێت و ئامانجەکەش بەم شێوە لەوانەیە باشتر بگات.

بێگومان ئەمەی لەسەرەوە ئاماژەم پێدا مەرج نییە لە هەموو کات وحاڵەتێکدا هەر وابێت و هەموو جارێك هەر ناونەبردنی کەسی موبتەدیع و مونحەریف باشتر بیت، هەندێ جار هەیە کاتێك لادەرەکە کاریگەری لەسەر حەق و شوێنکەوتووانی حەق درووست دەکات، یان توانای گومراکردن و بەلاڕێبردنی خەڵکی هەیە، لەو حاڵەتەدا باشترە بەناو بەرپەرچی لادان و چەواشەکارییەکانی بدرێتەوە وڕای گشتی موسوڵمانانی لی ئاگادار بکرێتەوە و ڕێگەی لە گومڕاکردنی بۆ خەڵکی بگیردرێت و وا نەزانرێت بێ دەنگی لەو کەسە بەواتای بەهێزی بەڵگەکانی دێت، ، بەڵام گرنگە لەو کاتەدا بەرپەرچدانەوەکە لەلایەن کەسێکەوە بێت توانای زانستی و کەسایەتی لەناو موسوڵماناندا بەهێز بێت. بۆیە بە گشتی ڕەددانەوەی نەیارانی ئەهلی سوننەت لە شوێنکەوتووی تاقمە گومراکان و لە عەلمانییەت و دژە سوننەتەکان واجبێکی شەرعی پیرۆزە وخێرێکی گەورەیە وبەشێکە لە بانگەوازکردن بۆ ئیسلام ، بەڵام وەکو وتم مەرج نییە بەناو هێنان و بەمونازەرە کرد ڕووبەڕوویان ببیتەوە.

لەم بارەشەوە ئەوانەی شەرحی ئەم کتێبەی پێشەوا ئەحمەدیان کردووە ئاماژەیان بۆ هەندێ فەرموودەی صحیح کردووە وەکو ئەو فەرموودەی لە موسنەدی ئەحمەددا

هاتووه بـه ژمـارەی (٦٧٠٢) لـه عـەمری کـوڕی عـاص اللـه لێـی ڕازی بێـت کـه فەرموویەتی: (لقد جلست أنا وأخي مجلسا ما أحب أن لي به حمـر الـنعم ، أقبلـت أنا وأخي وإذا مشيخة من صحابة رسول الله صلى الله عليه وسـلم عـلى بـاب مـن أبوابه ، فكرهنا أن نفرق بينهم ، فجلسنا حجرة ، إذ ذكروا آيـة مـن القـرآن ، فـتماروا فيها حتى ارتفعت أصواتهم ، فخرج رسول الله صلى الله عليه وسـلم مغضـبا حتـى احمر وجهه ، يرميهم بالتراب ، ويقول : " مهلا يـا قـوم ، بهـذا أهلكـت الأمـم مـن قبلكم باختلافهم على أنبيائهم ، وضربهم الكتب بعضها بـبعض ، إن القـرآن لم ينـزل بعضه بعضا ، بل يصدق بعضه بعضا ، فما عرفتم منه فاعملوا به ، وما جهلتم منـه إلى عالمه).[1]. له فەرمـوودەکە ئەوە وەردەگیرێـت کە مشـتومڕو موجـادەلەی نازانسـتی کــارێکی نەك هەر بــێ ســوودە، بەڵکــو دەبێــتە مــایەی دووبەرەکــی وگومــان و پەرتەوازەبـوونی موسـوڵمانان، بـۆیە پێغەمـبەر صـلی اللـه علیـه وسـلم بە تونـدی ڕەتیکردووەتەوەو هاوەڵانی لێ وریاکردوەتەوە.

**(وترك المراء والجدال والخصومات في الدين).** واتـە: یـەکێکی تـر لـه بنـەماکانی سوننەت ئەوەیە کەسی شوێنکەوتووی سوننەت وازبهێنێت له گومان دroوستکردن و له مشت و مڕ و ناکۆکی کردن .

(١) ابن ماجه (٨٥) و أحمد (٦٧٠٢) ، ئەم فەرموودەیەش أحمد شاكر به صحيح ی زانیوه و الله أعلم.

وشەی (المراء) بە واتای گومان دێت کە لێرەدا هەموو جۆرە گومان وروژانـدنێك دەگرێتەوە دەربارەی دین ، وەکو باسەکانی قەدەر و ڕۆچوون لە باسەکانی (الأسماء والصفات) و هەندێ مەسەلەی تر کە حەقیقەت و شێوازەکەی نادیـارە تـر وەکـو سزای ناو گۆڕ وشێوازەکەی ، چونکـە - وەکـو شـێخ ابـن جـبرین دەڵێـت- ئـەهلی سوننەت لەوەی کە بۆیان دەردەکەوێت ڕادەوەستن و مشـت و مـڕ لـە گـەڵ ئـەهلی بیدەع ناکەن ، هەروەها لە پرسەکانی غەیبدا کە الله تعالی شێوازەکانی لە قورئانـدا ڕوون نەکردووەتەوە ڕۆناچن و لەسەر ڕوالەتەکەی ڕادەوەستن و بەو شـێوە بـاوەڕی پێ دەهێنن ، تاکو بەڵگەی شەرعی لە قورئان و سوننەت پرسەکان یەکلا دەکاتـەوە ، ئەگینا لەو جۆرە پرسانە بە بێ بەڵگە و لە خۆیانەوە قسە ناکەن.

بەڵام شایانی باسە مشت و مڕ کردن ئاکارێکە لە بنچینەدا لە مرۆڤەکاندا هەیـە ، وەکو پەروەردگار فەرموویەتی : (وَكَانَ الْإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا) الكهف/٥٤.

هەرچی خیلاف وناکۆکییەك هەیە دەبێت بگەڕێنرێتەوە بـۆ اللـە تعـالی بەوەی لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، هەروەها بۆ پێغەمـبەر صـلی اللـە علیـە بـۆ خـۆی تـاکو لە ژیاندا بووەو بـۆ سـوننەتەکەی لە پـاش وەفـاتی، اللـە تعـالی فەرمـوویەتی: (فَـإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَـوْمِ الْآخِـرِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا) النساء:٥٩. هەروەها الله عزوجل فەرموویەتی هەرچی ناکۆکییەکتـان لە نێوانـدا درووسـت بـووە یەکلاکـردنەوەکەی بگەڕێـنەوە بـۆ لای پەروەردگارتان: (وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ ) الشورى:١٠.

بەڵام پێویستە بزانین مشت و مڕ دەبێتە دوو جۆرەوە : جۆرێکیان باشە وەکو اللـه عزوجل فەرموویەتی: (ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ) [النحل:١٢٥]. بانگەواز کردن بۆ دینی الله و مشت مڕ کردن بۆ دەرخستنی ڕاستیەکان و قایلکردنی بێباوەڕان و ئەوانـەی کـە دوور لـە سـوننەتن و گێڕانەوەیان بۆ ئـیمان و بـۆ سـەر جـادەی حـەق و ڕاسـتی، ئـەوە کـارێکی باشـە و کەسانێك دەیکەن کە الله هیدایەتی داون و یارمەتیداون بۆ بـەرگری کـردن لەسـەر دینەکەی و لەسەر سوننەت بە بەڵگەی شەرعی و ملکەچ کردنی عەقڵ بـۆ شـەرعی ئیسـلام نـەك بـە پێچەوانـەوە ، وەکـو ئـەوەی (ابـن عبـاس) اللـه لێـی ڕازی بێـت ئەنجامیدا لە گەڵ (خەواریجەکان) و زۆر نموونەی تر.

لێرەشەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەمەی لەم ڕۆژگارەدا لە لایەن هەنـدێك لەوانـەی دوور لە ڕێنموونی و قورئان و سوننەت لـە کوردسـتان بیـر دەکەنـەوە لـەو خانـەدا پۆلێن دەکرێت کە پێشەوا ئەحمەد باسی کردووە ، هـەرگیز ئـەو شـێوازە لـە گومـان درووسـتکردن لـە دەوری دەقـەکان و بڵاوکردنـەوەی بۆچـوونی ئـەهلی بیـدەع لـە موعتەزیلەو خەواریجەکان و گاور و قورئانییەکان و خەڵکی لارێی تر هەرگیز ئەوە ڕێبازی ئەهلی سوننەت نییە ، بەڵکو جۆرێکە لە بەرهەڵستکاری سوننەت و ناشیرین کردنی ئیسلام و لە ڕیزی ئەو هەوڵانە پۆلێن دەکرێت کە نەیارانی ئیسـلام ئـەنجامی دەدەن.

# سوننەت تەفسیری قورئانە

**(والسنة عندنا آثار رسول الله صلى الله عليه وسلم ، والسنة تفسير القرآن وهي دلائل القرآن وليس في السنه قياس):** واتە سوننەت بە لای ئێمەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتەوە بریتییە لەو شوێنەوارانەی لە پێغەمبەرمان صلى الله عليه وسلم بۆمان ماوەتەوە ،كە بریتین لە گوفتار وكردارو پەسەندكردنەكانی سەروەرمان ، هاوكات ئەوانە ڕوونكردنەوەشن بۆ قورئانی پیرۆز ، وەكو پەروەردگار فەرموویەتی: (وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ )النحل/ ٤٤. وشەی (آثار) كۆی (أثر)ە، گوفتار و كردار و پەسەند كراوەكانی خۆشەویستمان دەگرێتەوە، خودی سوننەتیش ئەو (آثار) انەی وەكو لە وتەكەی ئیمام ئەحمەد دەردەكەوێت، ئینجا ئەو سوننەتەش قورئان ڕوون دەكاتەوەو ڕاڤەی دەكات، الله تعالى فەرموویەتی: (فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُم تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا) النساء:٥٩. گێڕانەوەی هەموو ناكۆكی و مەسەلەیەك بۆ لای الله واتە بۆ قورئانەكەی، گێڕانەوەشی بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم گێڕانەوەیەتی بۆ سوننەتەكەی.(١)

---

(١) مامۆستا هیچ حوكمێک هەیە بڵێت سڵاو لەكافر مەكەن .

یان حوكمێک بڵێت سڵاوی لێی بكەن.

وەڵام/ لە بنچینەدا درووست نییە موسوڵمان لەسەرەتاوە سەلام یان بەهەر شێوازێكی تر مەرحەباییان بكات مەگەر ئەوان سەرەتا سڵاوو مەرحەبا بكەن و موسوڵمانیش وەڵامیان

سەبارەت بەوەش کە فەرمووپەتی ( وهي دلائل القرآن) مەبەست لەوەیە کە قورئان بە شێوەیەکی کردەیی لە سوننەتدا شیکراوەتەوەو ڕوون کراوەتەوە و وردەکارییەکانی بیروباوەڕو شەریعەت بە تەواوی تێیدا باس کراوە.

پێویستە موسوڵمان بە سوننەت ڕازی بێت و شتی تر نەکاتە هاوتای سوننەت ، هەر کاتێك حوکمی مەسەلەیەك بە ڕوونی لە فەرموودەیەکی صحیح دا جێگیر بوو، ئیتر موسوڵمان ناچار دەبێت کاری پێ بکات لەو مەسەلەو لە هاوشێوەکانیشیدا ملکەچی بێت.

ئینجا پێویستە ئەوە بزانرێت سوننەتی صحیح هەروەکو قورئان بێ جیاوازی سەرچاوەیەکە بۆ وەرگرتنی دین بەگشتی ، باسەکانی بیروباوەڕ و حەڵاڵ و حەرام و هەر حوکمێکی تر .

هەروەها سوننەت نەك هەر ڕوونکردنەوەیە بۆ قورئانی پیرۆز، بەڵکو وەکو زانایان فەرموویانە (تقييد) ە بۆ (مطلق)ی (تفصيل)ە بۆ (مجمل) ی( إيضاح) ە بۆ (مبهم )ی قورئان ، بۆ نموونە: لە قورئاندا الله تعالى فەرموویەتی: (وأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ )البقرة: ١١٠. ، بەڵام هەموو وردەکارییەکانی ناو نوێژ ومەسەلەی زەکات لە سوننەتدا هاتووە، بە هەمان شێوە عیبادەتەکانی تریش .

---

بداتەوە، بەڵگەش لەوبارەوە هەیە بۆ نموونە: ( لا تبدؤوا اليهود والنصارى بالسلام ، وإذا لقيتموهم في طريق فاضطروهم إلى أضيقه ) هەروەها فەرموویەتی: (إذا سلم عليكم أهل الكتاب فقولوا وعليكم) متفق عليه. ئەگەر ئەوان سەلام بکەن زانایان دەڵێن وەلام دەدرێنەوەو دەتوانیت پرسیاری خۆی و ماڵ و منداڵیشی لێ بکەیت.

لە کاتی هەبوونی دەقێکی ڕوون و ئاشکرایش لـە حـوکمی مەسـەلەیەکدا، ئیـتر نابێت ئاوڕ لە هـیچ بۆچـوون و قیـاس و لێکدانەوەیـەکی عـەقڵی تـر بدرێتـەوە بـە پیچەوانەی دەقەکە یان جیـاواز لـە دەقەکـە، بـەڵکو پێویسـتە موسـوڵمان ملکـەچی حـوکمی سـوننەت بێـت و پێیشـی ڕازی بێـت و هەسـت بـە هـیچ قورسـی و ناڕەحەتییـەکیش نـەکات لـە بەرانبـەری ئـەوە تەنـانەت لەنـاو دڵ و دەروونـی خۆیشییەوە هەر دەبێت پێی ڕازی بێت و بەهیچ شێوەیە پێی ناڕازی و قەڵس نەبێـت ، وەکو الله تعالی فەرموویەتی: : (فَلَا وَرَبِّـكَ لَا يُؤْمِنُـونَ حَـتَّىٰ يُحَكِّمُـوكَ فِيمَـا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا)النسـاء ‎/٦٥.

موسوڵمان ئەگەر لە ینداریدا پابەند بێت بە سـوننەتەوە ، ئیـتر ئـەوە بەسـیەتی و پێویستی نە بە قیاس و نە بە بۆچوونی کەس نییە لەسەر دەقـەکانی سـوننەت، نە بە زیادکردن و نە بە لێ کەم کردنەوە، مەگەر شەرح و ڕوونکردنەوەی دەقەکان بێت بە پێی ڕێزمـان وبنچیـنەو بنەماکـانی زمـانی عـەرەبی و قسـە وتێگەیشـتنی زانایـانی سەلەف ، بە بێ گۆڕینی جەوهەری واتای فەرموودەکە.

بەڵام هەرکەسێك لەسەر سوننەت بێت و بە بێ بیـانوو و فەلسـەفە کـردن و خـۆ دزینەوەی ناڕاستەوخۆ لە دەقەکان و بە ڕاستەوە بە پێی توانـای خـۆی جێبـەجێیان بکات و لە دڵیشەوە بەوە ڕازی بێت، ئەوەیە کەسی وابەسـتە بـە سـوننەت، ئیـتر بـا ئەهلی بیدەعیش توانجی لێ بدەن و سووکایەتی بە دەستگرتنە سوننەتی ئەو بکەن .

ئەهلی بیدەع و ئەوانەی عەقڵە بچووکەکانی خۆیان بە پەسەندتر دەزانن لە دەقەکان و لە قسەی هاوەڵان و زانایانی پێشینی ئەم ئوممەتە، لە درێژایی مێژوودا ئەوە پیشەیان بووەو ، موعتەزیلەکانی دوێنێ هێشتا شوێنکەوتووانیان هەر ماون لەم ڕۆژگارەدا، ، لە کارەکانیشیاندا لە گەڵ نەیارانی ئیسلامدا یەك دەگرنەوەو خاڵی هاوبەشیان زۆرە، بۆیە کۆششیان لە ساردکردنەوەی خەڵکی لە سوننەت و گومان درووستکردن لە دەوری فەرموودە، تەنها کاریگەری لەسەر ئەوانەیە کە لە بنچینەوە لە ئیسلام بە گومانن و کەوتوونەتە ژێر کاریگەری موعتەزیلەکانی دوێنێ و بە ناو قورئانیەکانی ئەمڕۆ .

پێشەوا ئەحمەد فەرموویەتی: **(والسنة تفسر القرآن وهي دلائل القرآن):** واتە سوننەت کە بریتییە لە گوفتار وکردارەکانی پێغەمبەر صلی اللە علیە و سلم وهەروەها ئەو کارانەی لەبەردەمیدا ئەنجام دراون و لەسەر کردنیان ڕازی بووە، هەموو ئەوانە لێکدانەوەو شەرح کردنە بۆ واتاکانی قورئانی پیرۆز وڕوونکردنەوەن بۆیان.

بۆ نموونە ئەگەر ئایەتێك لە قورئاندا بە شێوەیەکی گشتی هاتبێت سوننەت واتاکەی تەفسیر دەکات و شیدەکاتەوە، ئەگەر بە شێوەیەك لە شێوەکان واتاکەی بۆ خەڵکی ڕوون نەبێت سوننەت ڕوونی دەکاتەوە، بە کورتی وەکو زانایان دەفەرموون سوننەت لە ئاستی قورئاندا سێ حاڵەتی هەیە:

١- لە سوننەتدا هەندێ حوکم هاتبێت هاوشێوەی ئەو حوکمەی کە لە سوننەتدا هاتووە، ئەوە دەچێتە بابی هاوشێوە بوون و پشتگیری و زۆربوونی بەڵگەکان، بۆ

نموونه واجب بوونی نوێژ و زەکات و ڕۆژوو، هەروەها چاکه لەگەڵ دایك و باوك وبەجێهێنانی سیلەی ڕەحم و ئەحکامی تر له قورئاندا هاتووه، بەهەمان شێوه و هەمان حوکم له سوننەتیشدا هاتووه، ئەوه جۆرێکه له یەکانگیری بەڵگەکان و زۆربوونیان.

٢- حاڵەتێکی تر ئەوەیه له قورئاندا هەندێ ئەحکامی گشتگیر و موجمەل هاتبێت شیکردنەوەکەی له سوننەتدا بەیان کرابێت، یان هەندێ ئەحکام به موتڵەق وڕەهایی وبه شێوەیەکی گشتی و بەبێ جیاکردنەوەو شیکردنەوه هاتبێت، له سوننەتیشدا سنووردارکردن و ڕوونکردنەوەو تایبەتکردنیان هاتبێت.

٣- هەندێ جار حوکمی شەرعی دیاریکراو وەکو حەرام بوونی کۆکردنەوەی نێوان ئافرەتێك و پورەکەی لەلای پیاوێك له سوننەتدا هاتووه بەڵام له قورئاندا ئەو حوکمه باس نەکراوه، پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم فەرموویەتی: (لا يجمع بين المرأة وعمتها ولا بين المرأة وخالتها إنكم إذا فعلتم ذلك قطعتم أرحامكم )[(١)] واته: هیچ پیاوێك بۆی نییه له نێوان ژنێك و پوریدا کۆبکاتەوه خوشکی دایکی بێت یان خوشکی باوکی بێت، هەرکێیش وابکات سیلەی ڕەحمی خۆی بڕیوەو پێچەوانەی

(١) البخاري : النكاح (٥١٠٩) , ومسلم : النكاح (١٤٠٨) , والترمذي : النكاح (١١٢٦) , والنسائي : النكاح (٣٢٩١) , وأبو داود : النكاح (٢٠٦٦) , وابن ماجه : النكاح (١٩٢٩) , وأحمد (٤٥٢/٢) , ومالك : النكاح (١١٢٩) , والدارمي : النكاح (٢١٧٩).

شەرعی کردووە. هەروەها تەنها لە سوننەتدا باسی ئەوە کراوە کە موسوڵمان بە کوشتنی کافر ناکوژرێتەوە: (ولا یقتل مسلم بکافر) [١]

الله تعالى فەرموویەتی: (وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ) النحل:٤٤. ئەوەش ئاماژەیەکی ڕوون و ئاشکرایە کە پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم داوای لێکراوە شەرحی واتاکانی قورئان بۆ خەڵکی بکات، هەرچی لەلایان پێویستی بە ڕوونکردنەوە بێت روونی بکاتەوە. پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم لە فەرموودەیەکی صحیح دا فەرموویەتی: (ألا إني أوتيت القرآن ومثله معه) [٢] کە مەبەستی لە (ومثله معه) سوننەتە.

واتای (وهي دلائل القرآن )یش ئەوەیە کە سوننەت بەڵگەیە بۆ شەرح و ڕوونکردنەوەی قورئانی پیرۆز و ئاماژەیە بۆ واتاکانی .

**(وليس في السنة قياس):** واتە: هیچ شتێك نەکەین بە هاوتای سوننەت کە هاوتای نییە وبە شتێك بڵێین ئەمە سوننەتە و خۆی سوننەت نەبێت! چونکە هەرکێ شتێك لە دەرەوەی سوننەت بۆ سوننەت زیاد بکات ئەو کەسە موبتەدیعە و بیدعەکەشی گومڕاییە وخۆیشی ڕێگای سوننەتی ون کردووەو حەقی نەپێکاوە.

(١) البخاري : العلم (١١١) , والنسائي : القسامة (٤٧٤٤) , وابن ماجه : الديات (٢٦٥٨) , وأحمد (٧٩/١) , والدارمي : الديات (٢٣٥٦).
(٢) صحيح الجامع: (٢٦٤٣).

بەڵام ئەو قیاسەی کە پێشەوا ئەحمەد نکۆڵی لێ دەکات ئەو قیاسە نییە کە زانایان باسیان کردووە کە حوکم لەسەر شتە هاوشێوەکانی یەکتر دادەبەزێنن، لەگەڵ ئەوەشدا بە شێوەیەکی گشتی پێشەوا ئەحمەد بەڕەحمەت بێت لەمەسەلەی ڕەتکردنەوەی قیاس کردندا زۆر توند بووە، چونکە سوننەت و شەریعەت تەواو و بێ کەموکورتی و نوقسانییە ونیازێك بەو قیاسە نییە کە بەواتای بیدعە و هێنانی شتی نامۆ و جیاواز لە سوننەت دێت.

تەنانەت پێشەوا ئەحمەد لە مەسەلەی درووست بوونی ئیجماع و کۆدەنگی زانایانیشدا تێبینی زۆری هەبوو و ئەو زاراوەی پێ ڕاست و ورد نەبوو، دەیفەرموو چوزانی ناکۆکی و ڕاجیایی لەسەر درووست نەبووە، بەڵکو ئەوەی پی ڕاستتر بوو بوترێت: ( لا أعلم خلافا) واتە نەمزانیوە لەم بارەوە خیلاف و ڕاجیاییەك هەبێت.

**(ولا تُضربُ لها الأمثال):** واتە: هەرچی لە سوننەتدا جێگیر بوو ئیتر نابێت کەس ڕەخنەی لێ بگرێت، یان تێبینی لەسەری هەبێت، الله تعالی فەرموویەتی: (فَلَا تَضْرِبُوا لِلَّهِ الْأَمْثَالَ ۚ إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ) النحل: ٧٤. هەروەها ئەو وتەیەی پێشەوا ئەحمەد بەڕەحمەت بێت بەرپەرچدانەوەیە بۆ بتپەرستەکان کە قیاسی پەروەردگاریان لەگەڵ خواکانی خۆیاندا دەکرد و دەیانوت: (مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ) الزمر:٤. یان کە دەیانوت: ﴿هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِۚ﴾ یونس:١٨.

**( ولا تُدركُ بالعُقول ولا الأهواء، إنما هو الاتباع وتركُ الهوى):** واتە: مرۆڤ توانای ئەوەی نییە لە حیکمەتی حوکمە شەرعییەکان بگات و بە میزاج و ئارەزووی خۆی ناتوانێت لە پرسێك تێبگات کە الله پەردەی لەسەر حەقیقەتەکەی بۆمان لا نەداوە، بەڵکو پێویستە لەسەری شوێنکەوتوو بێت واز لە هەواو ئارەزوو و میزاج و تێگەیشتنی نامۆی خۆی بهێنیت.

پێویستە باوەڕمان بە سوننەتی پێغەمبەر صلی الله علیە و سلم هەبێت کە جێگیر بووە وکاری پێ بکەین و ڕەتی نەکەینەوەو تەئویلی نەکەین و واتاکانی نەگۆڕین، بۆ نموونە وەکو فەرموودەی دابەزینی الله تعالی بۆ ئاسمانی دونیا و فەرموودەکانی بینینی الله تعالی لە ڕۆژی قیامەتدا و بەلێکدانەوەی عەقڵی نەڵێین ئەگەر دابەزیت عەرش لە کاتی دابەزینەکەیدا چۆڵ دەبێت و یان مەسەلەی بینینی ئەمەو ئەوە دەگرێتەوە، هەرچی لە سوننەتی سەحیحدا جێگیر بوو پێویستە باەڕمان پێی هەبێت، چونکە عەقڵی مرۆڤەکان لەوە لاوازتر و بچووکترە بتوانێت لە حەقیقەتی الله تعالی تێبگات.

هەروەها لەمەسەلەی حوکمە شەرعییەکاندا بەهەمان شێوە ، درووست نییە موسوڵمان ناڕەزایی نیشان بدات وگومان بکات و بەدوای حیکمەتی هەندێ عیبادەتدا بگەڕێت کە الله تعالی ڕوونی نەکردووەتەوە بۆمان، بۆ نموونە حیکمەت لە سوڕانەوە بە دەوری کەعبەی پیرۆز و ماچ کردنی بەردە ڕەشەکە و ڕەجم کردنی شەیتان و زۆر شتی تر.

زانایان بەوەی کە زانیویانە و پێی گەیشتوون باسیان لەو حیکمەتانە کردووە، بەڵام هاوکات وتوویانە ئەوە هەوڵێکە بۆ تێگەیشتن لە حیکمەتی ئەو حوکم و عیبادەتانە و دواجار حیکمەتی ڕاستەقینە و ئامانجی کۆتایی تەنها الله خۆی دەیزانێت.

# باوەڕهێنان بەچاکە و خراپەی قەدەر

پێشەوا أحمد بن حنبل رحمه الله فەرموویەتی: **(وَمِنْ اَلسُّنَّةِ اَللَّازِمَةِ اَلَّتِي مَنْ تَرَكَ مِنْهَا خَصْلَةً - لَمْ يَقْبَلْهَا وَيُؤْمِنْ بِهَا - لَمْ يَكُنْ مِنْ أَهْلِهَا اَلْإِيمَانُ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ، وَالتَّصْدِيقُ بِالْأَحَادِيثِ فِيهِ، وَالْإِيمَانُ بِهَا، لَا يُقَالُ لِمَ وَلَا كَيْفَ، إِنَّمَا هُوَ اَلتَّصْدِيقُ وَالْإِيمَانُ بِهَا).**

واتە یەکێك لەو بیروباوەڕانەی کە لەلای ئەهلی سوننەت چەسپاوە و بە دڵنیاییشەوە بەشێکە لە سوننەتی جەخت لەسەر کراو ، کە ئەگەر کەسێك دەست بەرداری یەك بەش و خەسڵەتی ببێت و باوەڕی پێی نەبێت ئیتر پێی ناوترێت ئەهلی سوننەت، مەسەلەی باوەڕ هێنانە بە چاکەو خراپە و خێرو شەڕی قەدەر و باوەڕ هێنانە بە هەموو ئەو فەرموودە سەحیحانەی کە دەربارەی قەدەر هاتوون، درووست نییە بلێت بۆچی و چۆن! بەڵکو تاکە ڕێگای موسوڵمان و شوێنکەوتووی سوننەت باوەڕهێنانە بە قەدەر.

مەبەست لە خەیری قەدەر ڕوودانی هەموو شتێکە کە بەندە پێی خۆش بێت و حەزی لێ بکات، وەکو تەندروستی باش و ماڵ وسەروەتی زۆر و خێزان ومناڵی باش وهەرشتێکی تر کە پێی خۆشحاڵ بێت.

مەبەست لەشەڕو خراپەی قەدەریش ئەوەیە کە بەندەکان حەز بە بوون و ڕوودانی ناکەن وەکو هەژاری و نەخۆشی و مردن و کوژران و لەدەستدانی ماڵ و

کەسوکار وهەر باس و ڕووداوێکی ناخۆشی تر هەموو ئەوانەش قەدەرە و بە ویست و بە فەرمانی الله تعالی ڕوویان داوە.

سەبارەت بە وتەی ئیمام ئەحمەد کە دەڵێت: **(لَا يُقَالُ لِمَ وَلَا كَيْفَ)** واتە لە کردارەکانی الله تعالی دا نابێت بلێی بۆچی؟ نابێت بڵێی الله بۆ وای کرد؟ بۆ نموونە بڵێی بۆ نەخۆشی خستم؟ بۆ فڵانە کەسی دەوڵەمەند کرد ویەکێکی تری کرد بە زانا وقسەی لەو جۆرە هەمووی پێچەوانەی ئیمانە بەقەدەر.

هەرکێ بڵێت بۆچی الله فڵانە کرداری کرد و ناڕەزایی نیشان بدات ئەو حوکمی پەروەردگاری ڕەتکردووەتەوەو خۆی لە ئیسلام بەری کردووە، الله فەرموویەتی: (لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ) الأنبياء:٢٣.

هەروەها وەکو چۆن نابێت وشەی بۆچی لەبەرانبەر کردارەکانی رب العالمین دا بەکار بهێنین، بە هەمان شێوە نابێت چۆنیش بەکار بهێنین، بۆ نموونە الله تعالی دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا، الله تعالی لەسەر عەرشی خۆی ئیستیوا دەکات و دادەنیشێت، باوەڕمان پێیەتی بەڵام پرسیاری چۆنێتی و شێوازەکەی نابێت بکەین و پێویستە وەکو زانایان و پێشەوایانی ئەهلی سوننەت فەرموویانە باوەڕمان پێیی بێت بەو شێوەی کە لائیق و شیاوە بە الله تعالی خۆی.

هەر کەسێك ئیمانی بەقەدەر نەبێت شوێنکەوتووی سوننەت نییە و عەقیدەیەکی ناتەواوی هەیە، چونکە قەدەر بنچینەیەکی تۆکمە و پایەیەکی بەهێزی بیروباوەڕە لە پایەکانی ئیمان لەلای ئەهلی سوننەت. بەڵگەکانیشی لە قورئان و سوننەتدا زۆرن،

لەوانە: (وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُّبِينٍ) يس:١٢. واتای ئایەتەکەش بەوە دێت کە الله تعالی هەرچی ڕووداوێك ڕوو بدات پێی زانیوەو لە (اللوح المحفوظ) دا نووسیوێتی.

پێناسەی قەدەر ئەوەیە کە اللە تعالی تەقدیری هەموو شتێکی لەسەرەتاوە کردووە و زانستی پێی بووە کە لە چ کاتێکدا ڕوو دەدات و بەچ شێوە و سیفەتێکیش ڕوودەدات و نووسیوێتی و ویستی لەسەری بووە کە ڕوو بدات. بەو پێیەش پایەکانی قەدەر بریتین لەم چوار پایەی کە هەرکێ بەو شێوە ئیمانی پێیان نەبێت ئیمانی بەقەدەر نییە:

١- العلم: زانستی الله بە هەموو شتەکان، واتە ئیمان هێنان بە عیلم وزانستی الله بە شێوەیەکی ئەزەلی لە ڕابردوودا، واتە بێ ئەوەی ئەو زانستە سەرەتایەکی هەبێت، لەبەر ئەوەی الله خۆی سەرەتای نییە وەکو چۆن کۆتایی نییە، واتە وەکو چۆن هەموو زانستێکی ڕابردووی زانیوە، هەموو زانستێکی ئێستا و داهاتوویش هەر دەزانێت و لێی شاراوە نییە، هەروەها لە هەموو شتێکیش ئاگادارە کە ڕووی نەداوەو ئەگەر ڕوویشی بدایە چۆن ڕووی دەدا، بۆیە کاتێك بێ باوەڕان لە دوای مردن داوای لێ دەکەن جارێکی تر بۆ دنیا بیانگێڕێتەوە، اللە تعالی دەفەرموێت: (وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ) الأنعام:٢٨. واتە ئەگەر زیندوو بینەوەو بگەڕێنەوە بۆ دونیا هەمان کردەوە خراپەکانیان دووبارە دەکەنەوە.

٢- الكتابـة: نووسـینی هەمـوو شـتێك لە (اللـوح المحفـوظ) دا. هەمـوو شـتێك دەربـارەی كەسـەكان و سـیفەتی شـتەكان و كـردار و ڕزق وڕۆزی وبەخـتەوەری وناهەمەتی و هەژاری و دەوڵەمەندی و سەربەرزی و زەلیلی و بە دەسـەڵات بـوون و بێ دەسەڵاتی وهەموو شتێك نووسراوە. بەڵگەی قورئان لەسەر ئەم مەسەلە زۆرە، بۆ نموونە الله تعالى فەرموویەتی: (أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ ۗ إِنَّ ذَٰلِـكَ فِي كِتَـابٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِـكَ عَلَى اللَّهِ يَسِـيرٌ) الحـج:٧٠. مەبەسـت لە الكتـاب (اللوح المحفوظ)ە.

هەروەها پێغەمـبەر صـلی اللـه علیـه و سـلم فەرمـوویەتی: (كَتَـبَ اللَّـهُ مَقَـادِيرَ الخَلَائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْـفَ سَـنَةٍ، قـالَ: وَعَرْشُـهُ عـلَى المَاءِ.) مسلم: ٢٦٥٣،

٣- المشیئة: ویستی الله لەسەر ڕوودانی ئەو شت و ڕووداوانە بووە و لەدەرەوەی ویست و مەشیئەتی ئەو ڕوویان نەداوە. بەلام گرنگە بزانرێت كە ئیـرادە دەبێـتە دوو جـۆرەوە: ئیرادەیەكـی دینـی و ئیرادەیەكـی كەونـی، ئەمەی لێـرەدا باسـی دەكەیـن مەبەست پێی ئیرادەی كەونییە، واتە الله تعالى وەكـو ڕووداوەكەو كـارەكە ویسـتی لەسەری بووە و لەدەرەوەی توانای خۆی ڕووی نەداوە، چـونكە ئەگەر وا بوترێـت ئەوە جۆرێكە لە بـێ دەسـەڵاتی دەدرێـتە پـاڵ اللـه تعـالی، بـۆیە ئەهلـی سـوننەت فەرموویـانە كە اللــه ئەو كــارو كــردەوەو ڕووداوانەی ویســتووە و ڕێــگەی داوە ڕووبـدات، بەڵام لە ڕووی دینـی و شـەرعییەوە ویسـتی لەسـەری نەبـووە و داوا لە بەندەكانی ناكات پێچەوانەی شەرعەكەی كار بكەن.

بۆیە ئەگەرچی الله تعالی کوفر و تاوان و کارە خراپەکان لەدەرەوەی قەدەر و دەسەڵات و ڕەزامەندی ئەو ڕووینەداوە لە ڕووی قەدەر و تەکوینەوە، بەڵام هاوکات لە ڕووی دینییەوە پێی ڕازی نییە و حەز ناکات بەندەکانی ئەو کارانە ئەنجام بدەن.

٤- الخلق والتكوين: واتە اللە عزوجل خۆی هەموو کردارەکانی درووست کردووە. تاقمی قەدەرییەکان دەڵێن: الله عزوجل کردەوەی کەس درووست ناکات، نەکردەوەی باش و نەکردەوەی خراپ، نە کوفرو نە تاوانەکانی درووست نەکردووە، بەڵکو ئەوە بەندەکان خۆیانن ئەو کارانە درووست دەکەن، ئەوەش قسەیەکی باتڵ و نابەجێیە وەکو زانایان دەفەرموون، چونکە ئەوەی لەم بارەوە ددرێتە پاڵ الله درووست کردن و داهێنانێتی، نەك ئەوەی فەرمانی بە ئەنجامدانی کوفر وخراپە کردبێت.

پوختەی ئەم مەسەلە ئەوەیە کە قەدەر بنەمایەکە لەو شەش بنەمایانەی ئیمان لە ئیسلامدا و ئیمانیش بەبێ باوەڕ بوون بە قەدەر کامڵ و تەواو نابێت وهەرکێ باوەڕی بەقەدەر نەبێت ئەوە ئیماندار نییە.

ئەهلی سوننەت - بە پێچەوانەی تاقمە لادەرەکانەوە - دەڵێن: هەموو کردارو هەموو شتێك کە الله تعالی دەیکات حیکمەتی تێدایە، فەرمانی حیکمەتە و قەدەغە کردنی حیکمەتە و هەموو قەدەر و درووستکردنێکی حیکمەتێکی تێدایە، وەکو خۆی فەرموویتی: (إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ) یوسف:٦.

بەلای هەندێ لە زانایانەوە - کە لەوانەیە هەر ئەو بووچوونەش ڕاست بێت - جیاوازی ناکەن لە نێوان قەزا و قەدەردا و دەڵێن لەیەکتر جیانابنەوە وەکو

(الخطابي) له معالم السنن دا ٥/٧٧ دەڵێت قەزا وقەدەر وەکو بنچینەو ئەو بینایە وایە کە لەسەری درووست دەکرێت و جیابوونەوەیان نییە.

کاتێك الله عزوجل جیبریلی علیه السلام نارد بۆ لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بنچینەکانی ئیسلام و ئیمانی بۆ ڕوونکردنەوەو فەرمووی: (الْإِسْلَامُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلًا). کاتێك کە پرسیاری ئیمانی لێ کرد فەرمووی: (أَنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ)[1] بۆیە قەدەر کۆڵەکەیەکی مەزنە لە کۆڵەکەکانی ئیمان و هەمیشە لە ڕیوایەتەکانیشدا بەو شێوە هاتووە کە پێویستە موسوڵمان باوەڕی بە چاکە وخراپە و شیرینی و تاڵی قەدەر هەبێت.

له دوای ئەوە پێشەوا أحمد بن حنبل رحمه الله فەرموویەتی: (وَمَنْ لَمْ يَعْرِفْ تَفْسِيرَ اَلْحَدِيثِ وَيَبْلُغْهُ عَقْلَهُ فَقَدْ كُفِيَ ذَلِكَ وَأُحْكِمَ لَهُ، فَعَلَيْهِ اَلْإِيمَانُ بِهِ وَالتَّسْلِيمُ لَهُ) هەندێ جار ڕوو دەدات باش وبە تەواوی لە واتای فەرموودەیەك تێنەگەیت - کە کەمێکی تر نموونەی بۆ دەهێنێتەوە - ئەوەش حیکمەتێکی بۆ تۆ تێدایە و وا باشترە بۆ دین ودونیات، الله تعالی فەرموویەتی: (لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ) البقرة:٢٨٦. هەندێ واتا و حەقیقەت هەیە لە دەرەوەی تواناو تێگەیشتنی عەقڵی مرۆڤەکاندایە، چونکە عەقڵی مرۆڤ سنوورێکی هەیە ناتوانێت تێیپەڕێنێت.

---

(١)صحیح البخاري:٥٠.

مەبەست لە (تفسير الحديث) لە وتەی پێشەوا ئەحمەد حەقیقەتی مەسەلەکەیە، بۆ نموونە حەقیقەتی واتای (الاستواء) لە ئایەتی (الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ)طه:٥. کاتێك پرسیار لە پێشەوا مالك بن أنس دەکرێت رحمه الله دەڵێت: (الاستواء معلوم والكيف مجهول) واتە خودی کردارەکە زانراوە ودیارە، بەڵام حەقیقەتی کردارەکە و چۆنییەتەکەی نەزانراوە و تەنها الله خۆی دەیزانێت. ئینجا پێشەوا ئەحمەد نموونە دەهێنێتەوە ودەڵێت:

**(مِثْلُ حَدِيثِ " اَلصَّادِقِ اَلْمَصْدُوقِ)** : نموونەی ئەوانەش فەرموودەی الصادق المصدوق ە، کە مەبەست پێی فەرموودەکەی عبدالله بن مسعود ە الله لێی ڕازی بێت کە لە پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم دەیگێڕێتەوە: (إن أحدكم يجمع خلقه في بطن أمه أربعين يومًا، ثم يكون علقةً مثل ذلك، ثم يكون مضغةً مثل ذلك، ثم يبعث الله ملكًا فينفخ فيه الروح فيؤمر بأربع كلمات، ويقال له: اكتب عمله، ورزقه، وأجله، وشقي أو سعيد، ثم ينفخ فيه الروح، فوالذي لا إله غيره إن الرجل منكم ليعمل بعمل أهل الجنة حتى ما يكون بينه وبين الجنة إلا ذراع، فيسبق عليه الكتاب فيعمل بعمل أهل النار فيدخلها، ويعمل حتى ما يكون بينه وبين النار إلا ذراع، فيسبق عليه الكتاب فيعمل بعمل أهل الجنة فيدخلها) (١)

---

(١) صحيح البخاری: ٤٩٨٥.

لەبەر ئەوەش کە نــاوەڕۆکی ئەم فەرمــوودەیە مەســەلەیەکی غەیبیــیە و مــرۆڤ ناتوانێت وەکو مەسەلەیەکی دونیایی بەباشی لێ تێبگات، ئەو هاوەڵە بەڕێزە دەڵێـت ڕاستگۆی باوەڕپێکراو فەرمووی، کە مەبەستی پێـی پێغەمـبەری ئـازیزە صـلی اللـه علیه و سلم.

**(وَمِثْلُ مَا كَانَ مِثْلَهُ فِي اَلْقَدَرِ، )** هەروەها ئەو فەرمودانەش کە پەیوەسـتن بەباسـی قەدەر ، سـەبارەت بەوەی اللـە خـالقی هەمـوو بـوونەوەر و کردارێـك وحـوکمێکە، بەوەش کە هــیچ لەم گەردوونەدا بەبــێ زانســتی اللــە ڕوونــادات وکەســیش لە دەرەوەی ویست وئیرادەی الله تعالی ناتوانێت نەسوود و نەزیانت پـێ بگەیەنێـت، پوختەی واتای قسـەکەی ئەوەیە هەرچـی دەربـارەی قەدەر بێـت پرسـیار و مشـت ومڕی لەسەر مەکە بەڵکو باوەڕی پێ بهێنە و وەریبگرە، وەکو لە فەرموودەی صحیح دا هاتووە: (واعلم أنَّ الأُمَّةَ لو اجتمعت على أن ينفعوكَ بشيءٍ ، لم ينفعوك إلا بشيءٍ قد كتبه اللهُ لك ، ولو اجتمعوا على أن يضروكَ بشيءٍ ، لم يضروكَ بشيءٍ إلا قد كتبـه اللهُ عليكَ ، جَفَّتِ الأقلامُ ورُفِعَتِ الصُّحُفُ) [1].

---

(١) الترمذي (٢٥١٦) واللفظ له، وأحمد (٢٦٦٩).

(معبد الجهني)[١] یەکەم کەس بووە دەرگای قسەکردن ومشتومڕی لەسەر قەدەر کردووەتەوە و پێچەوانەی کیتاب وسوننەت قسەی لەسەری کردووە، وەکو لە صحیح مسلم دا هاتووە، کە ابن عمر لەو کەسە بەری بووە: (انَ أَوَّلَ مَن قالَ في القَدَرِ بالبَصْرَةِ مَعْبَدٌ الجُهَنِيُّ، فانْطَلَقْتُ أنا وحُمَيْدُ بنُ عبدِ الرَّحْمَنِ الحِمْيَرِيُّ حاجَّيْنِ، أوْ مُعْتَمِرَيْنِ، فَقُلْنا: لو لَقِينا أحَدًا مَن أصْحابِ رَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، فَسَأَلْناهُ عَمَّا يقولُ هَؤُلاءِ في القَدَرِ، فَوُفِّقَ لنا عبدُ اللهِ بنُ عُمَرَ بنِ الخَطَّابِ داخِلًا المَسْجِدَ، فاكْتَنَفْتُهُ أنا وصاحِبِي أحَدُنا عن يَمِينِهِ، والآخَرُ عن شِمالِهِ، فَظَنَنْتُ أنَّ صاحِبِي سَيَكِلُ الكَلامَ إلَيَّ، فَقُلتُ: أبا عبدِ الرَّحْمَنِ إنَّه قدْ ظَهَرَ قِبَلَنا ناسٌ يَقْرَؤُونَ القُرْآنَ، ويَتَقَفَّرُونَ العِلْمَ، وذَكَرَ مِن شَأْنِهِمْ، وأنَّهُمْ يَزْعُمُونَ أنْ لا قَدَرَ، وأنَّ الأمْرَ أُنُفٌ، قالَ: فإذا لَقِيتَ أُولَئِكَ فأخْبِرْهُمْ أنِّي بَرِيءٌ منهمْ، وأنَّهُمْ بُرَآءُ مِنِّي، والذي يَحْلِفُ به عبدُ اللهِ بنُ عُمَرَ لو أنَّ لأَحَدِهِمْ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا، فأنْفَقَهُ ما قَبِلَ اللَّهُ منه حتَّى يُؤْمِنَ بالقَدَرِ،...) [٢].

**(وَمِثْلُ أَحَادِيثِ اَلرُّؤْيَةِ كُلِّهَا،)** مەبەستی بینینی ئیماندارانە بۆ پەروەردگاریان لە ڕۆژی قیامەتدا، کە ئەو مەسەلە یەکێکە لە بنەماکانی عەقیدە لەلای ئەهلی سوننەت

(١) یەکەم موبتەدیعە لە ئیسلامدا کە لەمەسەلەی قەدەردا لەسەردەمی هاوەڵاندا قسەی کردووە، پێش ساڵی ٩٠ ی کۆچی لەسەر دەستی الحجاج کوژراوە، بۆ ژیاننامەکەی بڕوانە: سير أعلام النبلاء: (١٨٦/٤).

(٢)صحيح مسلم: (٨).

و جەماعەت کە ئیمانداران لە ڕۆژی قیامەتدا پەروەردگاریان دەبینن، بەڵگەی کیتاب و سوننەت لەسەر ئەوەیە:

الله تعالی فەرموویەتی: (وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ)القيامة: ٢٢-٢٣. ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئیمانداران لە بەهەشتدا الله دەبینن.

هەروەها ئایەتی: (كَلَّا إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ) المطففين:١٥. ئەم ئایەتەش زانا گەورەکانی وەکو شافیعی بەڕەحمەت بێت دەفەرموون بەڵگەیە لەسەر بینین، چونکە مادام ئەو بێباوەڕانە بینینیان لەسەر قەدەغە کراوە کەواتە ئیمانداران ڕێگەیان پێدراوە ببینن.

هەروەها لە هەردوو صحیح ی بوخاری و موسلیمدا هاتووە کە ئیمانداران وەکو چۆن بە ڕوونی و بەجوانی لە دونیادا مانگ دەبینن، بەو شێوەش لە ڕۆژی قیامەتدا پەروەردگاریان دەبینن ( إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ يَومَ القِيَامَةِ كما تَرَوْنَ هذا، لا تُضَامُونَ في رُؤْيَتِهِ) البخاري: ٧٤٣٦.

هەروەها بەڵگەی تریش زۆرە بۆ نموونە واتای وشەی (زِيَادَةٌ) لە فەرموودەی الله تعالی: ( لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ) یونس: ٢٦. لە صحیح ی مسلم دا هاتووە کە مەعناکەی بینینی الله یە. (١)

(١) صحيح مسلم: ١٨١.

**(وَإِنْ نَـأَتْ عَـنْ اَلْأَسْـمَاعِ وَاسْـتَوْحَشَ مِنْهَـا اَلْمُسْـتَمِعُ،)** ئەوانەی کە بینینـی پەروەردگاریان بەلاوە نامۆیە و ڕەتی دەکەنەوە تاقمە گومڕاکانن وەکو جەهمییەکـان و موعتەزیلەکان، ئەوان باوەڕیان بەوە نیـیە کە بینیـنەکە بینینێکـی ڕاسـتەقینە بێـت، بەڵکو ئەو مەسەلە تەئویل دەکەن و دەڵێن مەبەسـت پێـی زانسـتە نەك ئەو بینیـنەی بەچاو ببینرێت! دەڵێن: (ترون ربکم) مەعنای ئەوەیە زانیاریتـان دەبێـت دەربـارەی پەروەردگارتـان نەك بەچـاوی سـەر ئەو ببیـنن، ئەوەش تەفسـیرێکی بـاتڵە و دوورخستنەوەیە لە واتای ئایەتەکانی قورئان و سوننەت کە بەڕاشکاوی بینینی اللـه جێگیر دەکەن.

ئەگەر مەبەسـت لەو بینیـنە - وەکـو زانایـان دەفەرمـوون - زانسـت بـوایە ئەوە تایبەت نەدەبوو بە ئیماندارانەوە، بەڵکو بێ باوەڕانیش لەو زانستەدا دەربـارەی اللـه بەشدار دەبوون.

لەم مەسەلەشـدا - واتە لە مەسـەلەی بینینـی اللـه تعـالی لەلایەن ئیمانـدارانەوە لە ڕۆژی قیامەتدا - ئەشاعیرە هەڵوێستیان ڕوون نییە و ڕاڕان، لە لایەکەوە هاوبۆچوون و تێگەیشتنن لەگەڵ ئەهلـی سـوننەتدا بەوەی بینینـی اللـه جێگیـر دەکەن و دەڵـێن باوەڕمـان پێیەتـی. بەڵام لەولاشـەوە هـاوبۆچوونن لەگەڵ موعتەزیلەکـان بەوەی کە نکۆڵی لە جیهەت و لایەن دەکەن بۆ الله ودەڵێن الله لە ڕۆژی قیامەتدا دەبینرێـت، بەڵام بەبێ ئەوەی شوێن و جیهەت و لایەنێکی هەبێت، لەمەشـدا ئەهلـی سـوننەت بەرپەرچی ئەشاعیرەیان داوەتەوە بەوەی بینین دەبێت بـۆ جـیهەت و شـوێنێك بێـت

نابێت لە یەك کاتدا بینین جێگیر بکەیت و باوەڕت پێی هەبێت، هاوکـات نکـۆڵی لە شوێن و لایەن و جیهەتێك بکەیت کە بۆ بینینەکە ڕووی تێبکەیت.(١)

لە کۆتایی ئەم بەشەدا پێشەوا ئەحمەد دەفەرموێت: **(وَإِنَّمَا عَلَيْهِ اَلْإِيمَانُ بِهَا، وَأَنْ لَا يَرُدَّ مِنْهَا حَرْفًا وَاحِدًا وَغَيْرَهَا مِنْ اَلْأَحَادِيثِ اَلْمَأْثُورَاتِ عَنْ اَلثِّقَاتِ).** واتە: پێویسـتە لەسـەر ئەو کەسـەی ئەهلـی سـوننەتە بـاوەڕی بەو ئـایەت و فەرمـوودانە هەبێـت دەربـارەی قەدەر و بینینـی پەروەردگـار و پیـت بە پیتـی بسـەلمێنێت و هەرچـی فەرمـوودەو ئەسـەری تـر هەیە لەم بـارەوە بەهەمـان شـێوە بـاوەڕی پێیـان هەبێـت ومەسەلەیەکی بڕاوەو جێگر بیت لەلای .

(١) پرسیار ١٠/جا تو ئە شاعیرە ت بو جیا کردوە تە وە لە اهلێ سونە وجە ماعە؟
وەڵام/ من جیام نەکردووەتەوە هەر خـۆی وایە وئەوان خۆیـان جیـا کـردووەتەوە! بـۆ نمـوونە ناکرێت کەسێك لە یەك کاتدا هەم کورد بێت و هەم تـورك بێـت ، ئەویـش ئاوهـایە، ئەشـاعیرە ئەشاعیرەن و ئەهلی سوننەتیش ئەهلـی سـوننەتن. ناگونجێـت کەسـێك ئەشـعەری بێـت یـان موعتەزیلە وخەواریج و مورجیئی بێت، لە هەمان کادا ئەهلی سوننەتیش بێت. ئەشاعیرە لە زۆر بنچینەدا لە ئەهلی سوننەت جیاوازن، ئـایەتێکی زۆری قورئـانی پیـرۆز و سـوننەتی پێغەمـبەر صلی الله علیه و سلم تأویل دەکەن و لە ڕواڵەتەکەی بۆ واتای تر لایدەبەن، عەقڵ پێش نەقـڵ دەخەن و فەرموودەی ئاحاد لە عەقیدەدا وەرناگرن با صحیح یش بیت و لە پێناسەی قورئـان و کەلامی الله تعالی دا زۆر بۆچوون و قسەو تێگەیشتی جیاوازیان لە ئەهلی سوننەت هەیە ئیتر چۆن دەکرێت بوترێت ئەشاعیرە و ئەهلی سوننەت جیاوازییان نییە، واقیع دەڵێـت لە پێناسـە و بنەما و عەقیدەو تایبەتمەندییەکانیاندا جیاوازییان هەیە.

# مشتومڕەکە

**(وَأَنْ لَا يُخَاصِمَ أَحَدًا وَلَا يُنَاظِرَهُ، وَلَا يَتَعَلَّمَ اَلْجِدَالَ. فَإِنَّ اَلْكَلَامَ فِي اَلْقَدَرِ وَالرُّؤْيَةِ وَالْقُرْآنِ وَغَيْرِهَا مِنْ اَلسُّنَنِ مَكْرُوهٌ وَمَنْهِيٌّ عَنْهُ، لَا يَكُونُ صَاحِبُهُ -وَإِنْ أَصَابَ بِكَلَامِهِ اَلسُّنَّةَ- مِنْ أَهْلِ اَلسُّنَّةِ حَتَّى يَدَعَ اَلْجِدَالَ وَيُسَلِّمَ وَيُؤْمِنَ بِالْآثَارِ).**

لێرەدا پێشەوا أحمد بن حنبل دەڵێت موسوڵمان پێویستە باوەڕی بە فەرموودەکان هەبێت و مشتومڕ نەکات ومونازەرە و ڕووبەڕووبوونە لەگەڵ کەسدا نەکات ونەخۆیشی فێری ئەو جۆرە مشتومڕ ومونازەرانە بکات، چونکە ئەوە ڕێگایەکی سەلامەت نییە بۆ فێربوونی دین و بەرگریکردن لێی.

لەوانەشە کەسەکە خۆی تووشی فیتنە ببێت لەو کاتەدا وبە خۆی بکەوێتە گومان لە واتای دەقەکان ویان لەکاتی مشتومڕ و مونازەرەدا نەتوانێت وەڵامی گومانەکانی بەرانبەر بداتەوەو دواجار خۆیشی بکەوێتە فیتنە و لادانەوە، بۆیە هەموو جۆرە مشتومڕێکی لەو جۆرە دەربارەی قەدەر و قورئان ومەسەلەی بینینی الله لە ڕۆژی قیامەت و ئەو جۆرە باسانەدا هەمووی کارێکی ناپەسەندە وموسوڵمان پێویستە باوەڕی بەدەقەکانی قورئان وسوننەت هەبێت و خۆی بدات بەدەستیانەوەو متمانەی تەواوی پێیان هەبێت.

الله تعالی سەرزەنشت و زەمی ئەو کەسانەی لە قورئاندا کردووە کە زۆر خەریك دەبن بە مشتومڕ ودەمەقاڵێ ومونازەرەوە کردن و فەرموویەتی: ( مَا ضَرَبُوهُ

لَكَ إِلَّا جَدَلًاۢ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ) الزخرف: ٥٨. (خَصِمُونَ) واته ئەوانه کەسانێکن بەدوای مشتومڕ ودژایەتیدا دەگەڕێن.

پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم فەرموویەتی: ( أبْغَضُ الرِّجالِ إلى اللَّهِ الألَدُّ الخَصِمُ) [١]واته بێزراوترین کەس له لای الله عزوجل کەسێکه وابەسته و شەیدای مشتومڕ وبەگژاچوونەوه بێت.

زانایانی ئەهلی سوننەت تەنانەت پێیان باش نەبوو نەك مشتومڕ بکرێت، بەڵکو وەڵامی پرسیاری ئەو جۆره کەسانەش بدرێتەوه، وەکو الآجري له کتێبی الشریعەدا دەگێڕێتەوه که پیاوێك له ئەهلی بیدەع به (أیوب السختیاني) وت ئەی باوکی بەکر پرسیاری یەك وشەت لێ دەکەم، ئەویش کابرای بەجێهێشت و بەپەنجەی ئاماژەی بۆ کرد وپێی وت: پرسیاری نیو وشەشم لێ مەکە.

له ڕاستیدا - وەکو یەکێك له ڕاڤەکەرانی (أصول السنة) دەڵێت - قسه کردنی مرۆڤ دەربارەی قەدەر و پرسیارکردن و وردبوونەوه له باسەکانی ورەخنه گرتن و پرسیار کردن بەوەی بڵێت ئەمه بۆ وابوو و ئەو مەسەله له صفات دا حەقیقەت و شێوازەکەی چۆنه و به پاساوی بەرگری کردن له ئیسلام دەقەکان تەئویل بکات و له واتاکانی خۆی دووریان بخاتەوه وەکو پیشەی ئەوانەی به (المتکلمون) دەناسرێن و به موجادەله کردن دەربارەی قورئان و بابەتەکانی تری ئیسلام، خەریك بێت، ئەو جۆره مشتومڕ وناکۆکیانه کارێکی باش نییه و ئەگەر ئەنجامدەری

(١)صحيح البخاري (٢٤٥٧)، وصحيح مسلم (٢٦٦٨).

حەقیش بپێکێت زانایان هەر بەکارێکی باش و پەسەندیان نەزانیوە، چونکە مەترسی درووست کردنی گومان بۆ خۆی و بۆ خەڵکی تر هەر بوونی هەیە و کورد واتەنی وەکو یاریکردنە بە ئاگر.

لێرەشەوە بە واجبی دەزانم داوا لە زۆرێك لەو دڵسۆزانە بکەم بۆ دینەکەیان کە خۆیان بە مشتومڕ و مونازەرە کردن لە گەڵ کەسانی بێ باوەڕ و بیدعەکاردا لە کوردستان خەریك دەکەن کە دەست لەو کارە هەڵبگرن و لە جیاتی ئەوە حەق ڕوون بکەنەوەو ئەوەی کە ئەوان بانگەشەی بۆ دەکەن لە ناحەقی و لە پێچەاونەی کیتاب و سوننەت با بەرپەرچیان بدەنەوە بەبێ ئەوەی ڕووبەڕوویان ببنەوە و سنگیان بۆ دەرپەڕێنن و بڵێن ئەوە ئێمەین و وەرن با مونازەرە بکەین.

ئەو کارانە هەر چەند چاکەو سوودی هەبێت هاوکات لە خراپەو مەترسی درووست بوونی فیتنە و بڵاوکردنەوەی گومان بەدەر نییە، نەك تەنها بۆ کەسانێك کە ناتوانن لە ئاستی ئەو مونازەرەدا بن و تووشی گومان و فیتنە دەبن، بەڵکو خودی ئەوانەش کە بەرگری لە قورئان و سوننەت و عەقیدەی ئیسلامی دەکەن مەترسییان لەسەرە لەگەڵ کاتدا و بە هۆی زۆری خوێندنەوە لە کتێبی ئەهلی بیدەع بە بیانووی ڕەددانەوەیان، خۆیشیان تووشی هەمان ئەو دەردەی ئەوان ببن.

من خۆیشم ئەوەندەی لە توانای سنووردارمدا هەیە لەبەرگری کردن لە ئیسلام بە گشتی و لە عەقیدە بەتایبەت و دەرخستنی بیروباوەڕی تاقم و کەسە گومڕاکان، هەوڵم داوە لەسەر ئاستی کەسێتی لەگەڵیاندا تێکنەگیرێم و تەنها ڕەددی بیرۆکە و بۆچوونەکانیان بدەروە بێ ئەوەی ناوی خۆیان و لایەن و تەوژمەکانیان بهێنم ،

هەرچیش قسەم پـێ کرابیـت و ڕەخـنەم لێگیرابێـت وەلامـم نەداونەتەوە و خـۆم بە خاوەنی مەسەلەکە نەکردووە وەکـو ئەوەی مەبەسـتیان مـن نەبووبێـت، ئەوەش بـۆ برایانی بانگخواز و مامۆستایان و نووسەران ئەم بـوارە بەبـاش دەزانـم، ئەمەش کە باسی دەکەم هەمـان ئەم ڕێـگە چـارەیە کە پێشـەوا أحمـد بـن حنبـل لێـرەدا وەکـو بنەمایەك لە بنەماکانی ئەهلی سوننەت دەیخاتە ڕوو.

مشتومڕ نەکردن بە واتای ئەوە نییە بەرگـری لە سـوننەت نەکەیـت و بەرپەرچـی بیدعەکاران نەدەیتەوە نەخێر، بەڵام موجادەلە کردن و دەمەقاڵە و بەگژاچوون وەکو ڕێگـایەك بـۆ بەرگـری لە سـوننەت و ڕددانەوەی بیـدعەکاران کـارێکی هەڵە و ناپەسەندە.

بـۆیە کـورتەی مەبەسـتەکە ئەوەیە بە بیـانووی بەرگـری کـردن لە ئیسـلام و دەرخستنی ڕووی حەق لەگەڵ هیچ بـێ باوەڕێـك یـان بیـدعەکارێك دانەنیشـیت و مشتومڕی لەگەڵ نەکەیت، چیت پێ دەکرێت بۆ دیـنەکەت لە ڕۆشـنایی بەڵگەکـانی کیتاب و سوننەت و ڕێنموونی زانا گەورەو شـایەتی بـۆ دراوەکـانی سـەلەف وەکـو پێشەوا أحمد و پێشەوایانی تر ئەنجامی بدە و بـێ ئەوەی کاتـت لەگەڵیانـدا بەزایە بدەیت و خۆیشت و خەڵکانێکی تریش تووشی فیتنە بکەیت. زانایانیش لە کـۆنەوە فەرموویانە: (الشبه خطافة) واتە شوبهەو گومانەکـان بـێ ئەوەی بە خـۆت بزانیـت کارت تێدەکەن وعەقڵت دەڕفێنن.

# قورئان کەلامی الله یەو مەخلوق نییە

**وَالْقُرْآنُ كَلَامُ اَللَّهِ وَلَيْسَ بِمَخْلُوقٍ وَلَا يَضْعُفُ أَنْ يَقُولَ :لَيْسَ بِمَخْلُوقٍ، فَإِنَّ كَلَامَ اَللَّهِ لَيْسَ بِبَائِنٍ مِنْهُ، وَلَيْسَ مِنْهُ شَيْءٌ مَخْلُوقٌ، وَإِيَّاكَ وَمُنَاظَرَةَ مَنْ أَحْدَثَ فِيهِ، وَمَنْ قَالَ بِاللَّفْظِ وَغَيْرِهِ، وَمَنْ وَقَفَ فِيهِ، فَقَالَ :لَا أَدْرِي مَخْلُوقٌ أَوْ لَيْسَ بِمَخْلُوقٍ، وَإِنَّمَا هُوَ كَلَامُ اَللَّهِ فَهَذَا صَاحِبُ بِدْعَةٍ مِثْلُ مَنْ قَالَ ) :هُوَ مَخْلُوقٌ .( وَإِنَّمَا هُوَ كَلَامُ اَللَّهِ لَيْسَ بِمَخْلُوقٍ.**

ئەهلی سوننەت و جەماعەت باوەڕیان وایە قورئان کەلامی اللە یە و درووستکراو و مەخلوق نییە، باوەڕیان وایە اللە تعالی کەی وچۆن وبەچی بیەوێت قسە دەکات بە شێوەیەکی ڕاستەقینە بە دەنگ و بە پیت بەڵام جیاواز لە دەنگ و شێوازی قسەکردنی مرۆڤەکان.

بەڵگەی ئەهلی سوننەت لەسەر ئەوەی کە قورئان کەلامی پەروەردگارە و مەخلوق نییە ئەوەیە کە الله تعالی لە قورئانی پیرۆزدا کەلامی داوەتە پاڵ خۆی و فەرموویەتی :(وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا) النساء .١٦٤: بەڵگەی تریش زۆرە لەسەر ئەم مەسەلە، وەکو ئایەتی :(وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ) التوبة .٦:بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قورئان لەسەر حەقیقەت کەلامی الله یە نەك دروستکراوێك بێت لە درووستکراوەکانی، وەکو موعتەزیلە و هەندێ لە تاقمە گومڕاکانی تر باوەڕیان وایە.

ئەهلی سوننەت بە وردی و بەبەڵگەی زانستی لە کیتاب و سوننەت بەرپەرچی موعتەزیلەیـان داوەتەوە وسـەلماندوویانە کە قورئـان کەلامـی پەروەردگـارە و بەرپەرچـی ئەوانەشـیان داوەتەوە کە دەڵـێن لەو مەسـەلە ڕادەوەسـتین وهـیچ قسەیەك ناکەین چونکە نازانین قورئان مەخلوقە یان مەخلوق نییە .

کەلام سیفەتێکە لە سیفەتەکانی الله تعالی ئەهلی سوننەت بـۆ پەروەردگاریـان جێگیـری دەکەن، بەڵام لە مەسـەلەی شـێوازەکەیدا ڕادەوەسـتن و دەڵـێن ئـێمە نازانین بە چ شێوە و کەیفییەتێك قسە دەکات و زانسـتی ئەوە لەلای اللـه تعـالی خۆیەتی، بەڵام سیفەتی کەلامی بۆ جێگیر دەکەین و قورئـانیش مەخلـوق نیـیە و لەسەر حەقیقەت کەلامی پەروەردگارە.

لێرەشدا پرسیارێك درووست دەبێت : لە ڕووی عەقیدەو بیروباوەڕەوە کێشـەی چییە ئەگەر کەسێك باوەڕی وابێت قورئان مەخلوقێکە وەکو مەخلوقەکـانی تـری الله و کەلامی ئەو نییە لەسەر حەقـیقەت، لە ڕاسـتیدا ئەو بیروبـاوەڕە نـاکۆکە لە گەڵ کیتـاب و سـوننەت و لادانێکـی گەورەیە لە بنەماکـانی بیروبـاوەڕی ئەهلـی سوننەت و جەماعەت.

عەقیدەی خەلقـی قورئـان لەگەڵ قورئـان و سـوننەت و یەکـدەنگی زانایـانی سەلەفدا بەڕاستەوخۆ تێکدەگیرێت، ئەوەش جـۆرێکە لە تێکـدان و شـێواندن بـۆ باسەکانی عەقیدە، الله تعالی فەرموویەتی :(وَمَنْ يُشَاقِقِ الرَّسُـولَ مِـنْ بَعْـدِ مَـا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَـاءَتْ مَصِيراً ) النساء: ١١٥.

کەلام سیفەتێکە لە سیفەتەکانی الله تعالی، بۆیە هەرکێ بلێت قورئان مەخلوق و درووستکراوە ئەوە وتوویەتی سیفەتێکی الله تعالی مەخلوق و درووستکراوەو ئەوەش کوفرە.

ئەگەر قورئان مەخلوق بێت ئەوا سیفەتێکی جێگیری الله تعالی پەك دەخرێت و سیفەتی قسەکردن لە الله تعالی لادەبرێت، ئەوەش بۆ خۆی تۆمەتبار کردنە بۆ الله کە توانای قسەکردنی نییە و دەبێتە ئیلحاد لە ناوو سیفەتەکانیدا.

نکۆڵی کردن لەوەی کە قورئان کەلامی اللە بێت نکۆڵی کردنە لەوەی اللە شەریعەت و کیتابی بۆ پێغەمبەران دابەزاندبێت. لە ڕێگەی جیبریلەوە علیە السلام.

عەقیدەی خەلقی قورئان بە درۆدانانی زۆر ئایەتی قورئان لە خۆ دەگرێت کە الله تعالی بە ڕاشکاوی سیفەتی کەلامی بۆ خۆی باسکردووە، وەکو :(وَرُسُلاً قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِنْ قَبْلُ وَرُسُلاً لَمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيماً) النساء .١٦٤:و (إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا (آل عمران .٥٥) : (سَيَقُولُ الْمُخَلَّفُونَ إِذَا انْطَلَقْتُمْ إِلَى مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ يُرِيدُونَ أَنْ يُبَدِّلُوا كَلامَ اللَّهِ قُلْ لَنْ تَتَّبِعُونَا كَذَلِكُمْ قَالَ اللَّهُ مِنْ قَبْلُ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا بَلْ كَانُوا لا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلاً) الفتح:١٥.

بیروباوەڕی خەلقی قورئان ئەوە دەگەیەنێت کە الله تعالی بۆ ئەوەی دینەکەیان پێ بگەیەنێت و بۆمانی ڕوون بکاتەوە پێویستی بە مەخلوق هەیە و ئەوەش بەواتای ئەوە دێت کە الله تعالی پێویستی هەیە و کەموکورتی هەیە کە ئەوەش بێگومان کوفرو لادانە لە عەقیدەی ئیسلامی.

پێشەوا أحمد بن حنبل فەرموویەتی :(وَلَا يَضْعُفُ أَنْ يَقُولَ :لَيْسَ بِمَخْلُوقٍ) واتە لە مەسەلەی ڕەتکردنەوەی بیرۆکەی خەلقی قورئاندا لاواز مەبە و بە عەقیدەو بیروباوەڕێکی بەهێزەوە ڕەتیبکەرەوە و رایبگەیەنە و لەو مەسەلەدا وبەڕاشکاوی ڕووبەڕووی ئەهلی بیدەع ببەرەوە و ئەو عەقیدە ڕاستەیان پی ڕابەگەیەنە.

(فَإِنَّ كَلَامَ اَللَّهِ لَيْسَ بِبَائِنٍ مِنْهُ، وَلَيْسَ مِنْهُ شَيْءٌ مَخْلُوقٌ)واتە کەلامی اللە جیاواز نییە و لە الله تعالی جیا نابێتەوە بچێت بۆ کەسێکی تر.

ئەوەش کە الله تعالی فەرموویەتی:(اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ ) الزمر .٦٢:مەعنای ئەوەیە کە الله عزوجل بە زات و سیفاتی خۆی خالقی هەموو شتێکە و کەلامیش یەکێکە لە سیفەتەکانی وهەمیشە هەیبووەو لێی جیا نابێتەوە.

ئەشاعیرە لەم مەسەلەدا عەقیدەیان ناجێگیر و ناڕوونە، وەکو هەندێ لە ڕاڤەکەرانی( أصول السنة ) دەڵێن :نیوەی عەقیدەکەیان وەکو ئەهلی سوننەت و نیوەکەی تری وەکو عەقیدەی موعتەزیلەیە، چونکە دەڵێن :لەفز و وشەکانی قورئان درووست کراوەو واتاو مەعناکانی لە الله خۆیەتی و درووست کراو نییە.

ئەوان دەڵێن کەلام واتایەکی جێگیرە لەناو دەروونـدا پەیوەنـدی بە پیـت و وشـەو دەنـگەوە نیـیە ئەوەیـان مەسـەلەیەکی تـرە، یەکێـك لە بەڵگەکانیشـان دێڕێکی شیعری (الأخطل)[1] دەهێننەوە کە وتوویەتی:

إن الكلامَ لفي الفؤادِ وإنما * * * جُعل اللسانُ على الفؤادِ دليلا

واتە قسە وئاخاوتن خـۆی لە بنچیـنەدا لە نـاو دڵ ودەروونـدایە، بەڵام زمـان تەنها ئەوەیە ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە لەناو دڵ و دەرووندا هەیە.

ئەم دێڕە شیعرەش ئەگەرچی دەدرێتە پـاڵ ئەو شـاعیرە، بەڵام هـۆنراوەیەکی درووست کراوەو سەنەدێکی زانستی نییە [2].خۆ ئەگەر ڕاستیش بێت قسەی ئەو شاعیرە نە ئایەتە و نە فەرموودەیە، دەشکرێت بڵـێن مەعنـای ئەوەیە ئەو قسـەی کە مـرۆڤ دەیکـات پێشـتر لەنـاو دڵ و دەروونـی خۆیـدا ئامـادەی دەیکات و ئینجا لە ڕێگەی زمانەوە دەریدەبڕێت، نەك مەعنای ئەوە بێت لەفز و وشە و دەنگ شتێکی جیاوازە لە قسە کردن!

(١) شاعیری بەناو بانگی سەردەمی خۆی بووە، ناوی غياث بن غوث التغلبي النصراني یە، گاور بووە و لەسەر ئایینی نەساڕاکان بووە، سەیر ئەوەیە جەهمییەکانیش بە دێڕە شیعرێکی ئەو بەڵگە ئەهێننەوە کە وشەی (استواء) لە قورئاندا مەعنای دانیشتن نییە، کە وتوویەتی: قد استوى بشر على العراق *** من غير سيف ودم مهراق. بۆ ژیاننامەکەی الأخطل بڕوانە: سير أعلام النبلاء. ٥٨٩/٤.

(٢) جێگیر نەبووە کە الأخطل بەیتی لەو شێوەی هەبێت و لە دیوانەکەشیدا بونی نییە، بڕوانە: دروس في العقيدة ، عبدالعزيزالراجحي - الاستدلال ببيت الأخطل النصراني ونقضه، لاپەڕە ٢٥.

بۆیە ئەشاعیرە لەم مەسەلەدا دەڵێن کەلام سیفەتێکی جێگیرە لە نەفسی اللـه و کەلامی ئەو بە وشەو بە لەفز و بەدەنگ نەبووە، بەو بەهـانەی کە دەنـگ وپیـت (حادث) وڕووداون و الله نابێت ڕووداوی لێ بوەشێتەوە، بۆیە هەڵسان داهینـان و درووستکردنی مەسەلەی (الكلام النفسي) و وتیان کەلامی اللـه مەسـەلەیەکی تایبەتە لەناو نەفسی الله بوونی هەیە و جێگیرە ومەعناکەی بۆ جیبریل ناردووە و ئەویش لێی تێگەیشتووە و لای خۆیەوە بە وشە ودەربڕینی خـۆی گەیانـدوویەتی بە پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم .بە پێی ئەو بیروباوەڕەش بێـت ئەمەی کە نـاو موسحەفەکاندا هەیە کەلامی الله نییە جگە لە مەعناکەی نەبێت.

شێخ الاسلام لە العقیدة الواسطیةدا دەفەرموێـت :قورئـان کەلامـی اللـه یە بە پیت و بە واتاکانییەوە، نەك ئەوەی کەلامی الله پیتەکان بێت بەبێ واتاکـان، یـان واتاکانی بێت بەبێ پیتەکان، ئەوە عەقیدەی موعتەزیلەو ئەشاعیرەیە، بەڵام ئەهلی سوننەت دەڵێن قورئان بە پیت و بە واتاکانییەوە کەلامی الله یە.

ئینجا پێشەوا أحمد دەفەرموێت: (وَإِيَّاكَ وَمُنَاظَرَةَ مَـنْ أَحْـدَل فِيـهِ، وَمَـنْ قَـالَ بِاللَّفْظِ وَغَيْرِهِ )واتە نەکەیت و خۆت لە مونازەرە کردن و مشـتومڕ کـردن بپـارێزە لەگەڵ ئەهلی بیدەع لەوانەی کە دەڵێن قورئان مەخلـوقە یـان دەڵـێن لەفـزەکەی مەخلوقە، تەنها ئەوەیان پێی ڕابگەینە کە قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نییە.

هەروەها دەڵێت:**(وَمَنْ وَقَفَ فِيهِ، فَقَالَ :لَا أَدْرِي مَخْلُوقٌ أَوْ لَيْسَ بِمَخْلُوقٍ، وَإِنَّمَا هُوَ كَلَامُ اَللَّهِ فَهَذَا صَاحِبُ بِدْعَةٍ مِثْلُ مَنْ قَالَ ) :هُوَ مَخْلُوقٌ .( وَإِنَّمَا هُوَ كَلَامُ اَللَّهِ لَيْسَ بِمَخْلُوقٍ)** واتە : ئەو کەسەش کە دەڵێت من لە مەسەلەی خەلقی قورئاندا قسە ناکەم و ڕادەوەستم، نازانم قورئان مەخلوقە یان مەخلوق نییە، پێشەوا أحمد دەڵێت ئەو کەسەش هەر ئەهلی بیدەعە و حاڵی وەکو حاڵی ئەو کەسەیە کە نکۆڵی لەوە دەکات قورئان کەلامی اللە بێت لەسەر حەقیقەت.

پوختەی ئەم بابەتە ئەوەیە:

ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەڵێن :قورئان مەخلوق نییە و کەلامی اللە عزوجل ە بە لەفزو بە بەمەعنایەوە، کە ئەمەش ئەو حەقەیە کە کیتاب و سوننەت و زانایانی سەلەف شایەتی بۆ دەدەن.

بەڵام تاقمە لادەرەکان تێگەیشتنی جیاوازیان لەو مەسەلەدا هەیە:

موعتەزیلە دەڵێن قورئان هەمووی مەخلوقە، نە لەفزی و نە مەعنای لەلای اللە تعالی نەهاتووە بەڵکو وەکو هەر درووست کراوێکی تر درووستی کردووەو دایبەزاندووە.

ئەشاعیرە دەڵێن نەخێر تەنها لەفزو وشەکانی مەخلوقە و مەعناکەی مەخلوق نییە و لەلایەن اللە خۆیەتی.

هەندێکی تریش وەکو أبو المعالي الجويني دەڵێن وشەی کلام لە بنچینەدا لەفزو وشەکان دەگرێتەوە نەك مەعناکان، کە بێگومان ئەمانەش هەر لە موبتەدیعە

دەژمێردرێن، هەندێکیش هەن خاوەنی دەربڕینی (لفظي بالقرآن مخلوق)ن و پێیان دەوترێت (اللفظية) ئەوانەش هەر موبتەدیعن، ئەوانەش کە پێیاندەوترێت (الواقفية)کە دەڵێن ئێمە ڕادەوستین هیچ قسە لەم مەسەلەیە ناکەین، نازانین قورئان مەخلوقە یان مەخلوق نییە اللە خۆی باشتر دەزانێت ئەوانەش هەر موبتەدیعەو لادەرن.

تێبینی :بەمەبەست نەمویست بچمە ناو هەندێ وردەکاری و تفصیلات کە لە کتێبەکانی عەقیدەدا باس کراون چونکە هەر ئەوەندە بەسە بۆ موسوڵمان کە بزانێت قورئان کەلامی پەروەردگارە و مەخلوق نییە و ئەوانەی ئەو بیروباوەڕەیان هەیە لە عەقیدەی ئیسلامی لەو مەسەلەدا لایان داوە.(١)

(١) پرسیار: ابو حنیفە دەڵێ قورئان مخلوقە ؟

وەڵام: قسە وباسێکی زۆری لەسەر هاتووە ئەو مەسەلە، پوختەکەی ئەوەیە بەلێ وای وتووە بەڵام وا دەرەکەوێت تەوبەی لەو قسەیەی کردووە و داواتر قەناعەتی وابووە کێ بڵێ قورئان مەخلوقە لە ئیسلام دەردەچێت.

# باوەڕهێنان بە بینینی الله لە ڕۆژی قیامەتدا

پێشەوا أحمد لە (أصول السنة)کەیدا فەرموویەتی :**(وَالْإِيمَانُ بِالرُّؤْيَةِ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ كَمَا رُوِيَ عَنْ اَلنَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم مِنْ اَلْأَحَادِيثِ اَلصِّحَاحِ، وَأَنَّ اَلنَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم قَدْ رَأَى رَبَّهُ، فَإِنَّهُ مَأْثُورٌ عَنْ رَسُولِ اَللَّهِ صلى الله عليه وسلم ، صَحِيحٌ، رَوَاهُ قَتَادَةُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ ; وَرَوَاهُ اَلْحَكَمُ بْنُ أَبَانٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ ; وَرَوَاهُ عَلِيُّ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ يُوسُفَ بْنِ مِهْرَانَ، عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ، وَالْحَدِيثُ عِنْدَنَا عَلَى ظَاهِرِهِ كَمَا جَاءَ عَنْ اَلنَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم ، وَالْكَلَامُ فِيهِ بِدْعَةٌ، وَلَكِنْ نُؤْمِنُ بِهِ كَمَا جَاءَ عَلَى ظَاهِرِهِ، وَلَا نُنَاظِرُ فِيهِ أَحَدًا).**

(وَالْإِيمَانُ بِالرُّؤْيَةِ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ كَمَا رُوِيَ عَنْ اَلنَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم مِنْ اَلْأَحَادِيثِ اَلصِّحَاحِ)واتە :باوەڕهێنان بە بینینی اللە تعالی لە ڕۆژی قیامەتدا ئەویش بەشێکە لە بیروباوەڕ و عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، ئەم مەسەلەش پێشتر باسمان کرد و وتمان بەڵگەکانی کیتاب و سوننەت لەسەر ئەو بابەتە کۆکن و بەشێکمان لە ئایەت و فەرموودەکان لەو بارەوە خستەڕوو.

**(وَأَنَّ اَلنَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم قَدْ رَأَى رَبَّهُ، فَإِنَّهُ مَأْثُورٌ عَنْ رَسُولِ اَللَّهِ صلى الله عليه وسلم، صَحِيحٌ، رَوَاهُ قَتَادَةُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ ; وَرَوَاهُ اَلْحَكَمُ بْنُ أَبَانٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ ; وَرَوَاهُ عَلِيُّ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ يُوسُفَ بْنِ مِهْرَانَ، عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ، وَالْحَدِيثُ عِنْدَنَا عَلَى ظَاهِرِهِ كَمَا جَاءَ عَنْ اَلنَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم )** لێرەدا پێشەوا أحمد باس لە بینینی پێغەمبەر صلی اللە علیە و سلم

دەکات بۆ پەروەرگاری، بێ ئەوەی دیاری بکات بینینەکە چۆن بووە، بەچاوی سەر بووە یان بە چاوی دڵ.

مەسەلەی بینیی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بۆ پەروەردگاری ئەوە بابەتێکی خیلافییە و کۆدەنگی سەلەفی لەسەر درووست نەبووە، لە فەرموودەکەی مەسروق دا هاتووە بە دایکمان عائیشەی وتووە الله لێی ڕازی بێت، ئەی دایکە عائیشە ! ئایا پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم پەروەردگاری خۆی بینیوە؟ ئەویش فەرموویەتی :(لَقَدْ قَفَّ شَعَرِي مِمَّا قُلْتَ، أَيْنَ أَنْتَ مِن ثَلَاثٍ مَن حَدَّثَكَهُنَّ فقَدْ كَذَبَ :مَن حَدَّثَكَ أنَّ مُحَمَّدًا صلَّى اللهُ عليه وسلَّم رَأَى رَبَّهُ فقَدْ كَذَبَ، ثُمَّ قَرَأَتْ : {لَا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ] [الأنعام ١٠٣] :، {وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَنْ يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ] {الشورى : ٥١.] { ومَن حَدَّثَكَ أنَّه يَعْلَمُ ما في غَدٍ فقَدْ كَذَبَ، ثُمَّ قَرَأَتْ} :[وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا] {لقمان:٣٤ ]. [ومَن حَدَّثَكَ أنَّه كَتَمَ فقَدْ كَذَبَ، ثُمَّ قَرَأَتْ}: [يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ] {المائدة: ٦٧}الآيَةَ، ولَكِنَّهُ رَأَى جِبْرِيلَ عليه السَّلَامُ في صُورَتِهِ مَرَّتَيْنِ) .[١]واتە خەریکە لە ترسی ئەو قسەتدا قژم ڕادەوەستێت و فەرموویەتی هەرکێ وتوویەتی پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم

(١) صحيح البخاري: (٤٨٥٥).

پەروەردگاری خۆی بینیوە ئەوا درۆی کردووەو ئینجا ئایەتەکەی بۆ خوێندووەتەوە.

بەڵگەی تریش لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم لە شەوی میعراجدا پەروەردگاری خۆی نەبینیوە بەڵکو بەچاوی دڵی بینیوێتی .أبو ذر الله لێی ڕازی بێت دەفەرموێت پرسیارم لە پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم کرد ئایا پەروەردگاری خۆتت بینی؟ ئەویش فەرمووی :(نور أنى أراه) [1]لە ڕیوایەتێکی تردا فەرموویەتی ڕووناکییەکم بینی .هەر لە صحیح ی مسلم دا هاتووە ( أن النبي صلى الله عليه و سلم رأى ربه رؤية قلبية) واتە پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم بە دڵی پەروەردگاری بینیوە نەك بە چاوی، بەمەش زانایان وەڵامی ئەو ڕیوایەتەی ابن عباس یان داوەتەوە الله لێی ڕازی بێت کە پێشەوا أحمد پشتی پێ بەستووە و فەرموویانە مەبەست لە بینینی دڵە نەك بینینی چاو.

بۆیە وتەکەی ئیمام ئەحمەد و ابن عباس یش الله لێی ڕازی بێت وەکو ابن تیمیة دەفەرمویت دەکرێت بە ڕەهایی وەرنەگیرێت و بڵێین مەبەستیان بینینی دڵ بووە نەك بینینی چاو، چونکە نە لە کیتاب و نە لە سوننەتدا وارد نەبووە کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پەروەردگاری خۆی لە شەوی میعراجدا بە چاوی سەری بینیبێت، بەڵکو وەکو لە سوڕەتی (النجم) یشدا ئاماژەی پێکراوە دوو جار پەروەردگاری خۆی بەدڵی بینیوە:(وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ) النجم.١٣:

---

(١) صحیح مسلم: (١٧٦).

بەڵگەش لەسەر ئەوەی الله تعالى لە دونیادا لەلایەن هیچ کەسێکەوە نابینرێت ئەوەیە کاتێك موسى علیە السلام داوای کرد پەروەردگاری ببینێت،(ربِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ) الله پێی فەرمووە تۆ ناتوانیت من ببینیت :(قَالَ لَن تَرَانِي وَلَٰكِنِ انظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي ۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا) الأعراف .١٤٣:جا ئەگەر چیاکان بەرگەی بینینی الله نەگرن ئەوا مرۆڤ بەو لاوازییەوە ناتوانێت بەرگەی بینینی پەروەردگاری بگرێت . بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا الله تعالى هێزێکی وا بە ئیمانداران دەبەخشێت کە بتوانن سەیری پەروەردگاریان بکەن.

ئەوانەی نکۆڵییان لە بینینی الله کردووە لە ڕۆژی قیامەتدا موعتەزیلەو جەهمییەکانن، ئەم دوو تاقمە هەموو دەقەکانی بینینیان تەئویل کردووە و لەسەر زاهیرو حەقیقەتەکەی لایان بردووە .ئەشاعیرەش وەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد باوەڕیان بە بینینی الله لە ڕۆژی قیامەتدا هەیە بەڵام باوەڕیان بە جێگیر کردنی جیهەت نییە !

بینینی پەروەرگار لە ڕۆژی قیامەتدا لە چەندین ئایەت و زیاد لە سی لە هاوەڵانەوە گێڕدراوەتەوە وهیچ بوارێکی بۆ گومان تێدا نییە و هەرکێیش باوەڕو عەقیدەی بە بینینی الله نەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوە زۆر ئایەت و فەرموودەی صحیح ی ڕەتکردووەتەوە.

له ڕاستیدا مەسەلەی بینینی الله عزوجل له ڕۆژی قیامەتدا و بینینی له دونیادا له لایەن پێغەمبەرەوە صلی الله علیه و سلم به چاوی دڵی یەکێکه له باسه مەزنەکانی عەقیدە و یەکێکه له جیاکەرەوەکانی نێوان ئەهلی سوننەت و نەیارەکانیان له ئەهلی بیدەع، ئەوەش که تاقمەکان ئەمەیان کردووەته بەهانەی ئەوەی که ئەهلی سوننەت لەناو خۆیاندا له مەسەلەکانی بیروباوەڕدا خیلافیان له نێواندا هەیە، له ڕاستیدا وا نییە و ئەوەی بینینی پێغەمبەری صلی الله علیه و سلم بۆ پەروەردگاری له شەوی میعراجدا جێگیر کردووە لەسەر ئەوە هەڵدەگیرێت که مەبەستی ئەوە بووە که بەچاوی دڵی بینیوێتی نەك بەچاوی سەری.

**(وَالْحَدِيثُ عِنْدَنَا عَلَى ظَاهِرِهِ كَمَا جَاءَ عَنْ اَلنَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم)** لەمەدا هەندێك له قسەکەی پێشەوا أحمد وا تێدەگەن که مەبەستی بینینی چاوی سەر بووە، بەلام دەکرێت بەو شێوە تەفسیر بکرێت که مەبەستی بینینی چاوی دڵ بووە وەکو چۆن فەرمودەکەی ابن عباس یش که ئاماژەی پێ دەکات بەهەمان تەفسیر تەفسیر بکرێت.

**(وَالْكَلَامُ فِيهِ بِدْعَةٌ، وَلَكِنْ نُؤْمِنُ بِهِ كَمَا جَاءَ عَلَى ظَاهِرِهِ، وَلَا نُنَاظِرُ فِيهِ أَحَدًا)** شیکردنەوەی ئەم مەسەلەو زۆر قسە کردن لەسەری و تاوتوێ کردنی بیدعەیە، چونکه هاوەڵان وایان نەکردووە، بۆیە هەر ئەوەندە بەسە که باوەڕمان هەبێت که ئیمانداران له ڕۆژی قیامەتدا پەروەردگاریان دەبینن و له دونیادا کەس ناتوانێت الله ببینێت، هەموو ئەو فەموودە و شوێنەوارانەش دەربارەی ئەوە هاتوون که

پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم لە شەوی میعراجدا پەروەردگـاری خـۆی بینیـوە لەسەر ئەو تێگەیشتنە وەردەگیرێت کە مەبەست پێی بینینی چاوی دڵە و مەبەست بینینی چاوی سەر نییە، چونکە بەڵگەکان لەسەر ئەوە لە قورئان و لە سوننەتیشدا زۆرن.

لە کۆتایی ئەم باسەدا پێشەوا ئەحمەد فەرموویەتی :(**وَلَا نُنَاظِرُ فِيهِ أَحَدًا**) واتە مشت ومڕو مجادەلەشی لەسەر ناکەین، لە سەرەتاشەوە جەختـی لەسـەر خراپـی مشتومڕ و موجادەلە کردەوە و لێرەشدا جارێکی تر جەختی لەسەر دەکاتەوە.

# باوەڕهێنان بە تەرازوو لە ڕۆژی قیامەتدا

**وَالْإِيمَانُ بِالْمِيزَانِ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ كَمَا جَاءَ، يُوزَنُ اَلْعَبْدُ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ فَلَا يَزِنُ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ، وَتُوزَنُ أَعْمَالُ اَلْعِبَادِ كَمَا جَاءَ فِي اَلْأَثَرِ، وَالْإِيمَانُ بِهِ، وَالتَّصْدِيقُ بِهِ، وَالْإِعْرَاضُ. عَمَّنْ رَدَّ ذَلِكَ، وَتَرْكُ مُجَادَلَتِهِ.**

ئەم مەسەلەش یەکێکە لە بنچینەکانی عەقیدەی ئەهلی سوننەت کە پێشەاو أحمد لێرەدا جێگیری کردووە، ئەویش مەسەلەی باوەڕبوونە بە تەرازوو ومیزان لە ڕۆژی قیامەتدا.

ئەهلی سوننەت یەکدەنگن و باوەڕیان بە تەرازووی ڕۆژی قیامەت هەیە کەوا تەروازوویەکی راستەقینەیە ودوو تای هەیە و کردەوەی مرۆڤەکانی پێ دەکێشرێت.

یەکێك لە بنەما و بنچینەکانی سوننەت ئەوەیە کە موسوڵمان باوەڕی بە میزانی ڕۆژی قیامەت هەبێت کە کرەوەکانی پێ ەکێشرێت، بەڵگەی ئەمەش لە زۆر ئایەت و فەرموەدا هاتووە، [1]وەکو :{وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا } الأنبياء الآية ،

(١) بۆ زانیاری زیارت بڕوانە:(شرح الطحاوية) ابن أبي العز (٢/ ٦٠٩)، (لوامع الأنوار البهية) السفاريني (٢/ ١٨٤).

﴿وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَظْلِمُونَ۝٩﴾ سورة الأعراف.

هەروەها لە فەرموەشدا هاتووە کە ئەو میزانە تەرازوویەکی هەست پێکراوی ڕاستەقینەیە و واتایی نییە، پێغەمبەر صلى الله علیه و سلم فەرموویەتی : (کلمتان خفیفتان علی اللسان، ثقیلتان في المیزان، حبیبتان إلی الرحمن :سبحان الله العظیم، سبحان الله وبحمده.[1]

-لە فەرموودەیەکی تریشدا هاتووە: (والحمد لله تملأ الميزان)[2]

هەروەها لە فەرموودەی (البطاقة)[3] هاتووە کەسێك لە ڕۆژی قیامەتدا پەڕاوگەی کارە خراپەکانی پێ نیشان دەدرێت کە نەوەد و نۆ پەڕاوگەیە ودەخرێتە تایەکی تەرازووکە و شایەتمانەکەشی دەخرێتە تایەکی تری و قورستر دەبێت.

کردەوەکان ئەگەرچی تەنی هەست پێکراو نین وشتی واتایین لەلای ئێمەی مرۆڤ ناکێشرێت، بەڵام وەکو موسوڵمان باوەڕمان بەوە هەیە کردەوەکان دەکێشرێن لە ڕۆژی قیامەتدا و الله تعالی تواناو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

بەڵکو بەڵگەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە خاوەن کردەوەکان خۆیشیان دەکێشرێن، وەکو ئەو فەرموودەی لە بوخاری وموسلیمدا هاتووە :(إِنَّه لَيَأْتي الرَّجُلُ العَظِيمُ السَّمِينُ يَومَ القِيامَةِ، لا يَزِنُ عِنْدَ اللهِ جَناحَ بَعُوضَةٍ، اقْرَؤُوا {فَلا

(١) البخاري(٦٦٨٢). مسلم: (٢٦٩٤).

(٢) مسلم (٢٢٣)

(٣) أحمد: (٢/٢١٣)والترمذي (٢٦٣٩).

نُقِيمُ لهمْ يَومَ القِيامَةِ وزْنًا})[1] واته له ڕۆژی قیامەتدا کەسی چوارشانەو قەڵەو دێت بەڵام کێشی باڵە مێشوولەیەکی نییە.

هەروەها له فەرموودەیەکی تردا له أبو داود (٣٥٤) أحمد (٤٢٠/١) هاتووە که جارێکیان هاوەڵان له باریکی و لاوازی قاچی عبدالله بن مسعو پێدەکەن الله لێیان ڕازی بێت، پێغەمبەریش صلی الله علیه و سلم دەفەرموێت :( والذي نفسي بيده لهما أثقل في الميزان من أحد).

تاقمی موعتەزیله نکۆڵییان لەوە کردووە ئەو میزانه تەرازوویەکی ڕاستەقینه بێت بەڵکو وتوویانه ئەوە مەسەلەیەکی واتاییه دەربڕین له داگەری پەروەردگار دەکات، بەڵام دەقەکانی قورئان و سوننەت پێچەوانەی ئەم بۆچوونەن.

شێخ محمد بن عبد الوهاب بەڕەحمەت بێت له بابی (فضل التوحيد وما يكفر به من الذنوب) کاتێك باسی سوودەکانی فەرموودەکەی أبو سعید دەکات الله لێی ڕازی بێت( لو أن السموات السبع والأرضين السبع في كفة، ولا إله إلا الله في كفة)كتاب التوحيد:٩. ئەوەی لێ هەڵێنجاوە که تەرازووکه دوو تای هەیە، چونکه هەڵسەنگاندن له نێوان چاکه و خراپەکادا دەکات.

کێشانه کردنی کردەوەکانی له ڕاستیدا تایبەته به موسوڵمانانەوە، ئەگینا بێ باوەڕ و کافرەکان وەکو ابن تيمية له( العقيدة الواسطية ) دا دەڵێت ئەوان بەو شێوە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا ناکرێت، چونکه ئەوان له بنچینەوە چاکەیان نییە،

(١) صحيح مسلم (٢٧٨٥).

تەنها کردەوەکانیان ئەژمار دەکرێت بۆ یان و دەخرێتە بەرچاویـان و دانپێـدانیان لێ وەرەگیرێت لەسەری پاداشت دەدرێنەوە.

**(وَالْإِيمَانُ بِهِ، وَالتَّصْدِيقُ بِهِ، وَالْإِعْرَاضُ عَمَّنْ رَدَّ ذَلِكَ، وَتَرْكُ مُجَادَلَتِـهِ.)** واتە پێویستە موسوڵمان باوەڕی بە میزان هەبێـت و ئـاوڕ لە ئەوانە نەداتەوە کە دەڵـێن ئەوە تەرازوویەکی ڕاستەقینە نییە و واتاییە، مەبەستی لەو کەسانەش موعتەزیلەیە کە ئەوان لەبەر ئەوەی لە هەمـوو شـتێکدا بـۆ عەقـڵ و تێگەیشـتنی خۆیـان دەگەڕێنەوەو زاڵی دەکەنە سەر دەقەکاندا، بـۆیە باوەڕیـان بەوە نیـیە کە میزانێـك هەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا کردەوەکانی پێ بکێشرێت و ڕەتـی دەکەنەوە، جـارێکی تریش لێرەدا پێشەوا أحمد وەکو پێشتریش لە چەندین جێگەی تردا ئامۆژگاریان دەکات لەگەڵ ئەهلی بیدەعدا مشت ومڕو موجادەلە نەکەین و وەڵامیان نەدینەوە، تەنها حەق دەخەینەڕوو و تەواو.

# الله لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ بەندەکانیدا قسە دەکات

لەدوای باسکردنی بنەمای باوەڕهێنان بە تەرازوو لە ڕۆژی قیامەتـدا، پێشـەوا أحمد بن حنبل بنەمایەکی تری ئەهلی سوننەت دەخاتەڕوو و دەڵێت:

(وَأَنَّ اَللَّهَ يُكَلِّمُ اَلْعِبَادَ يَـوْمَ اَلْقِيَامَـةِ لَـيْسَ بَيْـنَهُمْ وَبَيْنَـهُ تُـرْجُمَانٌ، وَالإِيمَـانُ بِـهِ وَالتَّصْدِيقُ بِهِ.) واتە :یەکێکی تـر لە بنچینەکـانی ئەهلـی سـوننەت و جەمـاعەت ئەوەیە کە اللـە عزوجـل لە ڕۆژی قیامەتـدا بە دەنـگ و بە پیـت، قسـە لەگەڵ بەندەکانیـدا دەکـات، بـێ ئەوەی وەرگێڕێـك هەبێـت لە نێوانیانـدا ئەو بەنـدە تێبگەیەنێت، بەڵکو بەنە خۆی بەئاسانی لە ئاخاوتنی پەروەرگاری تێدەگات.

نکۆڵی کردن لە قسە کردنی الله تعالی - وەکو ابن عبد الله بن جبرین دەڵێت -یەکێکە لە کۆنترین ئەو بیدعانەی تاقمەگومڕاکان دایانهێنـاوە ، بـۆیە پیشـینانی چاکی ئەم ئوممەتە زۆر بە شیکراوەیی لەسـەر مەسـەلەی ئاخـاوتنی اللـە تعـالی ڕۆیشـتوون و بەرپەرچـی تـاقمە گومڕاکـانی وەکـو جەهمییەکانیـان داوەتەوە و وتوویانە الله گوفتاری هەیە وکەی بیەوێت قسـە دەکـات وهەرکێـیش کە خـۆی ویستی لەسەر بێت، گوێبیستنی گوفتارەکانی دەبێت.

هەروەها ئەوەشیان ڕوون کردووەتەوە کە سیفەتی کەلام واتە ئاخـاوتن وقسـە کرن، سیفەتێکی مەدح و ستایشە و نکۆڵی کـردن لەو سـیفەتە دەبێـتە سـیفەتێکی کەموکورتی وعەیـبەیە دەدرێـتە پـاڵ اللـە عزوجـل، وەکـو چـۆن پەروەردگـار لە سوڕەتی الأعراف دا بە بەنی ئیسڕائیلی فەرمووە :(أَلَـمْ يَـرَوْا أَنَّـهُ لَا يُكَـلِّمُهُـمْ)

الأعراف .١٤٨:واته :ئایا هەست بەوە ناکەن و نایبینن کە ئەو پەرستراوەیان توانای قسەکردنی نییە و الله عزوجل ئەوەی بە عەیب و کەمییەك ژماردووە، چونکە الله تعالی لەگەڵ پێغەمبەرەکانیدا علیهم السلام قسە دەکات و ڕێنوێییان دەکات.

لێرەدا مەسەلەیەك هەیە ئەویش ئەوەیە کە ئەهلی سوننەت دەربارەی کەلام و ئاخاوتنی الله تعالی فەرموویانە (کلام اللە قدیم النوع، متجدد الآحاد)واتە : ئاخاوتنی الله وەکو جۆر و ڕەگەزی ئاخاوتن کۆنە و ئەزەلییە، بەڵام لە ڕووی بەشەکانی ئەو ئاخاوتنەوە نوێ دەبێتەوە، واتە الله هەمیشە سیفەتی کەلامی هەر هەبووە و متکلم بووە، بەڵام هەرکەی بیەوێت قسە دەکات و ئاخاوتنی دەبێت مەبەستیان ئەوەیە لە وشەی) متجدد(، ئینجا سیفەتی قسەکردن سیفەتێکی فیعلی کرداری وابەستەیە لەگەڵ زاتی الله تعالی کەی بیەوێت قسەدەکات.

لە فەرموودەدا هاتووە (یدْنَی المؤمنُ یومَ القیامة من ربه حتی یضع كَنَفَهُ علیه، فیُقرِّرُه بذنوبِه، فیقول :أَتَعْرِفُ ذنبَ كذا؟ أَتَعْرِفُ ذنبَ كذا؟ فیقول :ربِّ أعرف، قال :فإني قد سَترتُها علیك في الدنیا، وأنا أغْفِرُها لك الیوم، فیعطی صحیفة حسناته) (١).وەکو دیارە لە فەرموودەکەدا الله تعالی لە ڕۆژی قیامەتدا ئاخاوتن لەگەڵ بەندەکانیدا دەکات وتاوانەکانی بیر دەخاتەوە و پێی دەڵێت لێت خۆشبوومە.

---

(١) متفق علیه.

لەو فەرموودەو لە چەندین فەرموودەی تردا ئەوە وەردەگیرێت کە اللـه تعـالی لە ڕۆژی قیامەتدا بەبێ هیچ هۆکار و وەرگێڕ و تەرجومانێـك لەگەڵ بەندەکانیـدا قسە دەکات، بە دەنگێك قسەیان لەگەڵدا دەکات و بانگیان دەکات، ئەوەی نزیکە و ئەوەی دوورە وەکو یەك ەیبیسن، ئەمەش - وەکو پێشەوا بوخـاری بەڕەحـمەت بێت فەرمـوویەتی - بەڵـگەیە لەسـەر ئەوەی کە دەنگـی اللـه تعـالی جیـاوازە لە دەنگی بەنەکانی.

هەروەها ئەوەی لێ وەردەگیرێت لەگەڵ بەڵگە پەیوەندیدارەکانی تری کیتـاب و سوننەتدا کە بەندەکان لە پاش مردن و لە ڕۆژی قیامەتدا زیندوو دەکـرێنەوەو لێپرسـینەوەیان لەگەڵـدا دەکرێـت، هەرکێـیش ئەو زینـدوو بـوونەوە بەدرۆ و بە ئەفسانە بزانێت ئەوە بە دەقی قورئان کافر دەبێت وکو الله عزوجل فەرمـوویەتی : (زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا ۚ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ ۚ وَذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ) (التغابن:٧) هەروەهـا اللـه تعـالی فەرمـوویەتی: (وَقَـالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَأْتِينَا السَّاعَةُ ۖ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ) سبأ.٣:

الله تعالی لە سـێ جـێگەی قورئانـدا فەرمـانی بە پێغەمـبەرەکەی کـردووە کە سوێند لە سەر زیندوو بوونەوە بخوات، چونکە باوەڕ هێنـان بە زینـدوو بـوونەوە بنەماو بنچینەیەکە لە بیروباوەڕی ئیسلامیدا هەرکێ باوەڕی پێی نەبێت لە بـازنەی ئیسلام دردەچێت، ئایەتەکان بریتین لە:

(زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ وَذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ) التغابن.٧:

﴿وَيَسْتَنۢبِـُٔونَكَ أَحَقٌّ هُوَۖ قُلْ إِي وَرَبِّيٓ إِنَّهُۥ لَحَقٌّۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ﴾يونس.٥٣:

(وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَأْتِينَا السَّاعَةُ ۖ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَالِمِ الْغَيْبِ)سبأ.٣:

# باوەڕهێنان بە حەوز

پێشەوا أحمد بن حنبل فەرموویەتی :(**وَالْإِيمَانُ بِالْحَوْضِ، وَأَنَّ لِرَسُولِ اَللَّهِ صلى الله عليه و سلم حَوْضًا يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ تَرِدُ عَلَيْهِ أُمَّتُهُ، عَرْضُهُ مِثْلُ طُولِهِ، مَسِيرَةَ شَهْرٍ، آنِيَتُهُ كَعَدَدِ نُجُومِ اَلسَّمَاءِ عَلَى مَا صَحَّتْ بِهِ اَلْأَخْبَارُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ**).

یەکێکی تر لە بنەماکانی ئەهلی سوننەت ئەوەیە کە باوەڕیان بە حەوزی پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم لە ڕۆژی قیامەتدا هەیە، درێژی ئەو حەوزە وەکو پانی وایە، درێژی مانگە ڕێیەکە و پانیشی هەروها، قاپەکانی بە ئەندازەی ئەستێرەکانن وکو لە فەرموودە ڕاست و درووستەکاندا هاتووە.

ئیمانی موسوڵمان بە حوض، یەکێکە لەو مەسەلە مەزنانەی پێویستە باوەڕی پێیان هەبێت وبەشێکیشە لە باوەڕهێنانی بەڕۆژی دوایی، سی یان چل فەرموودە لەو بارەوە هاتووە، هەمووی باس لەوە دەکات کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە رۆژی قیامەتدا حەوزێکی هەیە، ئوممەتەکەی دەچنەسەری و خەڵکانێکیش لەوانەی دەستیان بەسوننەتەوە نەگرتووە ڕێگە نادرێن بچنە سەری و دوور دەخرێنەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە لە ئوممەتی پێغەمبەریشن صلى الله عليه و سلم.

ئەم حەوزە ئاوەکەی لە بەهەشتەوە لە ڕوباری (الكوثر) سەرچاوە دەگرێت، دوو جۆگەلە ئاو لە بەهەشتەوە دەرژێنە ناو ئەو حەوزە، ئاوی ئەو حەوزە لە شیر

سپیترە، لە هەنگوین شیرینترە، هەرکێ یەك جار لەو ئاوە بخواتەوە، ئیتر تینووی نابێت تاکو دەچێتە ناو هەشت.

ئیمانداران دەچنە سەر ئەو ئاوەو کافر و مونافیقانی لێ دوور دەخرێتەوە، مەوداکەی بەوە دیاری کراوە کە مانگە ڕێیەکە بە ئەندازەی مەودای نێوان عەدەن و ئەبیەن کە دوو شارن لە یەمەن و لە شام، کە ئەمەش بەواتای ئەوە دێت ئەو مانگە ڕێکردنە مەبەست پێی ڕێکردنی ئاسایی پیادەیە .ئەم وەسف و باسانەش لەو فەرموودانەدا هاتوون کە ئاماژەیان پێکرا بۆ نموونە هەندێکی لە (صحیح البخاري) لە کتاب (الرقائق) (باب في الحوض)دا باس کراوە، هەندێکیشی لە صحیح مسلم (باب إثبات حوض نبينا محمد صلى الله عليه و سلم وصفاته) باس کراون، لەوانە :

(حَوْضِي مَسِيرَةُ شَهْرٍ، وَزَوَايَاهُ سَوَاءٌ، وَمَاؤُهُ أَبْيَضُ مِنَ الوَرِقِ، وَرِيحُهُ أَطْيَبُ مِنَ المِسْكِ، وَكِيزَانُهُ كَنُجُومِ السَّمَاءِ، فمَن شَرِبَ منه فلا يَظْمَأُ بَعْدَهُ أَبَدًا) .البخاري (٦٥٧٩)، ومسلم.(٢٢٩٢) (أنا فرَطُكم على الحوضِ وليختلجنَّ رجالٌ دوني فأقولُ : يا ربِّ أصحابي فيقال : إنك لا تدْري ما أحدَثوا بعدَك) [١].

(١) البخاري (٦٥٧٦)، ومسلم (٢٢٩٧).

هەروەها پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم داوای ئەنسارەکان کردووە لە دوای وەفاتی خۆی ئارام بگرن تا ئەو کاتەی لە لای حەوزەکە بەیەکتر دەگەنەوە : (إنكم ستلقون بعدي أَثَرَةً فاصبروا، حتى تلقوني على الحوضِ)[١]

ئەو حەوزەی لە فەرموودەکاندا باس کراوە لە گۆڕەپانی مەحشەردایە پیش چوونە بەهەشت، ئەوانە دەچنە سەری کە دەستیان بە سوننەتی پێغەمبەرەوە صلى الله عليه و سلم گرتووە

لە فەرموودەیەکیشدا لەلای الترمذي (٢٤٤٣) هاتووە کە هەموو پێغەمبەرێك حەوزێکی هەیە بەڵام حەوزی پیغەمبەرمان عليه و الصلاة والسلام لە هەمووی مەزنترە، چونکە شوێنکەوتوانی لە شوێکەوتوانی هەموو پێغەمبەران عليهم السلام زۆرترن.

(ابن أبي العز) لە شەرحی (العقيدة الطحاوية ) دا دەڵێت حەوز لە پێش میزانە، چونکە خەڵکی بە تینوێتی لە گۆڕەکانیانەوە زیندوو دەکرێنەوە، بەڵام ئەم قسە بەڵگەی لەسەر نییە وەکو یەکێك لە ڕاڤەکارانی ئەو کتێبە دەڵێن وڕاستتریش ئەوەیە لەو مەسەلانەی کە بەڵگەیەکی ڕاست و یەکلاکەرەوەی لەسەر نەهاتووە ئێمەش هیچ نەڵێین.

سەبارەت بەوەی ئایا حەوز لە پێش پردی (الصراط)ە یان لە پاشی، ئەوەیان جێگای تێڕامانە، ابن القيم بە ڕەحمەت بێت ، پاش ئەوەی هەر دوو بۆچوونەکە

(١) ). البخاري (٤٤٣٣٠) مسلم ( ١٠٦١).

دەهێنیتەوە دەڵێت :هیچ ڕێگرێك نییە لەوەی لە پێش یان لە پاشی الصراط بێت، چونکە درێژی و پانی مانگەڕێیەکە، جا کە بەو درێژی و پانییە بێت ڕێگر چییە لەوەی تاکو دوای پردی سیرات درێژ ببێتەوە (زاد المعاد) ٦٨/٣.

پوختەی باسەکە ئەوەیە ڕوباری کوثر و حەوز فەزڵ و چاکەی الله تعالی یە لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا و ڕێزگرتنە لە موەحیدانی ئوممەتەکەی کە لەو ڕۆژە سەختەدا ئاوی لێ دخۆنەوەو تینوێتیان دەشکێت، پێغەمبەریش صلی الله علیە و سلم لە پێش ئومەتەکەی دەگاتە سەر حەوزەکە و چاوەڕوانیان دەکات، بەڵام بێ باوەڕان و مونافیقان و ئەوانەی کە لە سوننەتی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم لایانداوە ڕێگە نادرێن و پێغەمبەر علیە الصلاة و السلام ڕوویان لێ وەردەگێرێت، ئەوەش هەرەشەیەکی توندە بۆ ئەوانەی لە دیندا بیدعە ئەنجام ئەدەن وڕێبازی غەیری ڕێبازی ئەهلی سوننەت لە تاقمە گومڕاکان دگرنەبەر.

پێویستە لەسەر موسوڵمان هەموو هەوڵێکی خۆی بدات بۆ ئەوەی لە هەموو گەورەو گچکەیەکدا شوێنکەوتووی سوننەتی پێغەمبەر بێت صلی الله علیە و سلم بۆ ئەوەی الله تعالی خواردنەوەی ئاوی ئەو حەوزەی لە ڕۆژی قیامەتدا بە نسیب بکات، ، چونکە ئەگەر وا نەبێت ئەوا تووشی شەرمەزاری و دوورخستنەوە دەبێت لەو حەزەو لە دوعاو شەفاعەتی پێغەمبەرمان صلی اللە علیە و سلم بێ بەش دەبێت،

# باوەڕ هێنان بە سزای ناو گۆڕ

پێشەوا أحمد بن حنبل فەرموویەتی :**(وَالْإِيمَانُ بِعَذَابِ اَلْقَبرِ، وَأَنَّ هَذِهِ اَلْأُمَّةَ تُفتَنُ فِي قُبُورِهَا، وَتُسْأَلُ عَنِ اَلْإِيمَانِ وَالْإِسْلَامِ، وَمَنْ رَبُّهُ ؟ وَمَنْ نَبِيُّهُ ؟وَيَأْتِيه مُنْكَرٌ وَنَكِيرٌ، كَيْفَ شَاءَ اَللَّهُ وَكَيْفَ أَرَادَ، وَالْإِيمَانُ بِهِ وَالتَّصْدِيقُ بِهِ).**

(وَالْإِيمَانُ بِعَذَابِ اَلْقَبرِ) یەکێکی تر لە بنەماکانی سوننەت وەکو پێشەوا أحمد لێرەدا ڕایدەگەیەنێت ئەوەیە، موسوڵمان باوەڕی بە سزاو خۆشییەکانی ناو گۆڕ هەبێت، بە پێی ئەو دەق و فەرموودە ڕاستانەی کە لەو بارەوە هاتوون.

لە ڕاستیدا دەقەکانی قورئان و سوننەت بە ڕاشکاوی ئاماژە بۆ حەقیقەتی سزاو خۆشییەکانی ناو گۆڕ دەکەن، لەوانە:

﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِىَ إِلَىَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَىْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ۖ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ﴾ الأنعام:٩٣.

ئەو ڕۆژەی کە الله تعالى لەم ئایەتەدا باسی دەکات کاتی دەرچوونی گیانە و باسی سزای ناو دۆزەخ نییە -.﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ﴾الأنفال:٥٠.

ئەو لێدانی مەلائیکەتانە لەو کەسە پاش دەرچوونی گیانێتی کە ئەوە بەشێکە لە سزای ناو گۆڕ .(وَلَنُذِيقَنَّهُمْ مِنَ الْعَذَابِ الْأَدْنَى دُونَ الْعَذَابِ الْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ

يَرْجِعُونَالسجدة:٢١. سزای بچووك لەم ئایەتەدا بە سزای ناو گۆڕ تەفسیر کراوەو سزای گەورەش بە سزای دۆزەخ .

(النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ۖ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ) افر:٤٦. ئەمەش یەکێکە لە بەڵگە ڕوون و ئاشکراکان لەسەر سزای ناو گۆڕ، کە پێش ئەوەی ئالوبەیتی فیرعەون لە ڕۆژی قیامەتدا بخرێنە ناو دۆزەخەوە، پێش ئەوە بەیانیان و ئێواران ئەوان لە سزادا بوونە کە مەبەست پێی سزای ناو گۆڕە .

(إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ . نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنْفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ) فصلت:٣٠٣١.

ئیماندار - وەکو لەم ئایەتانەدا دەردەکەوێت - لە پاش گیان دەرچوونی بە سێ مژدە دڵی خۆش دەکرێت.

١- لە داهاتوو مەترسن، لە ناخۆشییەکانی ڕۆژی قیامەت مەترسن، لە سزای ناو گۆڕ مەترسن، مەلائیکەتەکان دڵیان خۆش دەکەن و مژدە بەوانە دەدەن کە لە دونیادا وتوویانە :(رَبُّنَا اللَّهُ ) واتە تەنها الله یان پەرستووە و شوێنی هیچ شەریعەت و بەرنامەیەکی تر نەکەوتوون.

٢- مژدەی دووەم پێیان دەڵێن :(وَلَا تَحْزَنُوا) واتە :خەم مەخۆن بۆ ئەو ماڵ ومنداڵ و خێزانەی لە دونیا بەجێتان هێشتوون , چونکە الله تعالی بە سۆز ومیهربانی خۆی لەگەڵیان ئەبێت.

٣- مژدەی سێیەم بریتییە لە :(وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ) واتە مژدەتان لێبێت دەچنە ئەو بەهەشتەی بەلێنتان پێ دەدرا .ئەم ئایەتە و هاوشێوەکانی بەڵگەن لەسەر ئەوەی لە ناو گۆڕدا سزا و خۆشی بوونی هەیە.

هەروەها لە سوننەتدا چەندین فەرموودەی صحیح هاتووە لەو بارەوە .وەکو: (إذا تَشَهَّدَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَعِذْ باللَّهِ مِن أَرْبَعٍ يقولُ :اللَّهُمَّ إنِّي أَعُوذُ بِكَ مِن عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَمِنْ عَذَابِ القَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ المَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَّجَّالِ)[1] واتە :یەکێك لەو شتانەی داوامان لێکراوە لە کۆتایی التحيات ی ناو نوێژدا بیلێین ئەوەیە، پەنا بگرین بە الله لە سزای ناو گۆڕ.

- ( إنَّهما ليُعذَّبانِ وما يُعذَّبانِ في كبيرٍ ثمَّ قال :بلى أمَّا أحدُهما فكان يسعى بالنَّميمةِ وأمَّا الآخَرُ فكان لا يستنزهُ مِن بولِه ) ثمَّ أخَذ عودًا فكسَره باثنينِ ثمَّ غرَز كلَّ واحدٍ منهما على قبرٍ ثمَّ قال :( لعلَّه يُخفَّفُ عنهما العذابُ ما لم ييبَسا ) [2]واتە خاوەنی ئەو دوو گۆڕە سزا دەدرێن و لە تاوانێکی گەوەرشدا نییە سزاکەیان،

---

(١) البخاري (١٣٧٧) ومسلم (٥٨٨).

(٢) البخاري (٢١٨)، ومسلم (٢٩٢).

یەکێکیان خەریکی قسە هێنان و بردن بووە و ئەوی تریش لە کاتی میزکردندا وریای خۆی نەبووەو پرشی میزی بەرکەوتووە.

(فَأُوحِيَ إلَيَّ :أَنَّكُمْ تُفْتَنُونَ في قُبُورِكُمْ ) .[1]واتە پێغەمبەر صلی اللە علیە و سلم فەرموویەتی من بە وەحی لە لای اللە ئاگادار کراومەتەوە کە ئێوە لەناو گۆڕەکانتاندا تووشی تاقی کردنەوەو ئیمتیحان دەبن .

-لە فەرموودەیەکی صحیح ی درێژی تردا هاتووە لەلای أبوداود(٤٧٥٣) و النسائي (٣٥٩) و فەرموودەناسی تریش دەیگێڕنەوە، کە بەڵگەی جێگیربوونی سزای ناو گۆڕی تێدایە.

(وَأَنَّ هَذِهِ اَلْأُمَّةَ تُفتَنُ فِي قُبُورِهَا وَتُسْأَلُ عَنِ اَلْإِيمَانِ وَالْإِسْلَامِ، وَمَنْ رَبُّهُ ؟ وَمَنْ نَبِيُّهُ ؟ ) واتە ئەم ئوممەتە لە ناو گۆڕدا تاقی دکرێنەوە ودەربارەی ئیمانیان ، ئیسلام و پەروەردگاریان پرسیاریان لێ دەکرێت، ئەم لێپرسینەوەش هەموو مردوویەك دەگرێتەوە، خرابێتە ناو گۆڕ یان نەخرابێت، تەنانەت ئەگەر دڕندەکانیش خواردبێتیان، یان سوتێنرابێت وخۆڵەکەی کرابێت بەبادا، یان لەناو دەریادا خنکابێت، الله تعالی دەسەڵاتی هەیە ئەو سزا و خۆشییەی پێ بگەیەنێت.

(١) البخاري: (٨٦).

# باوەڕهێنان بە مەسیحی دەججال

پێشەوا أحمد بن حنبل فەرموویەتی :(**وَالْإِيمَانُ أَنَّ اَلْمَسِـيحَ اَلـدَّجَّالَ خَـارِجٌ، مَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ كَافِرٌ وَالْأَحَادِيثُ اَلَّتِي جَاءَتْ فِيهِ، وَالْإِيمَانُ بِأَنَّ ذَلِكَ كَائِنٌ، وَأَنَّ عِيسَى اِبْن مَرْيَمَ عَلَيْهِ اَلسَّلَامُ يَنْزِلُ فَيَقْتُلُهُ بِبَابِ لُـدٍّ.**).

(وَالْإِيمَانُ أَنَّ اَلْمَسِيحَ اَلدَّجَّالَ خَـارِجٌ) :واتە باوەڕهێنـان بەوەی کە مەسـیحی دەججال دەردەچێت و سەر هەڵدەدات .بەڵام لێرەدا پێویستە ئەوە بزانین کە دوو مەسیح هەیە:

یەکەمیان مەسیحی پێغەمبەرە کە ناوی عیسایی کوڕی مەڕیەمە علـیهما السـلام وهۆکاری ناونانیشی بە مەسیح لەبەر ئەوەیە کە ژێر پێی تەخـت بـووەو چـاڵایی تێـدا نەبـووە، یـان لەبەر ئەوەیە کە ئەو بەسـەر زەویـدا گەشـتی کـردووە و بەگەشتەکانی مەسحی سەر زەوی کردووە .

دوومیان کە لێرەدا مەبەستەکە ئەوەیە، مەسیحی درۆزنە، ناسراو بە دەججـال، پیـاوێکە و مـرۆڤێکە لە مرۆڤەکـان، بانگەشـەی پەروەردگـارێتی دەکـات، لە خوراسانی ڕۆژهەڵاتەوە سەرهەڵدەدات، ئینجا دەسـت بەگەڕان دەکـات و جـێگە نامێنێت سەری پێدا نەکات، جگە لە مزگەوتی القدس و الطور ومەککە و مەدینە نەبێت ناتوانێت داخلیان ببێت چونکە مەلائیکەت پاسەوانی دەکات.

دەرچوونی دەججال فیتنەو تاقیکرنەوەو بەڵایەکی زۆر گەورەیە، لە فەرمودەی صـحیح دا هـاتووە کە دۆزەخێـك و بەهەشـتێکی لەگەڵـدایە، بەڵام دۆزەخەکەی

بەهەشتە و بەهەشتەکەی دۆزەخە !نان و ئازووقەی زۆر و ڕوبـاری ئـاوی پێـیە، فەرمان بە ئاسمان دەکات و باران دەبارێت، فەرمان بە زەوی دەکـات و سـەوزی دەڕوێنێـت و گەنجیـنەی زۆری سـەرزوی لە ژێـر دەسـتیدایە، مەوداکـان بە خێراییەکی زۆر دەبڕێت وەکو بارانێك بای بەدوادا بێت.

پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم لە فەرموودەکاندا دەربارەی دەججال وریـایی پێداوین و خەسڵەت و سیفەتەکانی ئەوی بۆ باسکردووین بۆ ئەوەی خۆمانی لێ بپارێزین، ڕوونـی کـردووەتەوە کە پیـاوێکی لاوی سـوورەیە وچـاوێکی کـوێرە و مناڵیشـی نابێـت، لە نێـوان هەردوو چاویـدا نـووسراوە ( ك ف ر ) یـان (کـافر) هەموو کەسێك توانای خوێندنەوەی ئەو نووسینەی هەیە.

لە فەرموودەیەکدا هەندێك لەو وەسف و خەسـڵەتانەی باسـکراوە :(إنِّي قـد حذَّرتُكُمُ الدَّجَّالَ حتَّى قد خشيتُ أن لا تعقِلوا أنَّ المسيحَ الـدَّجَّالَ رجـلٌ قصـيرٌ أفحَجُ أدعَجُ أعورُ ممسوحُ العينِ ليسَ بناتئةٍ ولا حُجرًا فإن أُلبسَ عليكُم فاعلَموا أنَّ ربَّكم تبارَكَ وتعالى ليسَ بأعورَ وأنَّكُم لن تَرَوا ربَّكم حتَّى تَموتوا) [(١)]

پێشـەوا أحمـد : دەبـارەی دەججـال فەرموويەتی(مَكْتُـوبٌ بَـيْنَ عَيْنَيْـهِ كَـافِرٌ وَالْأَحَادِيثُ اَلَّتِي جَاءَتْ فِيـهِ) واتە :لە نێوچەوانیـدا نـووسراوە کـافر .ئامـاژە بـۆ فەرمودە سەحیحەکان لەو بارەوە دەکات وەکو :(ما بعث الله مـن نبـي إلا أنـذر قومه الأعور الكذاب، إنه أعور، وإن ربكم ليس بأعور، مكتوب بين عينيه كـافر)

---

(١) أحمد (٢٣١٤٤)، أبو داود (٤٣٢٠).

واتە :هەموو پێغەمبەرێك ئوممەتەکەی لە دەججال وریـا کـردووەتەوە، دەججـال چاوێکی کوێرە و پەروەردگاری ئێوە وا نییە، دەججال لە نێوان چاوانیدا نوسراوە کافر.

ابن بطة العكبري بە ڕەحـمەت بێـت لە کتێبـی( الإبانـة)دا هەمـان عەقیـدەی پێشەوا أحمد دوپات دەکاتەوە دەڵێت:(والـدجال خـارج في آخـر هـذه الأمـة لا محالة، إحدى عينيه كانها عنبة طافية، يطأ الأرض كلها إلا مكة والمدينةويقتله عيسى بن مريم عليه السلام بباب لد الشرقي بأرض فلسـطين علـى قـدر مسـيرة ميل من الرملة).

لە ڕاستیدا دەرچـوونی دەججـال پێویسـتە باوەڕمـان پێـی هەبێـت، چـونکە لە سوننەتی صحیح دا جێگیر بووە، پێغەمبەر صلی الله علیـە و سـلم فەرمـوویەتی : (إِذَا تَشَهَّدَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَعِذْ باللَّهِ من أَرْبَعٍ يقولُ :اللَّهُمَّ إنِّي أَعُوذُ بِكَ مِـن عَـذَابِ جَهَنَّمَ، وَمِـنْ عَـذَابِ القَـبْرِ، وَمِـنْ فِتْنَـةِ المَحْيَـا وَالْمَـمَاتِ، وَمِـنْ شَرِّ فِتْنَـةِ المَسِـيحِ الدَّجَّالِ) .مسلم .(٥٨٨)واتە لە کۆتایی التحیاة ناو نوێژدا داوامان لێکراوە پەنـا بە الله بگرین لە چوار شت کە یەکێکیان شەڕو خراپەی دەججالە.

موسوڵمان پێویسـتە لەو فیتـنەیە خـۆی بپارێزێـت بە بـاوەڕی تەواوی بە اللـە تعالی و بە پەنا گرتن پێی لە فیتنەو خراپەی دەججال بە تایبەتی لە ناو نوێژەکاندا ، پێغەمبەر صلی الله علیە و سلم فەرموویەتی :(مَن حَفِـظَ عَشْرَـ آيـاتٍ مِـن أوَّلِ

سُورَةِ الكَهْـفِ عُصِـمَ مِـنَ الـدَّجَّالِ)[١] واتە :هەرکەسێك دە ئـایەت لەسـەرەتای سوڕەتی الكهف بخوێنێت و لەبەری بکات لە شەڕی دەججال پارێزراو دەبێت.

لە فەرموودەیەکی صحیح ی تردا هاتووە :(ذُكِرَ الدَّجَّالُ عِنْدَ النبيِّ صَـلَّى اللـهُ عليه وسلَّمَ، فَقَالَ :إنَّ اللَّهَ لا يَخْفَى علَيْكُم، إنَّ اللَّهَ ليسَ بأَعْوَرَ - وأَشَارَ بيَدِهِ إلى عَيْنِهِ - وإنَّ المَسِيحَ الدَّجَّالَ أعْوَرُ العَيْنِ اليُمْنَى، كَأنَّ عَيْنَهُ عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ)[٢].

دەججال یەکەم جار کە دەردەچێت بانگەشەی چـاکی و چاکسـازی دەکـات، پاشان بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات، خۆیشـی لە ڕاسـتیدا کـافرە و لە نێـوان چاوەکانیـدا نـووسراوە (ك ف ر ) هەمـوو ئیمانـدارێك دەیخـوێنیتەوە وەکـو لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە (٧١٣١) یەك چاویشی کە چـاوی ڕاسـتێتی دەڵێـی ترێیەکە و سەر ئاو کەوتووە .مەبەستی ئەوەیە چاوی دەرپۆقیوەتە دەرەوە.

دەرکەوتنـی دەججـال دووەم نیشـانەی گەورەیە لە نیشـانەکانی بەرپـابوونی قیامەت، الله تعالی فەرمـوویەتی :(فَقَـدْ جَـاءَ أَشْرَاطُهَـا ) واتە قیـامەت نـزیکە نیشانەکانی دەرکەوێت.

شوێنکەوتوانی دەججال زیاتر لە جولەکە و عەجەم [٣]دەبێت وڕیژەی ژنانیش لە شـوێنکەوتوانیدا ڕێـژەیەی بەرز دەبێـت، پێغەمـبەر صـلی اللـه علیـه و سـلم

---

(١) مسلم: (٨٠٩ و ٢٩٣٧).

(٢) البخاري (٧٤٠٧)، ومسلم (١٦٩).

(٣) عەجەم ناوی ڕەگەزە بۆ غەیری عەرەب بەکار دێت، واتە کێ عەرەب نەبێت لە زمانی عەربیدا (أعجمي) پی دەوترێت.

فەرموویەتی :(يَتْبَعُ الدَّجَّالَ مِن يَهُودِ أَصْبَهانَ، سَبْعُونَ أَلْفًا عليهمُ الطَّيالِسَةُ) [١]واتە :لە جولەکەکانی ئەسفهان حەفتا هەزار کەس شوێنکەوتووی دجال دەبن، تەیلەسانیان بەسەرەوە کە پۆشاکێکی سەرە تایبەت بە جولەکە.

دەربارەی مانەوەی دەجال لەسەر زەویدا پرسیار لە پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم کرا و ئەویش فەرمووی ماوەی مانەوەکەی لەسەر زەویدا بریتییە لە : (أربعون يوماً، يوم كسنة، ويوم كشهر، ويوم كجمعة، وسائر أيامه كسائر أيامكم، قالوا :يا رسول الله !اليوم الذي كسنة تكفينا فيه صلاة يوم واحد؟!) (٢)واتە چل ڕۆژ لەسەر زەویدا دەمێنێتەوە، ڕۆژێك وەکو ساڵێك و ڕۆژێك وەکو مانگێك و ڕۆژێك وەکو هەفتەیەك و ڕۆژەکانی تر ڕۆژی ئاسایین.

لە کۆتاییدا فەرموویەتی :(وَأَنَّ عِيسَى ابْن مَرْيَمَ عَلَيْهِ اَلسَّلَامُ يَنْزِلُ فَيَقْتُلُهُ بِبَابِ لُدٍّ) واتە :دوای مانەوەی بۆ ئەو ماوەیە، عیسای کوری مەریەم علیهما السلام لە ئاسمانەوە دادەبەزێت - کە ئەوەش سێیەمین نیشانەی گەورەی قیامەتە - دادەبەزێت وهەردوو دەستی خستووەتە سەر باڵی مەلائیکەتێك، لەلای منارە سپییەکەی ڕۆژهەڵاتی شاری دیمەشق، لە کاتی نویژی بەیانیدا و لەو کاتەدا هەندێ لەوانەی نوێژ دەکەن داوای لێ دەکەن پێشوێژیان بۆ بکات ، بەلام ئەو رازی نابێت و دەڵێت قامەت بۆ ئێوە کراوە، عیسا علیه و السلام کە دادەبەزێت

(١) مسلم: (٢٩٤٤).

(٢) مسلم(٢٩٣٧)

له باب لد مەسیحی دەججال دەکوژێت، دەججال کە عیسا علیه السلام دەبینێـت وەکو خوێ دەتوێتەوە، بەڵام عیسا علیه السـلام پـیش ئەوەی ئەو خـۆی بمرێـت دەیکوژێت.

عیسا علیه السلام لەپاش کوشتنی بۆ دەججـال لەنـاو خەڵکیـدا دەمێنیـتەوە و حوکم دەکات، لەسەردەمی ئەویشدا نیشانەی چـوارەمی گەورەی ڕۆژی قیـامەت دەردەکەوێت کە بریتییە لە دەرچوونی یأجوج ومأجوج .کە دوو ئوممەتی کافرن و ژمارەیان گەلێك زۆرن.

# ئیمان گوفتار و کرداره، زیادو کەم دەکات

پێشەوا أحمد بن حنبل بنەمایەکی تر لە بنەماکانی سـوننەت ڕوون دەکـاتەوەو دەفەرموێت :(**وَالْإِيمَانُ قَوْلٌ وَعَمَلٌ، يَزِيدُ وَيَنْقُصُ كَـمَا جَـاءَ فِي اَلْخَـبَرِ :أَكْمَـلُ اَلْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا** ).

(وَالْإِيمَانُ قَوْلٌ وَعَمَلٌ، يَزِيدُ وَيَنْقُصُ كَمَا جَاءَ فِي اَلْخَبَرِ) :واته :ئیمان بریتییه له گوفتار و له کرداریش، به عیبادەت وبه کاری چاکه زیاد دەکـات و به تـاوان و به کاری خراپه کەم دەکات، وەکو له دەقەکانی قورئان و سوننەتدا هاتووه.

ئیمانـی شـەرعی لەلای ئەهلـی سـوننەت به شـێوەیەکی گشـتی بـریتییه له بیروباوەڕی دڵ و وتنی زمان و کردەوەی ئەندامەکان، لەسەر ئەمه هەموو زانایان ی ئەهلی سوننەت یەك دەنگن، ئەگەرچـی له دەربڕینـدا هەنـدێ جیاوازییـان له نێواندا هەیە:

پێشەوا البغوي له (شرح السنة) دا دەڵێت :(اتفقت الصحابة، والتابعون، فمن بعدهم من علماء السنة على أن الأعمال من الإيمان ...وقـالوا :إن الإيمـان قـول، وعمل، وعقيدة)[1] .واته :هاوەڵان و تابیعییەکان و ئەوانەی دوای ئەوان هاتوون له زانایانی ئەهلی سوننەت یەکدەنگ وکۆکن لەسەر ئەوەی که کرده بەشـێکه له ئیمان، فەرموویانه :ئیمان قەول و گوفتاره، عەمەل و کـرداره، عەقیـدەو بیروبـاوەڕه وله یەکتر جیانابنەوه.

---

(١) شرح السنة (١/٣٩).

پێشەاو الشَّافعيُّ بە ڕەحمەت بێت فەرموویەتی :(كـان الإجـماعُ مـن الصَّـحابةِ والتابعينَ مِن بَعْدِهم ومَن أدرَكْناهم، يقولون :الإيمانُ قَولٌ وعَمَلٌ ونِيَّةٌ، لا يجـزئُ واحِدٌ من الثَّلاثِ إلَّا بالآخَرِ (كتاب الإيمان، ابن تيمية،) ل ١٦٦ :واتە :كۆدەنگی هـاوەڵان و تابیعییەكـان و ئەوانەی ئـێمە بە دیـداریان گەیشـتین ئەوە بـوو كە دەیانفەرموو :ئـیمان گوفتـارە و كـردارەو نـیەتە، یەكـێ لەمـانە بەبـێ ئەوانـی تـر درووست نییە.

پێشەوا البُخاريُّ بە ڕەحمەت بێت فەرموویەتی :(لَقِيتُ أكثرَ مِـن ألـفِ رَجُـلٍ من العُلَماءِ بالأمصارِ، فما رأيـتُ أحـدًا مـنهم يختَلِـفُ في أنَّ الـدِّينَ قَـولٌ وعَمَـلٌ) [(١)]واتە :زیاتر لە هەزار زانای شـارو شـوێنەكانم بینیـوە، یەكێكیـان لەوە نـاكۆك نەبوو كە دین بریتییە لە گوفتارو لە كردار پێكەوە.

پێشەوا ابنُ عبـدِ الـبَرِّ بە ڕەحـمەت بێـت فەرمـوویەتی :(أجمـع أهْـل الفِقـهِ والحديثِ أنَّ الإيمـانَ قَـولٌ وعَمَـلٌ، ولا عَمَـل إلَّا بنيَّـةٍ، والإيمـانُ عِنـدَهم يزيـدُ بالطَّاعةِ ويَنقُصُ بالمعصيةِ، والطَّاعاتُ كُلُّها عنـدهم إيمـانٌ) التمهيـد، .(٩/٢٣٨) واتە زانایانی فیقهو فەرموودە یەكدەنگن و نـاكۆكی لە نێوانیانـدا نـیـە كە ئـیمان گوفتارەو كردارە، كرداریش وەرگیـراو نـیـە ئەگەر نیەتـی دڵـی لەگەڵـدا نەبێـت، ئیمانیش بە تاعەت و چاكە زیاد دەكات و بە تاوان و خراپە كەم دەكات، تـاعەت و عیبادەتەكانیش هەمووی بەلایانەوە ئیمان بوو.

---

(١) شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة، للالكائي (١٩٥/١).

شيخ الإسـلام ابـنُ تيميَّـةَ بەڕەحـمەت بێـت فەرمـوویەتی :(أجمـع السَّـلَفُ أنَّ الإيمانَ قَولٌ وعَمَلٌ، يزيدُ ويَنقُصُ، ومعنى ذلك أنَّه قَولُ القَلبِ وعَمَلُ القَلبِ، ثـمَّ قَولُ اللِّسانِ وعَمَـلُ الجـوارحِ، فأمَّـا قَـولُ القَلـبِ :فهـو التصـديقُ الجـازمُ باللـهِ وملائِكَتِه وكُتُبِه ورُسُلِه واليومِ الآخِرِ، ويدخُلُ فيه الإيمانُ بكُلِّ ما جاء به الرَّسـولُ صلَّى اللهُ عليـه وسـلَّم (مجمـوع الفتـاوى)، .(٧/٦٧٢)واتە :زانایـانی سـەلەف یەکدەنگن لەسەر ئەوەی ئیمان قەول و عەمەلە زیاد و کەمـیش دەکـات، لە قەول مەبەستیان قەولی دڵ و کردەوەی دڵە، ئینجا قەولی زمان و کردەوەی ئەندامەکان. قەولی دڵ بریتییە لە باوەڕهێنانی پتەو بە اللـە و مەلائیکەتەکـان و ئەو کتێبـانەی الله دایبەزاندووە و باوەڕ بە پێغەمبەران و بە ڕۆژی دوایی، ئـیمان و بـاوەڕیش بە هەموو ئەوەی پێغەمبەر صلی الله علیە و سلم فەرموویەتی بەشێکە لە ئیمان.

البربهاري [1]بە ڕەحمەت بێـت فەرمـوویەتی :(الإيمـانُ قَـولٌ وعَمَـلٌ، وعَمَـلٌ وقَولٌ، ونِيَّةٌ وإصابةٌ، يَزيدُ ويَنقُصُ، يزيدُ ما شاء اللهُ، ويَنقُصُ حتـى لا يبقـى منـه شيءٌ) [2]ئیمان قەول و کردەوەیە، کـردەوەو قەولە، نـیەت و پێکـانە، زیـاد و کەم دەکات، زیاد دەکات ئەوەندەی الله ویستی لەسەر بێـت، کەمـیش دەکـات تـاکو هیچی لێ نامێنێت.

(١) ناوی أبو محمد الحسن بن علي بن خلف البربهاري یە، سەری حەنبەلی مەزهەبەکان بووە لە سەردەمی خۆیدا، لە ٣٢٩ ك وەفاتی کردووە، بۆ ژیانامەیکەی بڕوانە: سير أعلام النبلاء: (١٩/١٥).

(٢) شرح السنة: ٥٢.

ابنُ أبي زيدٍ القَيرواني بە ڕەحمەت بێت دەڵێت :(الإيمانُ قَولٌ باللِّسانِ، وإخلاصٌ بالقَلْبِ، وعَمَلٌ بالجوارحِ، يَزيدُ بزيادةِ الأعمالِ، ويَنقُصُ بنَقْصِها، فيكونُ فيها النَّقصُ وبها الزِّيادةُ، ولا يَكمُلُ قَولُ الإيمانِ إلَّا بالعَمَلِ، ولا قَولٌ وعَمَلٌ إلَّا بنِيَّةٍ، ولا قَولٌ وعَمَلٌ ونِيَّةٌ إلَّا بموافقةِ السُّنَّةِ [1]) . ئەمەش هەمان وتەی زانایانی پێشینانە کە ئاماژەمان بۆ کرد.

(ابنُ بطَّة العُكبَري) بە رەحمەت بێت : (إنَّ أهلَ الإثباتِ مِن أهلِ السُّنَّةِ يُجمِعون على الإقرارِ بالتوحيدِ وبالرِّسالةِ بأنَّ الإيمانَ قَولٌ وعَمَلٌ ونِيَّةٌ) [2] ئەم زانا گەورەیەی ئەهلی سونن‌ەتیش بەهەمان شێوە جەختی لەسەر ئەوە کردووەتەوە کە ئیمان گوفتارە و کردارە و نیازی دڵە و ئەم شتانە لەیەکتر جودا نابنەوە.

ابنُ تيميَّةَ بە ڕحمەت بێت فەرموویەتی :(إنَّ من قال من السَّلَف :الإيمانُ قَولٌ وعَمَلٌ، أراد قَولَ القَلبِ واللِّسانِ، وعَمَلَ القَلبِ والجوارحِ) [3]واتە :زانایانی سەلەف ئەوانەی کە فەرموویانە ئیمان قەول و عەمەلە، مەبەستیان قەولی دڵ و زمانە، کردەوەی دڵ و ئەندامەکانە.

مەبەست لە زیاد کردن و کەم کردنی ئیمان ئەوەیە خەڵکی بە پێی زۆر و کەمی کردەوەو عیبادەتەکانیان و بە نیەتی دڵەکانیان لە یەکتر باشتر دەبن، بۆ نموونە

(١) عقيدة السلف – مقدمة ابن أبي زيد القيرواني لكتابه الرسالة: ٦٠.

(٢) الإبانة الكبرى، (٥٥٧/٢).

(٣) مجموع الفتاوى، (١٧١/٧).

کەسێك ئەگەر کارێکی چاکەی کرد وەکو سەدەقە و زیکر و جیهاد کردن ئیمانی بەوە زیاد دەکات.

ئەگەر یش خراپەو تاوانێکی ئەنجامدا وەکو خۆبەزلزانین ودزی وهەرکارێکی خراپەی تر بەوە ئیمانی کەم دەکات.

تاقمی مورجیئەکان لەم مەسەلەدا ڕایان جیاوازەو و لەگەڵ ئەهلی سوننەتدا ناکۆکن، ئەوان دەڵێن :ئیمان نە قەولە و نە عەمەلە، زیاد و کەمیش ناکات، ئیمان بە پێی تێگەیشتنی ئەوان تەنها لە دڵدایە .گروپێکیش لە مورجیئە ڕایان وایە ئیمان تەنها لە زماندایە .

**مورجیئەکان دەبنە چەند تاقم وکۆمەڵێکەوە:**

١- تاقمی جەهمییەکان :ئەوان دەڵێن ئیمان تەنها زانین و ناسینە، واتە کەسێك تەنها بەدڵ الله بناسێت ئیتر ئەو بەسیەتی و کەسە ئیمانداره، کوفرییش ئەوەیە ئەو کەسە بەدڵی الله نەناسێت، واتە ئیماندار لەلای جەهمی کوڕی سەفوان کەسێکە بەدڵ پەروەردگاری خۆی ناسیبێت و کافریش کەسێکە بەدڵی پەورەدگاری نەناسیبێت، بەو تێگەیشتنەی جەهم بێت فیرعەونیش ئیماندارە، چونکە الله تعالی لە قورئاندا فەرموویەتی :(وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ) النمل ١٤.:بۆیە لە پێناسەی ئیماندا کەس نییە لە جەهم خراپتر و ناشیرنتر پێناسەی کردبێت.

٢- تاقمی الكرامية :ئەمانە شوێنکەوتووی محمد بن کرام ن، دلێن :ئیمان ئەوەیە کەسێك بە زمانی بڵێت ئیماندارم، یان بە زمانی بڵێت (لا إله إلا الله)، ئیتر

با لە دڵیشەوە بێ باوەڕ بێت، سەیریش ئەوەیە کە لە هەمان کاتـدا دەڵـێن :ئەگەر بەدڵی باوەڕی بەوە نەبێت کە بەزمـانی دەیڵێـت ئەوە بە هەمیشـەیی لە دۆزەخـدا دەمێنیتەوە.

٣- کـۆمەڵی ماتریدیـة و أشـاعرة :ئەمـانەش لە بنچیـنەدا لە عەقیدەکەیانـدا بەشـێکن لە تـاقمی مـورجیئە، ئەوان دەڵـێن ئـیمان تصـدیق و باوەڕهێنـانە بەدڵ وکردەوە بەشێك نییە لە ئیمان، هەمان ئەم بیروباوەڕە وەکو قەولێك لە أبو حنیفة ش دەگێڕنەوە کە ئەویش باوەڕی وا بووە ئیمان ئەوەیە کە لە ناو دڵدا جێگیر دەبێـت، بەدەر لە وتنی زمان، بەهۆی ئەم بۆچوونەوە ابن تیمیة پێی وایە کە ئەوە جـۆرێکە لە پشتگیریکردن و هاوڕابوون لە گەڵ ڕێڕەوەکەی الجهم بن صفوان دا.(١)

٤- مرجئـة الفقهـاء :ئەم کـۆمەڵەش هەر بەبەشـێك لە تـاقمی مورجئیـة دەژمێردرێت، دەڵێن ئیمان دوو شتە :باوەڕە بەدڵ وتنە بە زمـان، بەڵام عیبـادەت و

(١) پرسیار مامۆستا چی دەربارەی سنة کەی عبداللەی کوڕی ئیمام ئەحمەدو ئەوەی تێیدا دەیڵێ دەربارەی ابو حنیفە .؟،
وەڵام : بۆ مەسەلەی تەکفیر لەگەڵ تەکفیر کردنی أبو حنیفة وعبدالله وغەیری عبدالله لەو تەکفیرکردنەدا نەیانپێکاوە، عبدالله ڕاستە أبو حنیفةی تەکفیر کردووە بەڵام زانا گەورەکانی سەلەف و أحمد ی باوکی عبدالله یش ئەویان تەکفیر نەکردووە، بەلام هەندێ کێشەی لە عەقیدەدا هەیە بەڵێ وایە بەتایبەتی لە پێناسەی ئیماندا ناگاتە ئەوەی تەکفیر بکرێت، بەڵام مەرجیش نییە هەرچی دەربارەی أبو حنیفة ئەوترێت هەمووی ڕاست بێت ووردبوونەوەو لێکۆڵینەوە لەم جۆرە پرسانەدا پێویستە،

کردەوەکـان بەشـێك نـین لە ئـیمان، کە ئەمەش قەولێکـی تـرە و لە أبـو حنیفـة دەگیرڕدرێتەوەو زۆربەی شوێنکەوتوو و قوتابییەکانی لەسەر ئەوەن.

ئەم چوار بەشـەی زانایـان ئاماژەیـان پـێ دەکەن، هەموویـان دەڵـێن کـردەوە بەشـێك نیـیە لە ئـیمان و ئیمانـیش یەك شـتە و زیـاد و کەم ناکـات، گومـان و شوبهەکەشیان لەوەدایە کە دەڵێن ئـیمان ڕاسـتییەکی ئـاوێتەیە و ناکرێـت دابەش ببێت، واتە یان هەیە و یان نییە، ئەوەش وتەیەکی هەڵەی بێ مەعنایە، بۆ نمـوونە مرۆڤیش ڕاستیەکی ئاوێتەیە، ئایا ئەگەر کەسێك ئەندامێکی لەدەسـتدا درووسـتە بوترێت هەموو مرۆڤکە بوونی نەما؟

بەڵام ئەهلی سوننەت و جەماوەری زانایان و سێ پێشەوا گەورەکـانی ئیسـلام شافیعی و مالیك و ئەحمەد بە ڕەحمەت بن، دەڵێن ئیمان قەول و عەمەلە، قەولـی دڵ و قەولی زمان، کردەوەی دڵ و کردەوەی ئەندامەکان، زیـاد و کەم دەکـات و بەهێزی و لاوازی بەخۆیەوە دەبینێت .بەڵگەش لەسەر ئەو بیروباوەڕە گەلێك زۆرە ، بۆ نموونە:

-(إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ . الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ . أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ لَهُمْ دَرَجَاتٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ) الأنفـال .٤-٢ ئەم ئـایەتە وەك ئاشـکرایە ئەو کـردەوانەی وەکـو نـوێژو زەکات بە بەشێك لە ئیمان داناوە و ترسی دڵیشـی بە بەشـێك لە ئـیمان دانـاوە کە

ئەوە كردەوەی دڵە -.(فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا) النساء .٦٥ :ئەم ئایەتە گەڕانەوەی بۆ حوكمی پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم بەبەشێك لە ئیمان داناوە.

(إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ) الحجرات .١٥:لەم ئایەتەدا جیهاد كە كردەوە وعیبادەتە بە بەشێك لە ئیمان دانراوە و لە ئیمان جیانەكراوەتەوە.

- پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم فەرموویەتی :(الإيمانُ بضعٌ وسبعون شعبةً ، أعلاها قولُ لا إله إلا اللهُ ، وأدناها إماطةُ الأذى عن الطريقِ)[١] و لە كتێبی تریشدا ڕیوایەت كراوە .وەك دەردەكەوێت بەئاشكرا ئیمان كراوەتە زیاتر لە حەفتا بەشەوە كە بەرزترینیان وتنی لا إله إلا الله یە و نزمترینیان لابردنی ڕێگای خەڵكی كە دەبێتە مایەی ئازاریان، هەموو ئەو لە بە ئیمان دانراوە.

(آمُرُكُمْ بِأَرْبَعٍ، وأَنْهَاكُمْ عن أرْبَعٍ :الإيمَانِ باللَّهِ شَهَادَةِ أنْ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، وإقَامِ الصَّلَاةِ، وإيتَاءِ الزَّكَاةِ، وأَنْ تُؤَدُّوا إلى اللَّهِ خُمُسَ ما غَنِمْتُمْ، وأَنْهَاكُمْ عَنِ الدُّبَّاءِ، والحَنْتَمِ والنَّقِيرِ، والمُزَفَّتِ)[٢] لەم فەرموودەشدا بەهەمان شێوە ئیمان بە عەمەل تەفسیر كراوە.

---

(١) مسلم (٣٥) البخاري له الأدب المفرد به ژماره (٥٩٨) گێراویتییەوە.

(٢) البخاري (٣٥١٠) واللفظ له، ومسلم (١٧).

موعتەزیلە و خەواریج لە پێناسەی ئیماندا هەمان پێناسەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتیان هەیە، دەڵێن ئیمان قەولە بە زمان و کردەوەیە بەدڵ و بە ئەندامەکان، بەڵام جیاوازییەکی گەورەیان لەگەڵ ئەهلی سوننەتدا ئەوەیە کە ئەهلی سوننەت دەڵێن ئیمان زیاد و کەم دەکات و لاواز و بەهێز دەبێت، ئەوان دەڵێن نەخێر ئیمان بە ئەنجامدانی تاوانی گەورە لەنێو دەچێت و کەسەکە لە بازنەی ئیمان دەردەچێت، چونکە ئەوان دەڵێن ئیمان بەش بەش نابێت و یەك ڕاستییە.

هەندێ لە زانایان بەرگری لە مورجیئەی فوقەها دەکەن و دەڵێن ئەوان جیاوازن لە تاقمەکانی تر و ناکۆکی ئەوان لەگەڵ ئەهلی سوننەتدا ناکۆکییەکی ڕواڵەتییە و ئەگەر لە مەزهەبەکەیان وردبیتەوە دەبینیت جیاوازییەکی ئەوتویان لەگەڵ ئەهلی سوننەتدا نییە .چونکە ئەوان دەڵێن کردەوە عیبادەتەکان ئەگەر چی بەشێك نییە لە ئیمان بەڵام دەبێت بکرێت، بەهەمان شێوە دوورکەوتنەوە لە حەرام و قەدەغەکراوەکان ئەویش هەر دەبێت موسوڵمان ئەنجامی بدات و لە حەرامەکان بەدوور بێت، کێشەیان ئەوەیە کە عیبادەتەکان ناونانێن ئیمان.

بەڵام بەهەر حاڵ مورجیئەی فوقەها ڕێڕەوەکەیان ئەگەر لادانی لەوانی تریش کەمتر بێت، یان خیلافەکەیان لەگەڵ ئەهلی سوننەتدا خیلافێکی لەفزیش بێت وەکو دەوترێت، بەڵام دواجار هیچ نەبێت لەو مەسەلەدا لە ئەهلی سوننەت جیادەبنەوەو نابێت مەزهەبەکەیان بەڕاست بزانرێت، یان پۆزشی بۆ بهێنرێتەوە . بەڵکو ئەوانەی کە تەحقیقیان لەم مەسەلە کردووە دەڵێن نەخێر خیلافەکە لەفزی نییە و جەوهەری و سەرەکییە، چونکە:

١- جومهوری ئەهلی سوننەت لە لەفزو ڕواڵەت، لە واتا و ناوەڕۆكدا لەسەر كیتاب و سوننەتن، بەڵام مورجیئەی فوقەها لە واتاو ناوەڕۆكدا بەو شێوەن و لە ڕاڵەت و دەربڕیندا جیاوازن .موسوڵمانیش دەبێت ئەدەبی لەگەڵ دەقەكاندا هەبێت و بەڕواڵەت و بە ناوەڕۆك لێیان لانەدات.

٢- لە ڕاستیدا (مرجئة الفقهاء) بەو كارەیان دەرگایان لەسەر پشت بۆ مورجیئە پەتییەكان كردەوەو ڕێیان بۆ خۆشكردن، كاتێك كە وتیان عەمەل بەشێك نییە لە ئیمان هەرچی مورجیئەی تەواو وجەهمییەكان هەیە بەو بۆچوونە شادبوون و پشتیان پێی بەست.

٣- ئەوان دەرگایان بۆ هەرچی فاسق و كەسی خراپەكار هەیە كردەوە و بەهانەیان پێدان كە بڵێن ئێمە عارەق خۆر و خراپەكارین و ئیمانیشمان بەهێزەو وەكو هەر ئیمانداریكی ترین، بەڵكو بەپێی بۆچوونە نامۆكەی مورجیئەكان بیت ئیمان كەسێكی عارەق خۆر و ئیمانی أبو بكر و عمر اللە لێیان ڕازی بێت جیاوازی نییە، چونكە بەلای ئەوانەوە ئیمان هەر ئیمانە، یان هەیە، یان نییە.

٤- مورجیئەی فوقەها دەڵێن درووست نییە بڵێی من (إن شاء اللە) ئیماندارم، دەبێت بڵێی ئیماندارم بێ ئەوەی بڵێی( إن شاء اللە)، ئەمەی كە لە كتێبەكانی عەقیدەدا بە مەسەلەی ( الإستثناء في الإيمان) دەربڕینی لێ دەكرێت، چونكە بەلای ئەوانەوە وبەبەهانەی ئەوان، نابێت گومانت لە ئیمانی خۆت هەبێت.

بەڵام ئەهلی سوننەت لەم مەسەلەدا شیكردنەوەیان هەیە، دەڵێن لەلایەكەوە ئەبێت وابڵێین و لەلایەكەوە نابێت، ئەگەر مەبەستی ئەو كەسە گومان بێت لە

ئەسڵی ئیمانەکەیدا، ئەوە درووست نییە بڵێت (إن شاء الله)ئیمانـدارم .بەڵام ئەگەر مەبەستی ئەوە بێت ئیمان خۆی چەندین بەشە و بۆی هەیە ئەو کەسـە لە بەشـێك لە بەشەکانی ئیمانەکەیدا لاوازی ڕووی تێکردبێت لەو حاڵەتەدا درووستە بلێت إن شاء الله ئیمانـدارم، لە هەنـدێ حـاڵەتی تریشـدا درووسـتە (اسـتثناء) لە ئیمانـدا بکرێت .زانایان دەڵێن ئەمە یەکێکە لە بەروبوومەکانی جیاوازی لە نێوان ئەهلـی سوننەت و مورجیئەی فوقەهادا.

# نوێژنەکەر لەبازنەی ئیسلامدا نییە

پێشەوا أحمد بن حنبل بنەمایەکی تر لە بنەماکانی سوننەت ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێت: **(وَمَنْ تَرَكَ اَلصَّلَاةَ فَقَدْ كَفَرَ وَلَيْسَ مِنْ اَلْأَعْمَالِ شَيْءٌ تَرْكُهُ كُفْرٌ إِلَّا اَلصَّلَاةُ، مَنْ تَرَكَهَا فَهُوَ كَافِرٌ، وَقَدْ أَحَلَّ اَللَّهُ قَتْلَهُ).**

(وَمَنْ تَرَكَ اَلصَّلَاةَ فَقَدْ كَفَرَ ) ئاشکرایە کە پێشەوا أحمد نوێژنەکەری بەکافر زانیوە بەبێ کارکردن بەو شیکردنەوەی کە هەندێك لە زانایان دەیکەن کە جیاوازییان کردووە لە نێوان ئەوەی نویژنەکەر نکۆڵی لە فەرزبوونی بکات یان بەتەمەڵی نەیکات و باوەڕی بە فەرزبوونی هەبێت، ئەو یەکسەر فەرموویەتی هەرکەسێك نوێژ تەرك بكات ئیتر لە بازنەی ئیسلام دەچێتە دەرەوە.

هۆکاری ئەوەی کە پێشەوا أحمد بە کافردانانی نوێژنەکەری کردووەتە بنچینەیەك لە بنچینەکانی ئەهلی سوننەت ئەوەیە فەرموودەیەکی صحیح ی زۆر هاتووە کە ئەو حوکمە بەسەر نوێژنەکەردا دەدات، جگە لە چەندین ئایەتیش کە ڕواڵەتەکانیان یان ئەو حوکمەی کە لێیان وەردەگیردرێت دەربارەی نوێژنەکەر هەمان حوکمە، بۆ نموونە:

- (فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِۗ ) التوبة:١١.

واتە برایەتی ئیسلام لەسەر نوێژکردن ڕاوەستاوە کەسێك نوێژ نەکات برای دینیت نییە، ئەوەش حوکمە بە دەرچوونی نوێژنەکەر لە ئیسلام.

- (فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ ۚ ) التوبة:٥. ئەمەش هەمان حوکمی ئایەتی پێشتری لێ وەردەگیردرێت.

- پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم فەرموویەتی: (بينَ الرجلِ وبينَ الشركِ والكفرِ تركُ الصلاةِ) مسلم: (٨٢). واته لە نێوان کەسێك و کافربوونی یان موشریك بوونیدا ئەوەیە کە واز لە نوێژکردن بهێنێت.

- پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم فەرموویەتی: (العهدُ الذي بينَنا وبينَهم الصلاةُ، فمَن ترَكَها فقد كفرَ) [1]واتای فەرموودەکە ڕوونە کە پەیمانی نێوان موسوڵمانان و بێباوەڕان نوێژە هەرکەسێك واز لە نوێژ بهێنێت ئەو پەیمانەی شکادووە.

- عبد الله بن شقيق العقيلي فەرموویەتی: (كان أصحاب محمد صلى الله عليه وسلم لا يرون شيئا من الأعمال تركه كفر غير الصلاة) [2]واته: هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم نەکردنی هیچ کردەوەیەکیان بە کوفر نەدەزانی جگە لە نوێژ نەبێت، واته هەرکەسێك نوێژی نەکردایە بە موسوڵمانیان نەدەزانی.

پێشەوا البغوي لە کتێبی شرح السنة (١/١٧٩) دا فەرموویەتی: زانایان جیاوازییان لە نێواندا هەیە سەبارەت بە حوکمی نوێژنەکەر ، زۆرێك لە زانایان و لە هاوەڵانیش بە ڕاشکاوی نوێژنەکەریان بە کافر زانیوە، بەڵام هەندێ زانای تریش نوێژنەکەریان لە حاڵەتێکدا بە کافر زانیوە ئەگەر نکۆڵی لێ بکات و(جحود)ی

(١) الترمذي (٢٦٢١)، والنسائي (٤٦٣)، وابن ماجه (١٠٧٩)، وأحمد (٢٢٩٨٧).
(٢) الترمذي (٢٦٢٤).

فەرزبوونی بکات، ئەگینا ئەگەر باوەڕی بەفەرزبوونی هەبێت و لە تەمەڵـی نەیکـات ئەوە پێی کافر نابێـت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا لەو کـاتەی ئیسـلام حـوکمی کـردووە نوێژنەکەر بەتەمەڵـیش نـوێژی نەکردبێـت حـوکمی زۆر قورسـی لەسـەر دەرکـراوە لەلایەن زانایانەوە کە ئەگەر بەردەوام بوایە لەسـەر نەکردنـی حـوکمەکەی - ئەگەر تەنها لە ڕووی نەزەریشەوە بوایە- دەگەشتە کوشتن.

بەڵام بەهەر حـاڵ نکـۆڵی لەوە ناکریـت ئەم مەسـەلەیەکی خیلافیـیە لە نێوان زانایاندا و لەسەر ئاسـتی کەسـانی وەکـو شـافیعی و ئەحـمەد قسـەوباس و مشتومڕی زانستی لەسەر کراوە.

پوختەی خیلافەکەش ئەوەیە کە هەنـدێ لە گەورە زانایـانی ئیسـلام فەرموویـانە ئەگەر ئەو کەسەی نوێژی تەرك کردووە باوەڕی بەواجب بوونی هەبێت و بڵێت مـن شـایانی سـزام لەسـەر ئەم نـوێژنەکردنەم، بەڵام مـن لەبەر تەمەڵـی نـایکەم، لەو حاڵەتەدا پێی کافر نابێت، بەڵام پێشەوا أحمد بن حنبل بەڕەحمەت وەکو لێرەدا لە قسەکەیدا دەردەکەوێت لەو حاڵەتەشدا نوێژنەکەری هەر بە کافر دانـاوە، هەروەهـا وا دەردەکەوێت کۆدەنگی هاوەڵانیش لەسەر ئەوەیە وەکـو لە کتێبـی (تعظـیم قـدر الصلاة)ی المروزی دا هاتووە.

شـایانی باسیشـە کە زۆرێـك لە زانایـانی (متـأخرین) لە ئەهلـی مەزاهیبەکـان نوێژنەکەریان بە کافر نەزانیوە ئەگەر بە هۆکاری تەمەڵـی نەیکـات وکوفرەکەیـان بە کوفری بچووك داناوە، بەڵام - وەکو هەندێ لە زانایان فەرموویـانە - کاتێـك کە لەو مەسەلە دەکۆڵیتەوەو دەچیتە سەر بەڵگەکانی کیتاب و سـوننەت دەبینـی بۆچـوونی

یەکەم کە جیاوازی نەکردووە لە هۆکاری نوێژنەکردنەکە و بەپەهایی نوێژنەکەری لە بازنەی ئیسلام دەرکردووە بەهێزترە و اللە اعلم ئەوەیان ڕاستترە و زیاتر لەگەڵ بەڵگەکانی کیتاب و سوننەتدا دێتەوە و پێشەوا أحمد یش ئەو بۆچوونەی هەڵبژاردووە. (١)

ئەگەرچی نکۆڵی لەوە ناکرێت کە ئەو خیلافە لە نێوان زانایاندا لەسەر ئەو باسە بوونی هەیە و واجبی دادگەری لە گواستنەوەی بیروبۆچوونەکاندا دەیسەپێنیت کە باسی ئەو بۆچونەش بکەم، ، بەڵام من وەکو خۆم ئەو خیلافە بە خیلافێکی موعتەبەر نازانم وشافیعی وهەموو ئەوانەی کە تارک الصلاة یان تەکفیر نەکردووە

(١) بارك الله فیكم هیچ بەڵگەیەکمان نیە لەسەر ئەوەی کوفری تارك الصلاة لەو جۆرە کوفرەیە کە لە بازنەی إسلام پێی دەرناچیت .

بەنمونە دەزانین کوفری قاتل لەو جۆرە کوفرەیە بەبەڵگەی ناوهێنانی قاتل بە برای بڕوادار لە قورئاندا و ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قاتل کافر نیە چونکە تەنها بڕواداران برای یەکترن . بەڵام کوانێ بەڵگە لەسەر ئەوەی کوفری تارك الصلاة لەم جۆرە کوفرەیە هیچ عیللەتێکی نیە.

وەڵام/ منیش هەر وا تێگەیشتووم وباوەڕم بەو بۆچوونە هەیە کە نویژنەکەر بەهەر هۆکارێك نوێژنەکات هەر لە ئیسلام پێی دەدرەچێت و لە نووسینەکەشدا هەر ئەوەم پشتگیری کردووە و بەڕاستم زانیوە کە ئیمام أحمد بە ڕاستی زانیوە..بەڵام خیلافەکە بمانەوێت و نەمانەوێت هەیە وکەسانی وەکو شافیعی ڕای جیاوازیان هەیە لەو بارەوە وهەندێ بەڵگەشی لەسەر دەهێننەوە، من عادەتم وایە لە نووسیندا هەموو بۆچوونەکان عەرز دەکەم و هیچی ناشارمەوە، ، بەڵام وەکو خۆم بە یەقین و بەقەناعەتەوە لەگەڵ قسەکەی ئیمام أحمد م بەرەحمەت بێت چونکە بەڵگەکانی لە قورئان و سوننەتیشدا زۆر ڕاشکاوو بەهیزن.

ئەگەر بە تەمەڵی نەیکات بە هەڵە دەزانم ودەڵێم ڕاستیان نەپێکاوە چونکە بەڵگەکان بە ئـایەت وفەرموودەکانـدا لەو بـارەوە ڕوون وئاشـکران کە نـوێژنەکەر لە بـازنەی ئیسلام دەردەچێت بەدەر لەوەی بە جحود یان تەمەڵی نەیکردووە. [1]

---

(١) کاك دکتۆر ئێستا بابەتی تەکفیـری ئەو کەسـەی؛ کەوا تەکفیـری (تـارك الصـلاة) ناکـات لەلایەنی کۆمەڵەیەك موسڵمانەوە، دەڵێن: مادام تۆ کەسێك بەلاوە کـافر نیـیە کە(تـارك الصـلاة) تەکفیر ناکات، کەواتە ئێوە کافر و موشریکن وەلا کەڕامە.

دەڵێین: کوا ئیمامی احمد شافیعی کافر کردووە!؟

دەڵێن: هەر بۆ خۆی هەموو کتێبێك بتێکە ئەو خەڵکەی ئەو سەردەمە پێی موبتەلا بوونە، وەئیلا کتێب هەموو درۆیە غەیری قورئان و فەرموودە.

مەبەستم بەکورتی: لە سـەلەف مامەڵەیـان لەگەڵ کەسـێك تـارك الصـلاة وەك یەك بـووە لەگەڵ کەسێك بڵێت قورئان مەخلوقە؟

لەبەر خەڵکانێك قاعیدەی ئەم بابەتی قورئان مەحلوقە دێنـنەوە کەوا کـوفرەکەی هـاتووە بەڵام وەك تارك الصلاة بە ڕوونی نەهاتووە.

وەڵام/ تارك الصلاة بە جحود بێـت وبە تەمەڵـی جیاوازیـان نیـیە و ئـایەت وفەرموودەکـان لەو بارەوە ڕوونە وئاشکرایە، بۆچوونی ئەو زانایـانەش کە دەڵـێن ئەگەر بە تەمەڵـی نەیکـات کـافر بۆچوونێکی بێ بەڵگەو ناپەسەندە،بەڵام من خیلافەکە نەقڵ دەکەم، شـافیعیش نەک بە کـافری نازانم بەڵکو بە پێشەوایەکی گەورەی ئیسلامی دەزانم بەڵام لە بەر ئەوەی معصوم نییە و مـرۆڤە و هەلە دەکـات، مەسـەلەی تەکفیـر نەکردنـی بـۆ تـارک الصـلاة ئیجتیهـادی کـردووە و نەیپێکاوە...ناگونجێت و بێ ئەدەبیە بەرانبەر زاناکان بڵێـین کتێبەکانیـان بـێ سـوودن و بـتن و دەپرسترێن، ئەوە قسەیەکی نابەجێیە، بەڵکە دەبێت بڵێـین کتێبـی هەمـوو زانـایەك لە ڕۆشـنایی کیتاب و سـوننەتدا وەردەگیرێـت و ڕەتـدەکرێتەوە، زاناکـان قسـەیان تـاکو بەڵـگەی کیتـاب و سوننەتی لەسەر نەبێت وەرناگیرێت و خۆیان بۆ خۆیان بەڵگە نین، (کلام العلماء یستدل لها ولا یستدل بها) بارک الله فیک.

## أبو بکر و عمر و عثمان الله لێیان ڕازی بێت چاکترینی ئەم ئوممەتەن لەپاش پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم

پێشەوا أحمد بن حنبل لە ڕوونکردنەوەی بنەمایەکی تر لە بنەماکانی ئەهلی سوننەتدا، عەقیدەی ئەهلی سوننەت دەربارەی هاوەڵان باس دەکات و دەفەرموێت: **(وَخَيْرُ هَذِهِ اَلْأُمَّةِ بَعْدَ نَبِيِّهَا أَبُو بَكْرٍ اَلصِّدِّيقُ، ثُمَّ عُمَرُ بْنُ اَلْخَطَّابِ، ثُمَّ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ نُقَدِّمُ هَؤُلَاءِ اَلثَّلَاثَةَ كَمَا قَدَّمَهُمْ أَصْحَابُ رَسُولِ اَللَّهِ صلى الله عليه و سلم، لَمْ يَخْتَلِفُوا فِي ذَلِكَ)** مەسەلەی پێش خستنی ئەو سێ هاوەڵە بەڕێزە لەسەر هەموو هاوەڵانی تر لەلای ئەهلی سوننەت مەسەلەیەکی بڕاوەیە و پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم خۆی ئەو بنەمایەی دامەزراندووە و أبو بکر الله لێی ڕازی بێت چاکترین کەسەو باشترینی ئەم ئوممەتەیە لە دوای پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم.

بەڵام هەندێ لە زانایان دەڵێن لەبەر ئەوەی لە کۆتایی دونیادا عیسی علیه السلام دادەبەزێت و ئەویش دەبێتە یەکێك لە ئوممەتی پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم لەو حاڵەتەدا دەبێت بوترێت چاکترین کەس لە ئوممەتی ئیسلام لە پاش رسول الله صلی الله علیه وسلم عیسای کوڕی مەڕیەمە علیهما السلام وبەدوای ئەودا ئەبوبەکرە الله لێی ڕازی بێت.

کەواتە چۆن هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم ئەو سێ هاوەڵەیان پێشخستە سەر هەموو هاوەڵاندا الله لێیان ڕازی بێت، بەهەمان شێوە دەبێت ئێمەش ئەو کارە بکەین.

له دوای ئەوه پێشەوا فەرمـوویەتی: (ثُـمَّ بَعْـدَ هَـؤُلَاءِ اَلثَّلَاثَـةِ أَصْـحَابُ اَلشُّـورَى اَلْخَمْسَةُ: عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، وَطَلْحَةُ، وَالزُّبَيْرُ، وَعَبْـدُ اَلـرَّحْمَنِ بْـنُ عَـوْفٍ، وَسَـعْدٌ، كُلُّهُمْ يَصْلُحُ لِلْخِلَافَةِ، وَكُلُّهُمْ إِمَامٌ،) واته دوای پێشخستنی أبـو بکـر و عمـر وعـثمان اللـه لێیـان ڕازی بێـت، ئینجـا ئەوانەی پێیـان دەوترێـت أصـحاب الشـوری پـێش دەخەین کە یەکەمیان عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِب و ئینجا طَلْحَةُ، وَالزُّبَيْرُ، وَعَبْدُ اَلرَّحْمَنِ بْـنُ عَوْفٍ، وَسَعْدٌ، الله له هەموویان ڕازی بێت، هەمـوو ئەوانەش وەکـو پێشـەوا أحمـد دەفەرموێت شیاو بوون بۆ وەرگرتنی خیلافەت وهەموو یەکێك لەوانە پێشەوایەکە له پێشەوایانی ئیسلام و موسوڵمانان.

پاشان فەرمووی: (وَنَذْهَبُ فِي ذَلِكَ إِلَى حَدِيثِ اِبْنِ عُمَرَ: "كُنَّا نَعُدُّ وَرَسُـولُ اَللَّـهِ صلى الله عليه و سلم حَـيٌّ وَأَصْـحَابُهُ مُتَـوَافِرُونَ أَبُـو بَكْـرٍ ثُـمَّ عُمَـرُ ثُـمَّ عُـثْمَانُ ثُـمَّ نَسْـكُتُ")(١). واته: لەم بنەمـایەدا پشـت بەو فەرمـوودەی ابـن عمـر دەبەسـتین کە فەرموویەتی لەو کاتەی پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم له ژیاندا بوو دەمـانوت أبـو بکر و عمر وعثمان و ئیتر بێ دەنگ دەبووین وناوی کەسـی ترمـان لەگەڵ ئەو سـێ کەسه نەدەبرد.

له پاش ئاماژه کردن بۆ ناوی ئەو سێ هاوەڵه و هێنـانەوەی فەرمـوودەکەی ابـن عمر الله لێی ڕازی بێت لەو بارەوه ئینجا فەرمووی: (ثُمَّ مِنْ بَعْدِ أَصْحَابِ اَلشُّـورَى أَهْلُ بَدْرٍ مِنْ اَلْمُهَاجِرِينَ، ثُمَّ أَهْلُ بَدْرٍ مِنْ اَلْأَنْصَارِ مِنْ أَصْـحَابِ رَسُـولِ اَللَّـهِ صـلى

(١) البخاري (٣٦٥٥)، أحمد (٢/١٤).

الله علیه و سلم عَلَى قَدْرِ اَلْهِجْرَةِ وَالسَّابِقَةِ، أَوَّلًا فَأَوَّلًا،) واتە لە پاش ئەو سێ هاوەڵە بەڕێزە ئینجا ئەهلی شورامان بە باشترین دەزانی کە یەکەمیان عەلی بوو الله لێی ڕازی بێت، وەکو ابن تیمیة فەرموویەتی بەڕەحمەت بێت (یثلثون بعثمان ویربعون بعلي) [1]واتە عثمان یان دەکردە سێیەم لە دوای أبو بکر و عمر و عەلییان دەکردە چوارەم الله لە هەموویان ڕازی بێت.

سەلەف هەندێ جیاوازی لە نێوانیاندا بووە سەبارەت بە پێشخستنی عثمان لەسەر علي، بەڵام ئەوە لە ڕووی فەزیلەت و چاکەوە بووە نەك لە ڕووی خیلافەتەوە، لەمەسەلەی شیاوی بۆ خیلافەت هەموویان عثمان یان پێش علي خستووە الله لێیان ڕازی بێت، بەڵکو زۆربەیان و جومهوریان لە فەزیلەت و چاکیشدا هەر عثمان یان پێشخستووە.

ئینجا هەرکێ عەلی پێش عثمان خستبێت بە ضال و بە گومڕایان زانیوە، وەکو ابن تیمیة فەرموویەتی: (وقال أيوبُ السَّختيانيُّ: من لم يُقَدِّمْ عُثمانَ عَلى عليٍّ فقد أزرى بالمُهاجِرينَ والأنصارِ. وهَكَذا قال أحمَدُ والدَّارقُطنيُّ وغَيرُهما: أنَّهم اتَّفَقوا عَلى تَقديمِ عُثمانَ) [2]واتە هەرکێ عەلی پێش عثمان بخات ئەوە سووکایەتی بە ڕاوبۆچوونی موهاجیرین کردووە.

---

(١) الفتاوى (٣/١٥٣).

(٢) منهاج السنة، (٨/٢٢٥).

ئەتوانین بڵێین ئوممەتی ئیسلام تەنـانەت زۆرێـك لە تاقمەکـانی کەلام و گـروپە لادەرەکانیش یەك دەنگ بوونە لەسەر چوار خەلیفەکە بەو تەرتیبەی کە هەیە، واتە: أبو بکر ئینجا عمر ئینجا عثمان ئینجا علي الله لە هەموویان ڕازی بێت.

پێشەوا النووي دەڵێت: : (اتَّفَقَ أهلُ السُّنَّةِ عَلى أنَّ أفضَـلَهم أبـو بَكْـرٍ ثُـمَّ عُمـرُ، وقال جُمهورُهم: ثُـمَّ عُـثمانُ، ثُـمَّ عـليٌّ) [١]واتە ئەهلـی سـوننەت یەك دەنـگ بـوونە لەسەر پێشخستن و بەچاکتر زانینی أبـو بکـر و ئینجـا عمـر و زۆربەیـان وتوویـانە عثمان ئینجا علي.

پێشەوا ابنُ تيميَّةَ فەرموویەتی: (أمَّا تَفضيلُ أبي بَكْرٍ ثُمَّ عُمـرَ عَـلى عُـثمانَ وعَـليٍّ فهَذا مُتَّفَقٌ عليـه بَـينَ أئِمَّـةِ المُسْـلِمينَ المَشـهورين بالإمامـةِ في العِلـمِ والـدِّينِ مِـنَ الصَّحابةِ والتَّابِعين وتابِعَيهم، وهوَ مَذهَبُ مالكٍ وأهْلِ المَدينةِ، واللَّيثِ بنِ سَعدٍ وأهْلِ مِصرَ، والأوزاعيِّ وأهلِ الشَّامِ، وسُفيانَ الثَّوريِّ، وأبي حَنيفةَ، وحَمَّادِ بنِ زَيدٍ، وحَـمَّادِ بنِ سَلَمةَ وأمثالِهم من أهلِ العِراقِ، وهوَ مَذهَبُ الشَّافِعيِّ، وأحمَـدَ، وإسـحاقَ، وأبي عُبَيدٍ، وغَيرِ هَؤُلاءِ مِنَ الأئِمَّةِ) منهاج السنة، (٢٢٥/٨). واتە پێشخسـتنی ئەو چـوار هاوەڵە بەو تەرتیبە ئەوە یەکدەنگی زانایانی لەسەرە.

ئەمەش ناوی هەنـدێ لە زانایـانی ئیسـلامە بە پێـی بەدواداچـوونی هەنـدێ لە ئەهلـی عـیلم لەم بـارەوە کە هەموویـان دەڵـێن کـۆدەنگی ئـوممەت لەسـەر ئەوەیە خیلافەت پاش پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم بۆ أبو بکر و عمر وعثمان و عـلي یە

(١) شرح مسلم، (١٤٨/١٥).

اللـه لێیـان ڕازی بێـت بەو شـێوازەی کە هەیە وهەموویـان ئەم واتـایە دوو پـات دەکەنەوە:

١- أبو حَنيفة : (نُقِرُّ بأنَّ أفضَلَ هَذِه الأُمَّةِ بَعدَ نَبِيِّنا مُحَمَّدٍ صلَّى اللهُ عليـه وسـلَّم: أبو بَكرٍ الصِّدِّيقُ، ثُمَّ عُمرُ، ثُمَّ عُثمانُ، ثُمَّ عليٌّ، رِضـوانُ اللـهِ علـيهِم أجمَعـينَ؛ لِقَولـِه تعـالى: وَالسَّابِقُونَ السَّابِقُونَ * أُولَئِكَ الْمُقَرَّبُونَ * فِي جَنَّـاتِ النَّعِـيمِ [الواقعـة: ١٠-١٢] ، وكُلُّ مَن كانَ أسبَقَ فهوَ أفضَلُ، ويُحِبُّهم كُلُّ مُؤمِنٍ تَقِـيٍّ، ويُبغِضُـهم كُـلُّ مُنافِقٍ شَقِيٍّ) (١).

٢- الشَّافِعيُّ: (أفْضَلُ النَّاسِ بَعدَ رَسولِ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسـلَّم: أبـو بَكْـرٍ، ثُـمَّ عُمرُ، ثُمَّ عُثمانُ، ثُمَّ عليٌّ، رِضوانُ اللهِ عليهِم) (٢)

٣- عَبدُ اللهِ بنُ أحمَدَ بنِ حَنبَلٍ: (سَمِعتُ أبي يَقـولُ: أمَّـا التَّفضـيلُ فـأقولُ: أبـو بَكْرٍ، ثُمَّ عُمرُ، ثُمَّ عُثمانُ، ثُمَّ عَليٌّ) (٣)

٤- المُزَنيُّ: (يُقالُ بفَضلِ خَليفةِ رَسولِ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم أبي بَكرٍ الصِّـدِّيقِ رَضِيَ اللهُ عنه؛ فهوَ أفضَلُ الخَلقِ وأخيرُهم بَعدَ النَّبيِّ صلَّى اللهُ عليه وسـلَّم، ونُثنِّـي بَعدَهُ بالفاروقِ، وهوَ عُمرُ بنُ الخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عنه، فهُما وزيـرا رَسـولِ اللـهِ صـلَّى اللهُ عليه وسلَّم، وضَجيعاهُ في قَبرِهِ، وجَلِيساهُ في الجَنَّةِ، ونُثَلِّثُ بَذي النُّورَينِ عُـثمانَ

(١) شرح وصية الإمام أبي حنيفة للبابرتي (ص ١٤٣).

(٢) مناقب الشافعي للبيهقي، (٤٣٣/١).

(٣) السنة، (٥٧٣/٢).

بنِ عَفَّانَ رَضِيَ اللهُ عنه، ثُمَّ بِذِي الفَضلِ والتُّقى عَليٍّ بن أبي طالِبٍ، رَضِيَ اللهُ عنهم أجمَعينَ، ثُمَّ الباقينَ مِنَ العَشَرةِ الَّذينَ أوجَب لهم رَسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم الجَنَّةَ، ونُخلِصُ لِكُلِّ رَجُلٍ منهم مِنَ المَحَبَّةِ بقَدْرِ الَّذي أوجَبَ لهم رَسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم مِنَ التَّفضيلِ، ثُمَّ لِسائِرِ أصحابِه مِن بَعدِهِم، رَضِيَ اللهُ عنهم أجمَعينَ)(١).

٥- حَربٌ الكَرْمانيُّ: (خَيرُ هَذِه الأُمَّةِ بَعدَ النَّبيِّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم أبو بَكرٍ، وخَيرُهم بَعدَ أبي بَكرٍ عُمرُ، وخَيرُهم بَعدَ عُمرَ عُثمانُ. وقال قَومٌ من أهلِ العِلمِ وأهلِ السُّنَّةِ: وخَيرُهم بَعدَ عُثمانَ عَليٌّ. ووَقَفَ قَومٌ عَلى عُثمانَ، وهم خُلفاءُ راشِدون مَهْديُّونَ) (٢)

٦- أبو الحَسَنِ الأشعَريُّ كاتێك باسی عەقیدەی سەلەفی کردووە دەڵێت:: (ويُقَدِّمونَ أبا بَكْرٍ، ثُمَّ عُمرَ، ثُمَّ عُثمانَ، ثُمَّ عَلِيًّا، رِضوانُ اللهِ عليهِم، ويُقِرُّونَ أنَّهم الخُلفاءُ الرَّاشِدونَ المَهْدِيُّونَ، أفْضَلُ النَّاسِ كُلِّهِم بَعدَ النَّبيِّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم)(٣)

٧- ابنُ أبي زَيدٍ القَيروانيُّ: (أفْضَلُ الأمَّةِ بَعدَ نَبيِّها أبو بَكرٍ، ثُمَّ عُمرُ، ثُمَّ عُثمانُ، ثُمَّ عليٌّ) (٤)

---

(١) شرح السنة، (ص ٨٥).

(٢) إجماع السلف في الاعتقاد، (ص ٧٠).

(٣) مقالات الإسلاميين، (١/٢٢٨).

(٤) الجامع في السنن والآداب والمغازي والتاريخ، (ص ١١٥).

٨- أبو عَمْرٍو الدَّاني: (أفْضَلُ الأربَعةُ: أبو بَكْرٍ ثُمَّ عُمرُ ثُمَّ عُـثمانُ ثُـمَّ عـليٌّ رَحمـةُ اللهِ عليهِم أجمَعينَ) [١]

٩- عِياضٌ: (المَشهورُ عن مالِكٍ وسُفيانَ، وكافَّةِ أئِمَّةِ الحَديثِ والفُقَهاءِ، وكَثيرٍ مِنَ المُتَكَلِّمينَ: تَرتيبُ الأربَعةِ في الفَضلِ حَسَبَ تَرتيبِهِم في الخِلافةِ) [٢]

١٠- يَحيى العمرانيُّ: (مَراتِبُ الخِلافةِ في الصَّحابةِ رَضِيَ اللهُ عـنهم كـما وقَعَـت: أبو بَكْرٍ ثُمَّ عُمـرُ ثُـمَّ عُـثمانُ ثُـمَّ عـليٌّ رَضِيَ اللـهُ عـنهم... وأنَّ مَـراتِبَهم في الفَضْـلِ كمَراتِبِهم في الخِلافةِ) [٣]

١١- عَبدُ الغَنيِّ المَقدِسيُّ: (نَعتَقِدُ أنَّ خَيرَ هَـذِه الأمَّـةِ وأفضَـلَها بَعـدَ رَسـولِ اللـهِ صلَّى اللهُ عليـه وسـلَّم صـاحِبُه الأخَـصُّ، وأخـوهُ في الإسـلامِ، ورَفيقُـهُ في الهِجْـرةِ والغارِ: أبو بَكرٍ الصِّدِّيقُ، وزيرُهُ في حَياتِه، وخَليفَتُهُ بَعدَ وفاتِه، عَبـدُ اللـهِ بـنُ عُـثمانَ عَتيقُ بنُ أبي قُحافةَ، ثُمَّ بَعدَهُ الفاروقُ أبو حَفصٍ عُمرُ بنُ الخَطَّابِ، الَّذي أعَـزَّ اللـهُ به، وأظهَرَ الدِّينَ. ثُمَّ بَعدَهُ ذو النَّورَينِ أبو عَبْدِ اللـهِ عُـثمانُ بـنُ عَفَّـانَ، الَّـذي جَمَـعَ القُرآنَ، وأظهَرَ العَدْلَ والإحسانَ، ثُمَّ ابنُ عَمِّ رَسولِ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم وخَتَنُـهُ عـليُّ بـنُ أبي طالِـبٍ، رِضـوانُ اللـهِ علـيهِم، فهَـؤُلاءِ الخُلفـاءُ الرَّاشِـدونَ والأئِمَّـةُ المَهْدِيُّونَ)[٤]

---

(١) الرسالة الوافية، (ص ٢٣٩).

(٢) إكمال المعلم، (٧/ ٣٨٢).

(٣) الانتصار في الرد على المعتزلة القدرية الأشرار، (١٠١/١).

(٤) الاقتصاد في الاعتقاد، (ص ١٩٨).

١٢- ابنُ الصَّلاحِ: (أفضَلُهم عَلى الإطلاقِ: أبو بَكْرٍ ثُمَّ عُمرُ، ثُمَّ إنَّ جُمهورَ السَّلَفِ عَلى تَقديمِ عُثمانَ عَلى عَليٍّ) (١)

١٣- ابنُ تيميَّةَ: (أمَّا جُمهورُ النَّاسِ ففَضَّلوا عُثمانَ، وعليه استَقَرَّ أمرُ أهلِ السُّنَّةِ، وهوَ مَذهَبُ أهلِ الحَديثِ ومَشايخِ الزُّهدِ والتَّصَوُّفِ وأئِمَّةِ الفُقَهاءِ؛ كالشَّافِعيِّ وأصحابِه، وأحمَدَ وأصحابِه، وأبي حَنيفةَ وأصحابِه، وإحدى الرِّوايَتينِ عن مالِكٍ وعليها أصحابُه... وهوَ أيضًا مَذهَبُ جَماهيرِ أهلِ الكَلامِ: الكَرَّاميَّةُ والكُلَّابيَّةُ والأشعَريَّةُ والمُعتَزِلةُ. وقال أيوبُ السَّختيانيُّ: من لم يُقَدِّمْ عُثمانَ عَلى عليٍّ فقد أزرى بالمُهاجِرينَ والأنصارِ. وهَكَذا قال أحمَدُ والدَّارقُطنيُّ وغَيرُهما: أنَّهم اتَّفَقوا عَلى تَقديمِ عُثمانَ) (٢)

١٤- ابنُ كثيرٍ: (هَذا رَأيُ المُهاجِرينَ والأنصارِ. حينَ جَعل عُمرَ الأمرَ من بَعْدِه شورى بَينَ سِتَّةٍ، فانحَصَرَ في عُثمانَ وعَليٍّ، واجتَهَدَ فيهما عَبدُ الرَّحمَنِ بنُ عَوفٍ ثَلاثةَ أيَّامٍ بلياليها، حَتَّى سَألَ النِّساءَ في خُدورِهِنَّ، والصِّبيانَ في المَكاتِبِ، فلَم يَرهُم يَعدِلونَ بعُثمانَ أحَدًا، فقَدَّمَهُ عَلى عَليٍّ، ووَلَّاهُ الأمرَ قَبْلَهُ؛ ولِهَذا قال الدَّارقُطنيُّ: من قَدَّمَ عَلِيًّا عَلى عُثمانَ فقد أزرى بالمُهاجِرينَ والأنصارِ. وصَدَقَ رَضِيَ اللهُ عنه) (٣)

---

(١) مقدمة ابن الصلاح، (ص: ٤٠١).

(٢) منهاج السنة، (٨/٢٢٥).

(٣) اختصار علوم الحديث، (ص: ١٨٣).

هەروەها فەرموویەتی: (أفْضَلُ الصَّحابةِ، بَل أفْضَلُ الخَلْقِ بَعدَ الأنبياءِ عليهِمُ السَّلامُ: أبو بَكْرٍ... ثُمَّ من بَعدِه عُمرُ بنُ الخَطَّابِ ثُمَّ عُثمانُ بنُ عَفَّانَ ثُمَّ عليٌّ بنُ أبي طالِبٍ) (١)

١٥- ابنُ أبي العِزِّ: (تَرتيبُ الخُلَفاءِ الرَّاشِدينَ رَضِيَ اللهُ عنهم أجمَعينَ في الفَضلِ كتَرتيبِهم في الخِلافةِ) (٢)

١٦- قال ابنُ حَجَرٍ: (قَد سَبَقَ بَيانُ الاِختِلافِ في أيِّ الرَّجُلين أفضَلُ بَعدَ أبي بَكْرٍ وعُمرَ: عُثمانُ أو عَليٌّ؟ وأنَّ الإجماعَ انعَقَدَ بأُخَرة بَينَ أهلِ السُّنَّةِ أنَّ تَرتيبَهم في الفَضلِ كتَرتيبِهم في الخِلافةِ، رَضِيَ اللهُ عنهم أجمَعينَ)(٣).

ئەمەی کە لەسەرەوە زانایان ئاماژەیان پێ کردووە کۆدەنگ و کۆك بوونی ئوممەتی ئیسلامە لەسەر خەلیفە {اشیدەکان یەك بەدوای یەکدا بەو شێوە وکەس ناکۆك نەبووە لەم مەسەلەدا جگە لە ڕافیزە نەبێت، ڕای ئەوانیش بۆ ئێمەی ئەهلی سوننەت ئاوڕی لێ نادرێتەوە چونکە بەڕاشکاوی پێچەوانەی قورئان و سوننەت و سیرەی پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم و هاوەڵانە الله لێیان رازی بێت.

ئەوەی پێشەوا أحمد لەم بەشەی بنەماکاندا باسی کردووە ئەوەیە: لە پلەی یەکەمدا سێ هاوەڵەکەی داناوە: أبو بکر و عمر وعثمان. لە دوای ئەوان ئەوەی دەمێنیتەوە لە دە هاوەڵە مژدە پێدراوەکان بەبەهەشتی باس کردووە. لە دوای ئەوان

(١) شرح الطحاوية، (٢/ ٧٢٧).

(٢) فتح الباري، (٣٤/٧).

(٣) فتح الباري, (٣٤/٧).

ئەهلی بەدەر لە موهاجیرین و ئەهلی بەدر لە ئەنسارەکان و ئینجا هاوەڵانی تر اللـه لە هەموویان ڕازی بێت.

ئەهلـی سـوننەت یەك دەنگـن کە هـاوەڵان خەڵکێکـی تـایبەتن و پـلەو پـایەی بەرزیان لە هاوەڵێتی پێغەمبەرەکەیانەوە صلی الله علیه و سـلم وەرگرتـووە و ئەوان بەختەوەرترین کەسانێکن بە شەفاعەتی پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم و هەروەهـا یەك دەنگـن لەسـەر ئەوەی قسـە نەکرێـت دەربـارەی ئەو فیتـنەو شـەڕەی کە لە نێوانیاندا درووست بووە ودەبێت لەو بارەوە بێ دەنگ بین.

هەروەهـا لە قسـەکانی ئـیمام ئەحـمەد بە ڕەحـمەت بێـت ئەوە وەردەگیرێـت کە هاوەڵێتی بە دانیشتنی ساتێکی کەمی ئەو کەسە بە ئیماندارییەوە لە گەڵ پێغەمـبەردا صلی الله علیه و سلم درووست دەبێت ودادەمەزرێت.

هەروەهـا ئەوەش وەردەگیرێـت لە قسـەکانی کە کـام لە هـاوەڵان کەمـترین پلەوپـایەی هەبێـت بەراورد بەوانــی تـر، بەو حاڵەشـەوە هەر پلەوپـایەی بەرزەو لەوانەی دوای خۆیـان باشـترە لە تـابیعین ئەگەر هەرچەنـد کـاری چاکەشـی زۆر ئەنجام دابێت ئەو تـابیعییە. چـونکە شـەرەف و پلەوپـایەی بەرزی هـاوەڵێتی هـیچ شەرەف و پلەو پایەوپێگەیەکی تری پێناگات، لەوانەشە هەندێك لە تابیعین هەبن لە ڕووی زانستەوە لە متأخرین ی هـاوەڵان زانـاتر بـن، بەڵام ئەوە پلەیـان بـۆ ئاسـتی ئەوان هەرگیز بەرز ناکاتەوە.

پێشەوا أحمد دوای ئەوەی ئەو بنەمایانەی وەکو عەقیـدەی ئەهلـی سـوننەت و جەمــاعەت دەربــارەی هــاوەڵان و خەلیفەکــان بەتــایبەت خســتەڕوو، ئینجــا

فەرموویەتی: (ثُمَّ أَفْضَلُ اَلنَّاسِ بَعْدَ هَؤُلَاءِ أَصْحَابُ رَسُولِ اَللَّهِ صلی الله علیه و سلم ، اَلْقَرْنُ اَلَّذِي بُعِثَ فِيهِمْ. ) مەبەستی لە دە هاوەڵەکان و ئەوانەیە کە ئامادەی جەنگی بەدر و الحديبية بوون.

پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم فەرموویەتی: (لا تَسُبُّوا أصْحابِي؛ فلوْ أنَّ أحَدَكُمْ أنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا، ما بَلَغَ مُدَّ أحَدِهِمْ ولا نَصِيفَهُ) [(١)]واتە: جنێو وسوکایەتی بە هاوەڵانم مەکەن، چونکە ئەگەر بە ئەندازەی کێوی ئوحود زێڕ ببەخشن بە خێرو پاداشتی مشتێك لەوەی هاوەڵانم دەیبەخشن ناگەن. چونکە ئەوان پێشکەوتن و پشتگیری و هاوەڵێتی پێغەمبەریان کرد صلی الله علیه و سلم بۆیە هەرگیز کەس بە فەزڵ و پلەو پایەو پێگەی ئەواندا ناگات.

هەروەها فەرموویەتی: (وَكُلُّ مَنْ صَحِبَهُ سَنَةً أَوْ شَهْرًا أَوْ يَوْمًا أَوْ سَاعَةً، أَوْ رَآهُ فَهُوَ مِنْ أَصْحَابِهِ، لَهُ مِنْ اَلصُّحْبَةِ عَلَى قَدْرِ مَا صَحِبَهُ، وَكَانَتْ سَابِقَتُهُ مَعَهُ، وَسَمِعَ مِنْهُ، وَنَظَرَ إِلَيْهِ نَظْرَةً) واتە هەرکەسێك جگە لەوانەی پێشتر ئاماژەی بۆ کردن، هەر کەسێکی تر ئەگەر هاوەڵێتی پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم ی کردبێت بۆ ماوەی شەش مانگ، یان یان مانگێك یان ڕۆژێك یان بۆ ساتێك و ماوەیەکی زۆر کەم، هەموو ئەوانە هاوەڵی ئەون و پلەو پایەی هاوەڵێتیان بەدەست هێناوە، بە پێی ماوەی هاوەڵێتی و گوێگرتنیان بۆ فەرموودکانی و تەماشاکردنیان بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم.

---

(١) البخاري (٣٦٧٣).

ئەمانە ئەگەرچی پلەو پایەیان لەوانەی سەرەتا باسی کردن کەمترە، بەڵام تەنها بەوەی کە هاوەڵی پێغەمبەر بوونە صلى الله عليه و سلم پلەو پایەو سەرفرازی دونیا و دوارۆژیان بەدەست هێناوە. ئەمەش واتای ئەوەیە کە فەرموویەتی: (فَأَدْنَاهُمْ صُحْبَةً هُوَ أَفْضَلُ مِنْ اَلْقَرْنِ اَلَّذِينَ لَمْ يَرَوْهُ، وَلَوْ لَقُوا اَللَّهَ بِجَمِيعِ اَلْأَعْمَالِ، كَانَ هَؤُلَاءِ اَلَّذِينَ صَحِبُوا اَلنَّبِيَّ صلى الله عليه و سلم وَرَأَوْهُ وَسَمِعُوا مِنْهُ، وَمَنْ رَآهُ بِعَيْنِهِ وَآمَنَ بِهِ وَلَوْ سَاعَةً، أَفْضَلُ لِصُحْبَتِهِ مِنْ اَلتَّابِعِينَ، وَلَوْ عَمِلُوا كُلَّ أَعْمَالِ اَلْخَيْرِ. )

# گوێڕایەڵی بۆ پێشەوایان و ئەمیری باوەڕداران

پێشەوا أحمد بن حنبل بنەمایەکی تر لە بنەماکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەخاتەڕوو و دەڵێت:

**(وَالسَّمْعُ وَالطَّاعَةُ لِلأَئِمَّةِ وَأَمِيرِ اَلْمُؤْمِنِينَ البَرِّ وَالْفَاجِرِ، وَمَنْ وَلِيَ اَلْخِلَافَةَ، وَاجْتَمَعَ اَلنَّاسُ عَلَيْهِ، وَرَضُوا بِهِ، وَمَنْ عَلَيْهِمْ بِالسَّيْفِ حَتَّى صَارَ خَلِيفَةً، وَسُمِّيَ أَمِيرَ اَلْمُؤْمِنِينَ)** .واتە یەکێك لە عەقیدەو بیروباوەڕەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت و بنچینەکانی دینەکەیان ئەوەیە گوێڕایەڵی بۆ وەلی ئەمر و پێشەواکانیان بکەن، چاکەکاربن یا خراپەکاربن نابێت لە فەرمانیان دەربچن مادام ئەوان وەلی ئەمری موسوڵمانانن و مەرجەکانی ئەو بەرپرسیارێتییەیان تێدایە .

مەبەستیان لەو کەسەیە کە دەنگی خەلکی لەسەر کۆ دەبێتە کە ببێتە ئەمیری باوەڕداران و خەلیفەی موسوڵمانان، ئیتر با خراپەشی لێ بوەشێتەوە ڕێگەپێدراو نییە خەڵکی لێی هەڵگەڕێنەوە و لایبدەن .ئەم قسەی پێشەوا أحمد وەکو هەندێك لە زانایان دەڵێن پێ دەچێت ڕەددانەوە بێت بۆ خەواریجەکان کە هەڵگەڕانەوە سەر حوکمی هاوەڵاندا بەو بیانووانەی کە هەیانبوو.

جێگیربوونی پۆستی خەلیفە و وەلی ئەمری موسوڵمانان بە سێ ڕێگە دروست دەبێت:

١- لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە لە لایەن ئەوانەی کە (أهل الحل والعقد) یان پێ دەوترێت وەکو زانا و خەڵکی دیندار و پیاوماقوڵ و خەڵکی تایبەت، ئەگەر بەو شێوە هەڵبژێردرێت دەبێتە خەلیفەی موسوڵمانان.

بەڵام ئەم هەڵبژاردنەی لێرەدا باس دەکرێت لە دوور و نزیکەوە پەیوەندی بە هەڵبژاردنی ئەم ڕۆژگارەوە نییە وهەرکێیش بەراوردی ئەمەو ئەوە پێکەوە بکات ئەوە لە هەلەکردن و نەپێکانی ڕاستیدا ڕۆچووە و وەکو ئەوەیە بەراوردی خۆڵ و زێڕی پێکەوە کردبێت، چونکە:

أ - هەڵبژاردنی ئەو کاتە ئەهلی حەل و عەقد ئەنجامیان دەدا کە هەموویان خەڵکانێك بوون زانا و دانا، دیندار و بەغیرەت لەسەر ئیسلام،خۆیان بە خاوەنی دین دەزانی، بەڵام هەڵبژاردنی ئێستا وەکو ئەسڵی پرۆسەکە دانا و نادان و موسوڵمان و ناموسوڵمان وچاکەکار و خراپەکار هەر هەمووی بەبێ هیچ جیاوازییەك بەشدار دەبن.

ب - هەڵبژاردنی ئەو کاتە کە لە کتێبەکانی شەرع و عەقیدەدا باس کراوە لە ئەنجامیدا کەسێك دەبوو بە خەلیفە یان بە ئەمیری بڕوادارن کە یەکەم ئەرکی ئەوە بوو حوکمی الله تعالی بەرپا بکات و میللەت بە شەریعەت ببات بەڕێوە، بەڵام هەڵبژاردنی ئێستا کەسێك یان کەسانێکی لێ بەرهەم دێت کە بە حوکمی گەل نەك حوکمی الله دەبێت کاروباریان بەڕێوەببەن، واتە لە جیاتی ( إِنِ الْحُكْمُ

إِلا لِلَّهِ) دەئەبێت ئەو کەسەی هەڵدەبژێردرێت بەڵێن بدات و بڵێت :(إن الحكم إلا للشعب) دەبێت سوێندیش بخوات لەسەر ئەوەی کە حوکمی میللەت نەك حوکمی شەریعەت جێبەجێ بکات.

ج - هەڵبژاردنی ئێستا بە پێچەوانەی هەڵبژاردنی ئەو کاتە سەری لە پەرلەمانێکەوە دەردەچێت حوکمی شەریعەت و ئایەتی قورئان وفەرموودەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم دەخرێتە دەنگدانەوە، ئەگەر دەنگی هێنا - کە ناشیهێنێت - ئەوا ئیشی پێ دەکرێت ئەویش بە دەستکاری و بە هەموارکردن و بە گونجاندنەوە، ئەگەر دەنگیشی نەهێنا کەواتە حوکمی الله وشەریعەتی ئیسلام نەیتوانی دەنگی زۆرینە بەدەست بهینیت و پەکدەخرێت !ئەوانەشی باوەڕیان پێیەتی لە پەرلەمان و خۆیان فریوداوەو چوونەتە ئەو جێگەیە ، جگە لە دەست بەرزکردنەوەیەك کە هیچ حیسابێکی بۆ ناکرێت ڕێگەچارەو مافێکی تریان نییە.

٢- ڕێگەی دووەم ئەوەیە خەلیفەی پێشوو ڕاسپاردە بۆ ئەوەی دوای خۆی بکات و بەو شێوە ئەو کەسە دەبێتە خەلیفە و وەلی ئەمری موسوڵمانان .نموونەی ئەوەش ڕاسپاردە کردنی أبوبکر الصديق بوو بۆ عمر بن الخطاب الله لێیان ڕازی بێت.

٣- ڕێگەی سێیەم ئەوەیە خاوەن هیز و دەسەڵاتدارێك بە زەبری هیز بچێتە سەر حوکم وبارودۆخەکان بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە بەو شێوەش ئەو کەسە دەبێتە خەلیفەی موسوڵمانان و بە شەریعەت حوکمی خەڵکی بکات.

بەڵام بێگومان ئەو فەرمانڕەوایەی کە أحمد لەم بەشەی بنەماکانی ئوسوڵی سوننەتدا باسی دەکات و بۆی هەیە بە ڕێگەیەك لەو ڕێگایانەی سەرەوە دەسەڵات وەربگرێت، کەسێکە باوەڕی تەواوی بە دینی ئیسلام هەیە و بەڵکو پارێزەری عەقیدەو شەریعەتەکەشێتی، لە سیفەتەکانیشی ئەوەیە بۆ نوێژ و بۆ جیهاد وبەرگری کردن لە ئیسلام و بۆ هەموو بەرژەوەندییەکی ئیسلام و موسوڵمانان و بۆ هەموو کارێکی خێر کە ئیسلام فەرمانی پێ کردبێت بەخۆی پێشیان دەکەوێت، یان یەکێك لە جێگەی خۆی دەنێرێت و کارەکان لەو میانەدا ئاسان دەکات، ئەو وەلی ئەمرە ئەحمەد باسی دەکات کە پێویستە گوێڕایەڵی بکرێت لە دەقەکانی قورئان و سوننەتدا هەندێ پێناسە و کۆت و تایبەتمەندی خۆی هەیە لەوانە:

یەکەم :لە قورئانی پیرۆزدا زۆر ئایەت لەو بارەوە هاتووە بۆ نموونە الله تعالی فەرموویەتی :(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا) النساء.٥٦:

زانایان دەفەرموون :الله تعالی بۆیە وشەی (وَأَطِيعُوا)ی بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دووبارە کردەوەو بۆ ( وَأُولِي الْأَمْرِ) دووبارەی نەکردەوە چونکە فەرزە لەسەرمان بەسەربەخۆیی و تایبەت گوێڕایەڵی پێغەمبەر بین صلی الله علیه و سلم هاوشێوەی گوێڕایەڵی کردنی الله تعالی، بەڵام گوێڕایەڵی کردنی وەلی ئەمر و فەرمانڕەواکان مەسەلەیەکی پەیوەستە بە گوێڕایەڵی کردنی ئەوان بۆ قورئان و

سوننەت، ئەگەر لەو بازنەیە دەرچوون وسنووری قورئان و سوننەتیان شکاند ئیتر نابێت گویڕایەڵی بکرێن .

شیخ الإسلام ابن تيمية بەڕەحمەت بێت فەرموویەتی :( إنَّهم أي أهلَ السُّنَّةِ والجَماعةِ لا يُجوِّزونَ طاعةَ الإمامِ في كُلِّ ما يَأمُرُ به، بَل لا يُوجِبونَ طاعَتَهُ إلَّا فيما تَسوغُ طاعَتُه فيه في الشَّريعةِ، فلا يُجَوِّزونَ طاعَتَهُ في مَعصيةِ اللهِ وإن كان إمامًا عادِلًا، فإذا أمرَهم بطاعةِ اللهِ أطاعوهُ، مِثلُ أن يَأمُرَهم بإقامةِ الصَّلاةِ، وإيتاءِ الزَّكاةِ، والصِّدقِ، والعَدْلِ، والحَجِّ، والجِهادِ في سَبيلِ اللَّهِ، فهم في الحَقيقةِ إنَّما أطاعوا اللَّهَ، والكافِرُ والفاسِقُ إذا أَمَرَ بما هو طاعةٌ للهِ لم تَحرُمْ طاعةُ اللَّهِ، ولا يَسقُطُ وُجوبُها لأجلِ أمرِ ذلك الفاسِقِ بها، كما أنَّه إذا تَكَلَّمَ بحَقٍّ لم يَجُز تَكذيبُه، ولا يَسقُطُ وُجوبُ اتِّباعِ الحَقِّ لكَونِه قد قالهُ فاسِقٌ .فأهلُ السُّنَّة لا يُطيعونَ وُلاةَ الأمورِ مُطلَقًا، إنَّهم يُطيعونَهم في ضِمنِ طاعةِ الرَّسولِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم) [(١)]پوختەی واتای قسەکانی ابن تيمية ئەوەیە :ئەهلی سوننەت و جەماعەت گوێڕایەڵی هەموو فەرمانێکی وەلی ئەمر نابن، بەڵکو لە چوارچێوەی شەریعەتدا گوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەکەن، ئەگەر بە گوێرەی شەریعەتی ئیسلام فەرمانیان پێ بکات گوێڕایەڵی دەکەن، چونکە ئەهلی سوننەت بە ڕەهایی گوێڕایەڵ نین بۆ فەرمانڕەواکان بەڵکو ئەو مەسەلە بەستراوە بە ڕێکردنی ئەوان لەسەر شەرعی ئیسلام .

(١) منهاج السنة النبوية، (٣٨٧/٣).

مەسـەلەی گـوێڕایەڵی کردنـی وەلـی ئەمری موسـوڵمان پـاش جێبەجێبـوونی مەرجەکانی کەوا مەرجداره و بەستراوەتەوه به گوێڕایەڵی ئەوان بۆ شەرع هەموو زانایانی ئیسلام لەسەری کۆکن، بۆ نموونه بڕوانه وتەکانی ئەم پێشـەواو زانایـانه بەڕەحمەت بن :

الشَّافِعيُّ له ڕاسپارده بەناوبانگەکەیدا(والسَّمعُ والطَّاعةُ لأُولي الأمرِ ما دامـوا يُصَلُّونَ، والولاةُ لا يُخرَجُ عليهم بالسَّيفِ، والخِلافةُ في قُرَيشٍ) (١)

المُزَنيُّ :(الطَّاعةُ لأُولي الأمرِ فيما كان عِندَ اللهِ عَزَّ وجَلَّ مَرضِيًّا، واجتِنابُ مـا كان عِندَ اللهِ مُسْخِطًا، وتَرْكُ الخُروجِ عِندَ تَعدِّيهم وجَورِهم، والتَّوبةُ إلى اللـهِ عَـزَّ وجَلَّ كيما يعطِفُ بهم على رَعِيَّتِهم) (٢)

حَربُ بنُ إسماعيلَ الكَرْمانيُّ :(الانقيادُ لِمَن ولَّاهُ اللَّهُ عَزَّ وجَلَّ أمرَكَ، لا تَنـزِعْ يَدَكَ من طاعَتِه، ولا تَخرُجْ عليه بسَيفِك، حَتَّى يَجعَلَ اللَّهُ لَكَ فَرَجًا ومَخرَجًا، وأنْ لا تَخرُجَ على السُّلْطانِ، وتَسمَعُ وتُطيعُ، لا تَنكُثْ بَيعَتَه، فمن فعلَ ذلك فهو مُبتَدِعٌ مُخالِفٌ، مُفارِقٌ للجَماعةِ، وإنْ أمرَكَ السُّلطانُ بأمرٍ هو للهِ مَعصـيَةٌ، فلَـيسَ لَـكَ أن تُطيعَهُ البَتَّةَ، ولَيسَ لَكَ أن تَخرُجَ عليه، ولا تَمنَعَه حَقَّه) (٣).

(١) بڕوانه: اعتقاد الشافعي، هكاري (ص: ١٦).

(٢) بڕوانه: شرح السن (ص: ٨٤).

(٣) بڕوانه: إجماع السلف في الاعتقاد)، (ص: ٤٦-٤٨).

الطَّحاويُّ :(لا نَرَى الخُروجَ على أئِمَّتِنا وولاةِ أُمورِنا وإن جارُوا، ولا نَدعو عليهم ولا نَنزِعُ يَدًا من طاعَتِهم، ونَرَى طاعَتَهم من طاعةِ اللهِ عَزَّ وجَلَّ فريضةً ما لم يَأمُروا بمَعصيةٍ، ونَدعو لَهم بالصَّلاحِ والمُعافاةِ)[١].

البَرَبَهاريُّ :(والسَّمعُ والطَّاعةُ للأئِمَّةِ فيما يُحِبُّ اللَّهُ ويَرضَى، ومن وَلِيَ الخِلافةَ بإجْماعِ النَّاسِ عليه ورِضاهم به فهو أميرُ المُؤمنين، ولا يَحِلُّ لأحَدٍ أن يَبيتَ لَيلةً ولا يَرَى أنَّ عليه إمامًا، برًّا كان أو فاجِرًا) [٢].

الآجُريُّ: (بابٌ في السَّمعِ والطَّاعةِ لِمَن وَلِيَ أمرَ المُسلِمينَ والصَّبرِ عليهم وإن جاروا، وتَركِ الخُروجِ عليهم ما أقاموا الصَّلاةَ) [٣].

ابنُ أبي زَمنين: (السَّمعُ والطَّاعةُ لوُلاةِ الأمرِ أمرٌ واجِبٌ، ومَهما قَصَّروا في ذاتِهم فلم يَبلُغوا الواجِبَ عليهم، غَيرَ أنَّهم يُدعَونَ إلى الحَقِّ، ويُؤْمَرونَ به، ويُدَلُّونَ عليه، فعليهم ما حَمَلوا، وعلى رَعاياهم ما حُمِّلوا من السَّمعِ والطَّاعةِ لَهم).[٤]

الأصبَهانيُّ: (من السُّنَّةِ السَّمعُ والطَّاعةُ لوُلاةِ الأمرِ أبرارًا كانوا أو فجَّارًا، والصَّلاةُ خَلفَهم في الجُمُعاتِ والأعيادِ، والجِهادُ مَعَهم والدُّعاءُ لَهم بالصَّلاحِ) [٥].

---

(١) بڕوانە: متن الطحاوية، (ص: ٦٨).

(٢) بڕوانە: شرح السنة، (ص: ٥٦).

(٣) بڕوانە: الشريعة، (٣٧٣/١).

(٤) : أصول السنة، (ص: ٢٧٦).

(٥) بڕوانە: الحجة في بيان المحجة،(٥٧٢/٢).

عِياضٌ: (لا خِلافَ في وُجوبِ طاعةِ الأمراءِ فيما لا يُخالِفُ أمرَ اللَّهِ، وما لم يَأمُرْ بمَعصيةٍ) [(١)].

جمالُ الدِّين الغَزنَويُّ: (طاعةُ الأئِمةِ واجِبةٌ، وهيَ فرضُ عَينٍ من فُروضِ الشَّرعِ؛ لأنَّ الإمامَ إذا لم يَكُن مُطاعًا يُؤَدِّي ذلك إلى: إخلالِ نِظامِ الدِّينِ والدُّنيا من الفَسادِ ما لا يُحصَى، وكَذا طاعةُ السَّلاطِينِ والأُمَراءِ والوُلاةِ واجِبةٌ؛ لقَولِه تعالى: (أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ) إلَّا فيما يَأمُرونَ من المُعاصي فحينَئِذٍ لا إثمَ على الآبِي...( [(٢)]

ابنُ قُدامةَ: (من السُّنَّةِ: السَّمعُ والطَّاعةُ لأئِمَّةِ المُسلِمينَ وأُمَراءِ المُؤمنينَ بَرِّهم وفاجِرِهم، ما لم يَأمُروا بمَعصيةِ اللهِ؛ فإنَّه لا طاعةَ لأحَدٍ في مَعصيةِ اللهِ.) [(٣)]

مُحَمَّدُ بنُ عَبدِ الوَهَّابِ ( وأرَى وُجوبَ السَّمعِ والطَّاعةِ لأئِمَّةِ المُسلِمينَ، بَرِّهم وفاجِرِهم، ما لم يَأمُروا بمَعصيةِ اللَّهِ) [(٤)]

دووەم :فەرموودەی زۆریش لە سوننەتدا هەیە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە گوێڕایەڵی فەرمانڕەوایان بەندە بە گوێڕایەڵی بوونی ئەوان بە قورئان و سوننەتەوە، ئەگەر وا نەبوون درووست نییە بەقسەیان بکرێت، لەوانە :

---

(١) بڕوانە: إكمال المعلم، ٦/٢٤٠(

(٢) بڕوانە: أصول الدين، (ص: ٢٨١-٢٨٣).

(٣)بڕوانە: (لمعة الاعتقاد، (ص: ٤٠).

(٤) بڕوانە: الدرر السنية، (٣٣/١).

(السَّمْعُ والطَّاعَةُ علَى المَرْءِ المُسْلِمِ فِيما أحَبَّ وكَرِهَ، ما لَمْ يُؤْمَرْ بمَعْصِيَةٍ، فإذا أُمِرَ بمَعْصِيَةٍ فلا سَمْعَ ولا طاعَةَ) (١) گوێڕایەڵی وەلی ئەمر واجبە لەسەر کەسی موسوڵمان, بەمەرجێك گوێڕایەڵی کردنەکەی لە سەرپێچیکردندا نەبێت، چونکە لەو حاڵەتەدا درووست نییە گوێڕایەڵییان بکەن.

(اسمعوا وأطيعوا وإن استعمل عليكم عبد حبشي كأن رأسه زبيبة ما أقام فيكم كتاب الله) (٢)لەم فەرمودە و لە فەرموودەکانی تریش کە گوێڕایەڵی ئەوان بە ڕەهایی هاتووە هەموو بەستراوەتەوە بەوەی بە قورئان کار بکەن ئینجا گوێڕایەڵییان واجب دەبێت.

زانایان لە کتێبەکانیاندا زۆر بە وردی و بەتێروتەسەل ئەم مەسەلەیان شیکردووەتەوە، لەوانە باسی گرنگی ئەنجامدانی قسەی حەقیان کردووە لە ڕووی فەرمانڕەوای ستەمکاردا ئەگەر وتنی ئەو حەقە ببێتە مایەی کوژرانی حەقبێژەکەش و بەڵگەی ئەوەش لە چەندین فەرموودەی صحیح دا هاتووە .بۆ نموونە :(أفضلُ الجهادِ كلِمةُ حقٍّ عندَ سُلطانٍ أو أميرٍ جائرٍ) (٣)

هەروەها زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی ئەگەر خەلیفە و ئەمیری بڕواداران فەرمانڕەوای موسوڵمانان بە کار و واجبەکانی خۆی هەڵبسێت لە فەرمان کردن بەوەی لە قورئان و سوننەتدا هاتووە و حوکم کردن پێیان، ئەوا درووست نییە

---

(١) البخاري (٢٩٥٥ )، ومسلم (١٨٣٩).

(٢) البخاري (٦٩٣)

(٣) صحيح الترغيب: ( ٢٣٠٥ ).

کەس لە قسەیان دەربچێت با فسق و خراپەشی هەبێت، بەڵام وەکو پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد زانایان گوێڕایەڵی ئەوانیان بە کارکردن و حوکم کردن بە شەریعەت بەستووەتەوە، ئەگەرنا درووست نییە بۆ هیچ موسوڵمانێك گوێڕایەڵیان بێت.

بەڵکو لە هەندێ حاڵەتدا ئەگەر موسوڵمانان توانا و دەسەڵاتی لادانیان هەبێت، دەبێت لای بدەن و کەسی باشتر بخەنە جێگەکەی، لەوانە:

ئەگەر کوفر و هەڵگەڕانەوەی لە ئیسلام هەبێت یان ڕێگە بدات بە بڵاوبوونەوەی لەو حاڵەتەدا ئەگەر توانایان هەبێت دەبێت لای بدەن و بیگۆڕن، بەڵگەی ئەوەش لە سوننەتدا:

(بايعنا رسول الله ﷺ على السمع والطاعة في العسر واليسر، والمنشط والمكره، وعلى أثرة علينا، وعلى أن لا ننازع الأمر أهله إلا أن تروا كفرا بواحا عندكم من الله تعالى فيه برهان، وعلى أن نقول بالحق أينما كنا، لا نخاف في الله لومة لائم)[١] لەم فەرموودەدا بەیعەتدان و گوێڕایەڵی فەرمانڕەوا لە هەموو حاڵەتەکاندا واجب کراوە مەگەر لە حاڵەتیکدا کوفرێکی ئاشکرای هەبێت .

هەروەها ئەگەر پێشەواو فەرمانڕەوای موسوڵمانان نوێژ نەکات، یان فەرمان بە خەڵکی نەکات نوێژ بکەن، دەبێت لەو حاڵەتەشدا لابدرێت وبەڵگەی ئەوەش فەرموودەی :(خِيارُ أئمَّتِكُمُ الَّذينَ تحبُّونَهُم ويحبُّونَكُم وتُصلُّونَ علَيهِم ويصلُّونَ

(١) متفق عليه.

علَيكُم وشرارُ أئمَّتِكُمُ الَّذينَ تبغَضونَهُم ويبغَضونَكُم وتَلعنونَهُم ويَلعنونَكُم قُلنا : يا رسولَ اللَّهِ أفلا نُنابذُهُم ؟ قالَ : لا ما أقاموا فيكُمُ الصَّلاةَ ألا مَن وليَ علَيهِ والٍ فرآهُ يأتي شَيئًا مِن معصيةِ اللَّهِ فليَكْرَهْ ما يَأتي مِن معصيةِ اللَّهِ ولا ينزِعَنَّ يدًا مِن طاعةٍ) [١]واتە: چاکترینی پێشەواو فەرمانڕەواکانتان ئەوانەن خۆشیان دەوێن و خۆشتان دوێن و ڕەحمەتتان بۆ دەنێرن و ڕەحمەتیان بۆ دەنێرن ، خراپترینیشیان ئەوانەن کە ڕقتان لێیانە و ڕقیان لێتانە ونەفرەتیان لێ دەکەن و نەفرەتتان لێ دەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم فەرموویەتی مادام نوێژ دەکەن و فەرمان بەخەڵکی دەکەن نویژەکانیان بکەن لەگەڵیاندا مەجەنگن.

هەروەها ئەگەر وازیان لە حوکم کردن بە شەرعی ئیسلام و بە قورئان و بە سوننەت هێنا و بە یاسای تری ناکۆك لە گەڵ ئیسلامدا حوکمیان کرد لەو حاڵەتەشدا مافی گوێڕایەڵییان بەسەر موسوڵمانانەوە نامێنیت, ئەو ئایەت و فەرموودانەی سەرەوە ئاماژەیان بۆ کرا هەمووی بەڵگەیە بۆ ئەم مەسەلە و هەروەها بۆ نموونە فەرموودەی :(إن أُمِّرَ عليْكم عبدٌ حبشيٌّ مجدَّعٌ فاسمعوا لَهُ وأطيعوا ما قادَكم بِكتابِ اللَّهِ) [٢]واتە :ئەگەر کۆیلەیەکی ڕەشی حەبەشیتان بەسەرەوە کرا بە دەسەڵاتدار، گوێڕایەڵی بکەن بەمەرجێك بە پێی قورئان کاروبارتان ببات بەڕێوە .ئەمەش یەکێکە لە بەڵگەکان.

(١) مسلم: (١٨٥٥).

(٢) ابن ماجة: (٢٣٢٨).

زانایان فەرموویانە لابردنی دەسەڵاتداری کافر لە حاڵەتێکدایە دەسەڵات و توانای لابردن بوونی هەبێت، ئەگەرنا درووست نییە ئەو کارە بکرێت، چونکە زیانی زۆری دەبێت بۆ موسوڵمانان و ئەوانەش کە حوکم بەشەریعەت ناکەن هەر دەمێننەوە، بەڵام موسوڵمان ئەگەر بتوانێت باشترە ئەو جێگای کە حوکمی ئیسلامی تێدا جێبەجێ ناکرێت بەجێ بهێڵێت و هیجرەت بکات بۆ جێگەیەکی باشتر لەو جێگەی خۆی ئەگەر هەبێت.

پێشەوا أحمد دوای ئەوە فەرموویەتی :(وَالْغَزْوُ مَاضٍ مَعَ اَلْأَمِيرِ إِلَى يَوْمِ اَلْقِيَامَةِ البَرِّ وَالْفَاجِرِ لَا يُتْرَكُ) واتە: غەزا کردن لەگەڵ هەموو ئەمیرێکی چاکەکار و خراپەکاردا درووستە وبەردەوامە تا ڕۆژی قیامەت .

هۆکاری باس کردنی ئەم مەسەلە ئەوەیە خەلیفە یان بەرپرسی یەکەمی موسوڵمانان خۆی سەرکردایەتی غەزاکان دەکات، بۆیە زانایان فەرموویانە حەج و جیهاد تاکو ڕۆژی قیامەت لە پشت خەلیفە و فەرمانڕەوا و سەرکردە موسوڵمانەکانەوە ئەکرێت ئەگەر خراپەکاریش بن ، مادام موسوڵمانن و بە قورئان حوکم دەکەن.

ئینجا فەرمویەتی :(وَقِسْمَةُ اَلْفَيْءِ وَإِقَامَةُ اَلْحُدُودِ إِلَى اَلْأَئِمَّةِ مَاضٍ لَيْسَ لِأَحَدٍ أَنْ يَطْعَنَ عَلَيْهِمْ، وَلَا يُنَازِعُهُمْ، وَدَفْعُ اَلصَّدَقَاتِ إِلَيْهِمْ جَائِزَةٌ نَافِذَةٌ، مَنْ دَفَعَهَا إِلَيْهِمْ أَجْزَأَتْ عَنْهُ، بَرًّا كَانَ أَوْ فَاجِرًا .) واتە دابەش کردنی ئەو ماڵ و سەروەتەی بەبێ شەڕ لە بێباوەڕانەوە دەست دەکەوێت و هەروەها ماڵی گشتی و غەنیمەت و دەستکەوتەکانیش، بە هەمان شێوە جێبەجێکردنی سزا

شەرعییەکانیش هەر تایبەتە بەو وەلی ئەمر و فەرمانڕەوایانە، ئەوانیش پێویستە بەو شێوەی الله لە قورئاندا فەرمانی کردووە و پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم لە سوننەتدا ڕوونیکردوەتەوە دابەشی بکەن بەسەر شایستەکاندا.

هەروەها زەکات و سەدەقە و پارەی تریش هەر دەدرێتە ئەوان بۆ ئەوەی بە پێی شەریعەتی ئیسلام بەسەر موسوڵماناندا بە دادگەری دابەشی بکەن.

پوختەی ئەم باسەش ئەوەیە کە وەلی ئەمرەکان پێویستە گوێڕایەڵی بکرێن و حەرامە موسوڵمانان لە قسەیان دەربچن و لێیان هەڵگەڕێنەوە تا ئەو کاتەی شەریعەتی ئیسلام جێبەجێ بکەن، بەلام ئەگەر وا نەبوون و فەرمانیان بە خراپە کرد لەو حاڵەتەدا گوێڕایەڵی کردنیان درووست نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر هەڵگەڕانەوە لێیان و ڕاوەستان لە دژیان بوو بە مایەی فیتنە و کوشتار و زیانی زۆر، لەو حاڵەتەدا ئەو کارەش حەرام دەبێت و ئەوەندە بەسە موسوڵمان لە خۆیان و لە کردەوە خراپەکانیان بەری بێت و حاشایان لێ بکات و ورقی لێیان بێت و ئەگەر پێی کرا هیجرەتیش بکات بۆ جێگەیەکی باشتر لەو جێگەی کە حوکمی شەریعەتی تێدا جێبەجێ ناکرێت و ڕێز لە کیتاب و سوننەت ناگیردرێت.

هەروەها فەرموویەتی :(وَصَلَاةُ اَلْجُمْعَةِ خَلْفَهُ وَخَلْفَ مَنْ وَلَّاهُ، جَائِزَةٌ بَاقِيَةٌ تَامَّةٌ رَكْعَتَيْنِ، مَنْ أَعَادَهُمَا فَهُوَ مُبْتَدِعٌ تَارِكٌ لِلْآثَارِ، مُخَالِفٌ لِلسُّنَّةِ، لَيْسَ لَهُ مِنْ فَضْلِ اَلْجُمْعَةِ شَيْءٌ ; إِذَا لَمْ يَرَ اَلصَّلَاةَ خَلْفَ اَلْأَئِمَّةِ مَنْ كَانُوا بَرِّهِمْ وَفَاجِرِهِمْ .

فَالسُّنَّةُ :بِأَنْ يُصَلِّيَ مَعَهُمْ رَكْعَتَيْنِ، وَيَدِينَ بِأَنَّهَا تَامَّةٌ، لَا يَكُنْ فِي صَدْرِكَ مِنْ ذَلِكَ شَكٌّ) واتە :نوێژی جومعە لە پشت خەلیفەی موسوڵمانان یان ئەو کەسەی

ئەو دەستنیشانی دەكات درووستە وڕاستە وبە دوو ڕكات دەكرێت، هەركێ نوێژی جومعە دووبارە بكاتەوە واتە نوێژ كردن لە پشتیانەوە بە بەتاڵ بزانێت، ئەوە موبتەدیعەو بە سوننەت كاری نەكردووە و لە فەزڵ و پاداشتی جومعە خۆی بێ بەش كردووە، چونكە نوێژ لە پشتیانەوە درووستە چاكەكار بن یان تاوانبار و خراپەكار، سوننەت وایە نوێژیان لەگەڵدا بكات ودڵ بە گومان نەبێت لێیان.

وەك دەردەكەویت ئەو پێشەوا و پێشوێژانەی كە نابێت تەركی جومعەو جەماعەت بكرێت لە پشتیانەوە ئەوانەن كە موسوڵمانن و لە بازنەی ئیسلام دەرنەچوونە، واتە كێشەی بیروباوەڕ و عەقیدەیان نییە و تەنها هەندێ هەڵەو بیدعەیان هەیە كە لە ئیسلام دەریان ناكات.

تێبینی :سەركردەكانی ئەم سەردەمە جگە لەوەی كە لە بنچینەوە قبوڵیان نییە ئەو نازناوە ئیسلامییانەیان لێ بنرێت وەكو ئەمیری بڕواداران و خەلیفەی موسوڵمانان و نازناوی هاوشێوە، زۆربەیان فەرمان بە نوێژ ناكەن وحەج ناكەن، بەڵكو خۆیشیان نە نوێژ دەكەن و نە شەریعەتیشبەتەواو جێبەجێ دەكەن، بەڵكو بەهۆی كاركردن بە سیستمی دیموكراسی ولیبرالی لە زۆربەی سەرزەویدا سەركردەو سەرۆكەكانی جیهانی ئیسلامیش هیچ جیاوازییەك نابێت بكەن لە نێوان بێ باوەڕ و موسوڵماندا، یان ئەگەر جیاوازی بكرێت بەوە دەكرێت ڕێگری لە موسوڵمانەكە دەكرێت دینەكەی وەكو ئەوەی لە كیتاب و سوننەتدا هاتووە ئەنجام بدات وهەندێ جار بە بەهانەی جۆراوجۆرە ڕێگریشی لێ دەكرێت و

ئازاریش دەدرێت، بەپێچەوانەی کەسە بێ باوەڕەکەوە کە هەمو کـارێکی بەراورد بە موسوڵمانەکە بۆ ئاسان دەکرێت.

واتە پێشەوا أحمد لەو وتەیەی سەرەوەیدا باسی خەلیفەیەك، یان وەلی ئەمرێك دەکات موسوڵمانە و کـار بە شـەریعەت دەکـات و حـوکم بە قورئـان و سـوننەت دەکات لەمەیاندا کێشەی نیـیە، بەڵام لەو لاشـەوە هەنـدێ گونـاه و تـاوان، یـان فیسق و فجور یشی هەبێت، یان بیـدعەیەکی هەبێـت بیـدعەکەی نەگـاتە ئاسـتی کوفر ودەرچوون لە ئیسلام، خۆیشی بۆ نوێژو بـۆ غەزاکـردن پێشـی موسـوڵمانان بکەوێت وحوکمیش بەشەریعەت بکات و پێشنوێژی نوێژەکـان و نـوێژی جـومعە کە دەکات واجبە موسوڵمانان نوێژ لە پشتییەوە نوێژ بکەن.

ئینجا پێشەوا أحمد بن حنبل فەرموویەتی:(وَمَـنْ خَـرَجَ عَـلَى إِمَـامٍ مِـنْ أَئِمَّـةِ اَلْمُسْلِمِينَ وَقَدْ كَانَ اَلنَّاسُ اِجْتَمَعُوا عَلَيْهِ وَأَقَرُّوا لَـهُ بِالْخِلَافَـةِ، بِـأَيِّ وَجْـهٍ كَـانَ، بِالرِّضَا أَوْ بِالْغَلَبَةِ - فَقَدْ شَقَّ هَذَا اَلْخَارِجُ عَصَـا اَلْمُسْـلِمِينَ، وَخَـالَفَ اَلْآثَـارَ عَـنْ رَسُولِ اَللَّهِ صلى الله عليه و سلم :فَإِنْ مَاتَ اَلْخَارِجُ عَلَيْهِ مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً) واتە هەرکێ لە خەلیفە و سەرۆکێك کە بەو شێوە بێت باسمان کرد، چی جـۆری یەکەم بێت و بەهەڵبژاردنی ئەهلـی حەل و عەقـد بـووبێتە خەلـیفە و وەلـی ئەمـر، یـان بەزەبـری چەك وبەهێـز دەسـەڵاتی وەرگرتبێـت بەڵام کـار بە شـەریعەت بکـات، هەرکـێ لە دژی ئەوانە هەڵگەڕێـتەوە و دەربچێـت ئەوە کەسـێکی گێرەشـێوێنە و ڕیـزی موسـوڵمانانی تێکـداوە و پـێچەاونەی بنەماکـانی سـوننەتە و بەو شـێوەش بمرێت لەسەر جاهیلییەت مردووە.

لە کۆتایی ئەم بەشەدا پێشـەوا أحمـد دەڵێـت :(وَلَا يَحِـلُّ قِتَـالُ اَلسُّـلْطَانِ وَلَا اَلْخُرُوجُ عَلَيْهِ لِأَحَدٍ مِنْ اَلنَّـاسِ، فَمَـنْ فَعَـلَ ذَلِـكَ فَهُـوَ مُبْتَـدِعٌ عَـلَى غَـيْرِ اَلسُّـنَّةِ وَالطَّرِيقِ) .واتە :درووست نییە موسـوڵمانان لە دەسـەڵاتداران هەڵگەڕێـنەوە و لە فەرمانیان دەربچن مادام بەشەریعەتی ئیسلام کار دەکەن و نوێژ دەکەن، درووست نییە جەنگیان لەگەڵ بکرێت مەگەر کـوفری ئاشـکرایان لـێ وەدی بکرێـت و بە ئاشکرا پـێچەوانەی دینـی ئیسـلام ئەنجـام بـدەن، لەو حـاڵەتەدا دەتـوانن لێیـان هەڵگەڕێنەوە و لەدژیان بوەستن، بەڵام بەمەرجێـك توانـای ئەو کارەیـان هەبێـت، ئەگەرنا دەبێت ئارام بگرن و نکۆڵی لە خراپە و فساد و بێ باوەڕی ئەو سەرکردەو سـەرۆکانە بـکەن ئەگەر بەدڵیشـیان بـووە، ئەگەر توانـای تەواویـان نەبێـت بـۆ لابردنیان موسوڵمانان تووشی فیتنە و ناخۆشی بی سوود نەکەن.

# شەڕكردن لە دژی دز وڕێگرەكان

پێشەوا أحمد بن حنبل بەڕەحمەت بێت بنەمایەكی تر لە بنەماكانی ئەهلی سوننەت وجەماعەت دەخاتەڕوو و دەفەرموێت: (**وَقِتَالُ اَللُّصُوصِ وَالْخَوَارِجِ جَائِزٌ إِذَا عَرَضُوا لِلرَّجُلِ فِي نَفْسِهِ وَمَالِهِ، فَلَهُ أَنْ يُقَاتِلَ عَنْ نَفْسِهِ وَمَالِهِ، وَيَدْفَعُ عَنْهَا بِكُلِّ مَا يَقْدِرُ، وَلَيْسَ لَهُ إِذَا فَارَقُوهُ أَوْ تَرَكُوهُ أَنْ يَطْلُبَهُمْ، وَلَا يَتْبَعَ آثَارَهُمْ، لَيْسَ لِأَحَدٍ إِلَّا اَلْإِمَامَ أَوْ وُلَاةَ اَلْمُسْلِمِينَ، إِنَّمَا لَهُ أَنْ يَدْفَعَ عَنْ نَفْسِهِ فِي مَقَامِهِ ذَلِكَ، وَيَنْوِيَ بِجُهْدِهِ أَنْ لَا يَقْتُلَ أَحَدًا، فَإِنْ مَاتَ عَلَى يَدَيْهِ فِي دَفْعِهِ عَنْ نَفْسِهِ فِي اَلْمَعْرَكَةِ فَأَبْعَدَ اَللَّهُ اَلْمَقْتُولَ، وَإِنْ قُتِلَ هَذَا فِي تِلْكَ اَلْحَالِ وَهُوَ يَدْفَعُ عَنْ نَفْسِهِ وَمَالِهِ، رَجَوْتُ لَهُ اَلشَّهَادَةَ، كَمَا جَاءَ فِي اَلْأَحَادِيثِ وَجَمِيعِ اَلْآثَارِ فِي هَذَا إِنَّمَا أُمِرَ بِقِتَالِهِ، وَلَمْ يُؤْمَرْ بِقَتْلِهِ وَلَا اِتِّبَاعِهِ، وَلَا يُجْهِزُ عَلَيْهِ إِنْ صُرِعَ أَوْ كَانَ جَرِيحًا، وَإِنْ أَخَذَهُ أَسِيرًا فَلَيْسَ لَهُ أَنْ يَقْتُلَهُ، وَلَا يُقِيمَ عَلَيْهِ اَلْحَدَّ، وَلَكِنْ يَرْفَعُ أَمْرَهُ إِلَى مَنْ وَلَّاهُ اَللَّهُ، فَيَحْكُمُ فِيهِ**).

(**وَقِتَالُ اَللُّصُوصِ وَالْخَوَارِجِ جَائِزٌ إِذَا عَرَضُوا لِلرَّجُلِ فِي نَفْسِهِ وَمَالِهِ، فَلَهُ أَنْ يُقَاتِلَ عَنْ نَفْسِهِ وَمَالِهِ، وَيَدْفَعُ عَنْهَا بِكُلِّ مَا يَقْدِرُ،**) واتە بەگژداچوون و شەڕكردن لە دژی دز و یاخیبواندا درووستە، ئەگەر بچنە سەر كەسێك و ماڵ و ژیانی بخەنە ژێر مەترسییەوە، ئەو كەسەی كە دزو جەردە دەچنە سەری، مافی خۆیەتی كە بەرگری لە خۆی وماڵ و سامانی بكات وبەهەر شێوەیەك كە لەتوانایدا هەبێت بۆی هەیە بەرگری بكات و پارێزگاری لە خۆی و لە ماڵ وخێزانی خۆی بكات.

وَلَيْسَ لَهُ إِذَا فَارَقُوهُ أَوْ تَرَكُوهُ أَنْ يَطْلُبَهُمْ، وَلاَ يَتْبَعَ آثَارَهُمْ، لَيْسَ لأَحَدٍ إِلاَّ اَلإِمَامَ أَوْ وُلاَةَ اَلْمُسْلِمِينَ، إِنَّمَا لَهُ أَنْ يَدْفَعَ عَنْ نَفْسِهِ فِي مَقَامِهِ ذَلِكَ، وَيَنْوِيَ بِجُهْدِهِ أَنْ لاَ يَقْتُلَ أَحَدًا، فَإِنْ مَاتَ عَلَى يَدَيْهِ فِي دَفْعِهِ عَنْ نَفْسِهِ فِي اَلْمَعْرَكَةِ فَأَبْعَدَ اَللَّهُ اَلْمَقْتُولَ، وَإِنْ قُتِلَ هَذَا فِي تِلْكَ اَلْحَالِ وَهُوَ يَدْفَعُ عَنْ نَفْسِهِ وَمَالِهِ، رَجَوْتُ لَهُ اَلشَّهَادَةَ، كَمَا جَاءَ فِي اَلأَحَادِيثِ وَجَمِيعِ اَلآثَارِ فِي هَذَا إِنَّمَا أُمِرَ بِقِتَالِهِ، وَلَمْ يُؤْمَرْ بِقَتْلِهِ وَلاَ اِتِّبَاعِهِ، وَلاَ يُجْهِزُ عَلَيْهِ إِنْ صُرِعَ أَوْ كَانَ جَرِيحًا، وَإِنْ أَخَذَهُ أَسِيرًا فَلَيْسَ لَهُ أَنْ يَقْتُلَهُ، وَلاَ يُقِيمَ عَلَيْهِ اَلْحَدَّ، وَلَكِنْ يَرْفَعُ أَمْرَهُ إِلَى مَنْ وَلاَّهُ اَللَّهُ، فَيَحْكُمُ فِيهِ.

دز وهەروەها ڕێگر وجەردە ئەوانەن کە دەستدرێژی دەکەنە سەر ماڵ و موڵك و ژیانی خەڵکیدا، ئەوانەش وا دەردەکەوێت موسوڵمانن مەگەر هەڵوەشێنەرەویەکی ئیمان و ئیسلامیان تێدا بێت، یان شیرك و کوفرێکیان هەبێت، ئەگینا لەبەر دزییەکەی کافر نابێت، بەڵام ئەگەر چەکیان بەکارهێنا ولەگەڵ دزی وڕاوڕوتدا خەڵکیشیان تۆقاند و دەستیان بۆ کوشتن و بڕین برد، ئەو کات پێویستە جەنگیان لەگەڵدا بکرێت، الله عزوجل باسی حاڵی ئەو جۆرە کەسانەی لە قورئاندا بۆ کردووین کە فەرموویەتی: ( إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلَافٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الْأَرْضِ ۚ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ) المائدة: ٣٣.

زانایان فەرموویانە ئەگەر ئەو کەسەی دەستدرێژی دەکرێتە سەر ماڵ و حاڵی، تاکو پێی بکرێت بە کوتەك و بەدار بەرگری لەخۆی بکات، نابێت ڕاستەوخۆ پەنا بۆ

چەك وسیلاح ببات، ئەگەر ئەوە سوودی نەبوو، ئینجا بە چەقۆ پێش ئەوەی پەنا بۆ شمشێر ببات، یان زمانی ئەم سەردەمە بڵێین پەنا بۆ دەمانچە وتفەنگ و و ئەو جۆرە ئامرازانە ببات، جا ئەگەر دەست درێژی ئەو دەست درێژکارانە بەمەبەستی کوشتنی بێت یان بەمەبەستی دزینی ماڵی بێت، یان دەستدرێژیکردنە سەر ئەندامانی خێزانی بێت بەهەر حاڵ ئەوانە هەر حیسابی (لصوص) و دز و جەردەیان بۆ دەکرێت و ئەویش مافی خۆیەتی بەرگری لە خۆی بکات.

ئینجا دەڵێت: (وَلَيْسَ لَهُ إِذَا فَارَقُوهُ أَوْ تَرَكُوهُ أَنْ يَطْلُبَهُمْ، وَلَا يَتْبَعَ آثَارَهُمْ، لَيْسَ لِأَحَدٍ إِلَّا اَلْإِمَامَ أَوْ وُلَاةَ اَلْمُسْلِمِينَ، إِنَّمَا لَهُ أَنْ يَدْفَعَ عَنْ نَفْسِهِ فِي مَقَامِهِ ذَلِكَ،) واتە: ئەگەر دزەکان و ئەوانەی هاتبوونە سەری هەڵهاتن و وازیان لێی هێنا، بۆی نییە بەدوایاندا بڕوات و شوێنیان بکەوێت، ئەو کارە تەنها مافی پێشەواو کاربەدەست و والییە موسوڵمانەکانە، بەڵام بۆی هەیە لەو کاتەی کەدێنەسەری بەرگری لەخۆی بکات.

لە کاتی بەرگری کردنی ئەو کەسەش لە خۆی، دەبێت نیەتی ئەوە نەبێت کەس بکوژێت، ئەگەر خۆیشی لەو حاڵەتەدا کوژرا ئومێدی شەهیدی بۆ دەکرێت، هەموو ئەو فەرموودانەش لەم بارەوە هاتوون مافی ئەوەی بەو کەسە داوە کە بجەنگێت بۆ بەرگریکردن لە خۆی نەك بکوژێت، ئەگەر دز و ڕێگرەکەش بریندار بوو بۆی نییە بچێتە سەری و بیکوژێت، بەڵکو دەبێت وازی لێ بهێنیت، ئەگەریش بەدیلی کەوتە بەردەستی بۆی نییە بیکوژێت. ئەم مەسەلە لەلایەن زانایانەوە بە (دفع الصائل) دەربڕینی لێ دەکرێت.

هەموو ئەمانەی کە لەسەرەوە باسکران بەڵگەیان لەسوننەتی ڕاست و درووستدا هەیە، پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم فەرموویەتی : ( مَنْ قُتِلَ دُونَ مالِهِ فهوَ شَهيدٌ . ومَنْ قُتِلَ دُونَ دِينِهِ فهوَ شَهيدٌ . ومَنْ قُتِلَ دُونَ دَمِهِ فهوَ شَهيدٌ ، ومَنْ قُتِلَ دُونَ أهلِهِ فهوَ شَهيدٌ).[1] واتە: ئەو کەسەی لە پێناو ماڵەکەیدا بکوژرێت شەهیدە، ئەو کەسەی لە پێناو دینەکەیدا بکوژرێت شەهیدە، هەرکێ لە پێناو بەرگریکردن لە خۆیدا بکوژرێت شەهیدە، هەرکێ لە پێناو خێزان و کەسوکارەکەیدا بکوژرێت شەهیدە.

هەروەها فەرموویەتی: (من قاتل دون مالِه، فقُتل فهو شهيدٌ، ومن قاتل دونَ دمِه، فهو شهيدٌ، ومن قاتل دونَ أهلِه، فهو شهيدٌ) [2]واتە: هەرکێ لە پێناو ماڵەکەیدا بجەنگێ ئەوە شەهیدە، هەرکێ لە کاتی بەرگریکردندا لە خۆی بکوژرێت شەهیدە، هەرکێ لە پێناو بەرگریکردن لە کەسوکاروخانەوادەکەی بکوژرێت شەهیدە.

لە صحیح ی موسلیمدا هاتووە: ( جاءَ رَجُلٌ إلى رَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، فقالَ: يا رَسولَ اللهِ، أرَأَيْتَ إنْ جاءَ رَجُلٌ يُرِيدُ أخْذَ مالِي؟ قالَ: فلا تُعْطِهِ مالَكَ قالَ: أرَأَيْتَ إنْ قاتَلَنِي؟ قالَ: قاتِلْهُ قالَ: أرَأَيْتَ إنْ قَتَلَنِي؟ قالَ: فأنْتَ شَهِيدٌ،

(١) سنن الترمذي: (١٤٢١).
(٢) صحيح النسائي: (٤١٠٥).

قالَ: أرَأَيْتَ إنْ قَتَلْتُهُ؟ قالَ: هو في النَّارِ.)[١] واته: کەسێك پرسیاری لە پێغەمبەر کرد صلى الله عليه و سلم و وتی: ئەگەر پیاوێك ویستی ماڵەکەم لێ زەوت بکات چی بکەم؟ پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم پێی فەرموو :ماڵی خۆتی پێ مەدە! وتی ئەگەر کوشتمی؟ فەرمووی: لەو حاڵەتەدا تۆ شەهیدی، وتی ئەگەر من ئەوم کوشت، فەرمووی ئەو لە دۆزەخدایە.

لە کۆتایی ئەم بەشەدا پێشەوا أحمد فەرموویەتی: (وَإِنْ أَخَذَهُ أَسِيرًا فَلَيْسَ لَهُ أَنْ يَقْتُلَهُ، وَلَا يُقِيمَ عَلَيْهِ اَلْحَدَّ، وَلَكِنْ يَرْفَعُ أَمْرَهُ إِلَى مَنْ وَلَّاهُ اَللَّهُ، فَيَحْكُمُ فِيهِ). واته ئەگەر ئەو دزەی بە دیلی کەوتە ژێر دەست بۆی نییە بیکوژێت یان سزای دەست بڕینی لەسەر جێبەجێ بکات، بەڵکو ڕادەستی دەسەڵاتی موسوڵمانی دەکات بۆ ئەوەی حوکمی الله تعالى لەسەری جێبەجێ بکەن.

---

(١) مسلم: (١٤٠).

# شایەتی چوونە بەهەشت ودۆزخ بۆ کەس لە ئەهلی قیبلە مەدە لەسەر کردەوەیەك کردوویەتی

پێشەوا أحمد بن حنبل لە بەشێکی تری کتێبی (أصول السنة ) دا فەرموویەتی: (**وَلَا نَشْهَدُ عَلَى أَحَدٍ مِنْ أَهْلِ اَلْقِبْلَةِ بِعَمَلٍ يَعْمَلُهُ بِجَنَّةٍ وَلَا نَارٍ نَرْجُو لِلصَّالِحِ وَنَخَافُ عَلَيْهِ، وَنَخَافُ عَلَى اَلْمُسِيءِ اَلْمُذْنِبِ، وَنَرْجُو لَهُ رَحْمَةَ اَللَّهِ .**

**وَمَنْ لَقِيَ اَللَّهَ بِذَنْبٍ يَجِبُ لَهُ بِهِ اَلنَّارُ تَائِبًا غَيْرَ مُصِرٍّ عَلَيْهِ فَإِنَّ اَللَّهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ، وَيَقْبَلُ اَلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ، وَيَعْفُو عَنْ اَلسَّيِّئَاتِ، وَمَنْ لَقِيَهُ وَقَدْ أُقِيمَ عَلَيْهِ حَدُّ ذَلِكَ اَلذَّنْبِ فِي اَلدُّنْيَا، فَهُوَ كَفَّارَتُهُ، كَمَا جَاءَ فِي اَلْخَبَرِ عَنْ رَسُولِ اَللَّهِ صلى الله عليه و سلم، وَمَنْ لَقِيَهُ مُصِرًّا غَيْرَ تَائِبٍ مِنْ اَلذُّنُوبِ اَلَّتِي قَدْ اِسْتَوْجَبَ بِهَا اَلْعُقُوبَةَ فَأَمْرُهُ إِلَى اَللَّهِ، إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ، وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ، وَمِنْ لَقِيَهُ وَهُوَ كَافِرٌ عَذَّبَهُ وَلَمْ يَغْفِرْ لَهُ) (وَلَا نَشْهَدُ عَلَى أَحَدٍ مِنْ أَهْلِ اَلْقِبْلَةِ بِعَمَلٍ يَعْمَلُهُ بِجَنَّةٍ وَلَا نَارٍ نَرْجُو لِلصَّالِحِ وَنَخَافُ عَلَيْهِ، وَنَخَافُ عَلَى اَلْمُسِيءِ اَلْمُذْنِبِ، وَنَرْجُو لَهُ رَحْمَةَ اَللَّهِ).**

عەقیدەی ئەهلی سوننەت ئەوەیە، بە دڵنیایی و بەشێوەیەکی کۆتایی شایەتی بەهەشت یان دۆزخ بۆ هیچ کەسێك نادەن. ئەو فەرموودانەش کە هەڕەشەی چوونە دۆزەخی لە کەسانێکی دیاری کراو تێدایە، یان بەڵێنی چوونە بەهەشتی بە کەسانێك داوە، دەڵێین اللە بە حاڵی ئەوان زاناترە وبڕیار و چارەنووسی ئەوان لەلای پەروەردگاریانە.

بۆ نموونه رسول الله صلى الله عليه و سلم فەرموویەتی: (إنَّ اللَّهَ قدْ حَرَّمَ علَى النَّارِ مَن قالَ: لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، يَبْتَغِي بذلكَ وجْهَ اللَّهِ). [١] واتە: الله عزوجل جەستەی ئەو کەسەی لە دۆزخ حەرام کردووە کە بڵێت لا إله إلا الله و مەبەستی ڕەزامەندی الله بێت.

ئێستا هەرکێ ببینین دەڵێت (لا إله إلا الله) ناتوانین شایەتی چوونە بەهەشتی بو بدەین، چونکە ئێمە نازانین حاڵی چۆنە، لەبەر ئەوەی مەسەلەی ڕاستگۆیی و ئیخلاس مەسەلەیەکە لەناو دڵی مرۆڤەکاندایە.

یان فەرموودەی رسول الله صلى الله عليه و سلم :(لا يدخلُ الجنَّةَ من كانَ في قلبِه مثقالُ ذرَّةٍ مِن كِبرٍ) [٢]واتە: کەسێك ناچێتە بەهەشتەوە کە بە ئەندازەی گەردیلەیەك لە خۆباییبوونی تێدا هەبێت. یان فەرموودەی: ( لا يَدْخُلُ الجَنَّةَ قَتّاتٌ) [٣]واتە: ئەو کەسەی خەریکی قسەهێنان و قسەبردن بێت ناچێتە بەهەشتەوە. ناڵێین ئەوانە ناچنەوە بەهەشتەوەو بەهەشتیان لێ قەدەغەیە، چونکە ئێمە نازانین دڵی ئەوان چی تێدایە، بەڵام ئەهلی سوننەت دەڵێین: ئەو جۆرە کەسانەی کە ئەو دەقانەیان لەسەر هاتووە، کەسانێکی تاوانبارن، چارەنووسی ئەوان لای پەروەردگاریانە، بیەوێت سزایان دەدات و بیەوێت لێیان خۆش دەبێت.

---

(١) البخاري: (٤٢٥).

(٢) مسلم: (٩١).

(٣) البخاري: (٦٠٥٦).

ئەوانەشی کە بەلێنی پاداشت و لێخۆشبوونیان لە دەقەکانـدا بـۆ هـاتووە، بەهەمـان شێوە دەلێین چارەنووسی ئەوان لەلای پەروەردگاریانە، بیەوێت بەسۆزو میهرەبـانی خۆی دەیانخاتە بەهەشت، یان بیەوێت لەسەر کردارە خراپەکانیـان سـزایان دەدات وخۆیشی زانایە و بە شێوازی ئەو سزایەی کە دەیاندات.

ئەمەیە واتای ئەوەیە کە ئەهلی سوننەت شایەتی بۆ کەسی دیـاری کـراو، وەکـو ئەوەی بڵێی فڵانە کەس (بە دیاریکردنی ناو ) دەچێتە بەهەشت یـان دۆزەخ، بەڵکـو دەڵێن الله زاناترە بە حاڵی ئەوان.

بەلام هەرکێ پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم شایەتی چوونە بەهەشتی بۆ دابێـت ئێمەش شایەتی بۆ ددەین، وەکو دە هاوەڵە مژدەپێـدراوەکان بەبەهەشـت کە بـریتین لە: ( أبوبکر، عمر، عثمان، علي، الزبیر بن العوام، سعد بن ابي وقاص، عبـدالرحمن بن عوف، أبو عبیدة بن الجراح، طلحة بن عبیدالله، سعید بن زید) جگە لەمـانەش هەرکێی تر لەلایەن پێغەمبەرەوە صلی الله علیه و سلم شایەتی بـۆ درابێـت ئـێمەش شایەتی بۆ دەدەین، بۆ نموونە: حسن وحسین، ثابت بن قیس، عکاشـة بـن حصـن، عبدالله بن سلام، عمار بن یاسر، وزۆر هاوەڵی تریش کە پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم شایەتی چوونە بەهەشتی بۆ داون.

هەروەها هەرکێ الله تعالی و پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم شایەتی چوونە ناو دۆزەخی بۆ داون ئێمەش هەمان شایەتیان بۆ دەدەین، بۆ نموونە: أبو لهب کە لە ئایەتی قورئاندا باسی هاتووە: ﴿سَيَصۡلَىٰ نَارٗا ذَاتَ لَهَبٖ﴾مسد:٣.

یەکێك لە زانایان نموونەیەك لەسەر ئەم باسە دەهێنێتەوەو دەڵێت: ئەگەر گوێمان لە مرۆڤێك بێت وشەیەکی کوفر بەدەمیدا بێت، پێویستە لەوە دڵنیا بین ئەم کەسە لەسەر خۆیەتی و عەقڵی لەسەریایەتی؟ ئایا ناتەواو وسەرخۆش نییە، ئینجا دڵنیا دەبینەوە بزانە تێکەڵبوون و خراپ حاڵی بوون لەمەسەلەکەدا نییە، ئایا زۆری لێ نەکراوە و بەزۆر ولە ژێر هەڕەشەدا ئەو کوفرەی پێ نەکراوە، پێویستە پێش ئەوەی حوکم بە هەڵگەڕانەوەی ئەو کەسە لە ئیسلام بدرێت لەو مەسەلانە حاڵی ببین. پوختەی ئەم باسە ئەوەیە کە ئەهلی سوننەت شایەتی بەهەشت و دۆزەخ بۆ کەسی (معین) و دیاریکراو نادەن، تەنها بۆ ئەوانە نەبێت کە دەقەکان دیارییان کردووە، هەرکەسێکیش هەڵوەشێنەرەوەیەك لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام ئەنجام بدات کە مەرجەکانی لە ئیسلام دەرچوونی تێدا بێت و ڕێگرێك لە رێگرەکانی ئەو حوکمە بوونی نەبێت، بەوە دەبێتە ئەهلی دۆزەخ ولە بازنەی ئیسلام دەردەچێت. سەبارەت بە تەکفیرکردنی کەسی (معین) دیاریکراو، هەندێ لە ئەهلی عیلم، بە مەبەستی ڕێکخستنی ئەو بابەتە لە ڕووی زانستییەوە، کۆمەڵە بنچینەیەکیان لە قورئان و سوننەت و قسەی زانایاندا هەڵێنجاوە، لەوانە:

١- تەکفیرکردنی بەناحەق حەڕامە و بیانوویەکە بۆی هەیە سەر لە کوشتنی بەناحەقەوە دەر بکات، پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم فەرموویەتی: (أيُّما رَجُلٍ قال لأخيه: يا كافِرُ، فقد باء بها أحدُهما؛ إن كان كما قال، وإلَّا رجَعَت عليه)[1] هەروەها فەرموویەتی :( إذا قال الرجلُ لِأَخِيهِ : يا كَافِرُ فهوَ كَقَتْلِه ، و لَعْنُ

(١) البخاري (٦١٠٣).

المُؤْمِنِ كَقَتْله) [١]واته: هەرکەسێك بەبراکەی بڵێت کافر وەکو ئەوەیە کوشتبێتی، بە لەعنەت کردنی ئیماندارێش وەکو کوشتنی وایە.

٢- پێویستە زۆر بە وردی لە مەسەلەی تەکفیر کردنی (معین) بڕوانرێت ومامەڵەی لەگەڵدا بکرێت و بەبێ لێکۆڵینەوەو دڵنیابوون نابێت مەسەلەیەکی وا گەورە ببڕدێتەوە و کەسێك لەسەر بنەمای گومان تەکفیر بکرێت، الله تعالى فەرموویەتی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ) الحجرات: ٦.

شێخ محمَّدِ بنِ عبدِ الوهَّاب فەرموویەتی :(لا نُكَفِّرُ مَن لا نعرِفُ منه الكُفرَ؛ بسَبَبِ ناقِضٍ ذُكِرَ عنه ونحن لم نتحَقَّقْه). واتە: کەسێك کوفری لێ نەبینرابێت و نەبیسترابێت، تەنها بە گێڕانەوەی ئەوە لێی کە هەڵوەشێنەرەوەیەکی ئیسلامی ئەنجام داوە تاکو دڵنیانەبین و لە مەسەلەکە نەکۆڵینەوە بەکافری دانانەین.

٣- هەروەها دەبێت لەوەش بکۆڵرێتەوە کە ئەو کوفرەی ئەو کەسە دیاریکراوە ئەنجامی داوە لەو جۆرەیە کە زانایان بە کوفریان دانابێت لە ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، بۆ نموونە تەکفیرکردن بە تاوان درووست نییە، یان بە ئەنجامدانی شتێك لە هەندێك حاڵەتدا کوفر بێت و لە هەندێ حاڵەتی تردا کوفر نەبێت، بۆ ئەوەی بزانرێت ئەو کوفرە لەکام بەشەدا پۆلێن دەکرێت. بنچینەی (مَن لم يُكَفِّرِ الكافِرَ فهو كافِرٌ)یش قاعیدەیەکی شەرعییە و ڕاستە و بەڵگەی کیتاب و سوننەت و قسەی زانایانی لەسەرە، النووي فەرموویەتی: (مَنْ لَمْ يُكَفِّرْ مَنْ دَانَ بِغَيْرِ الْإِسْلَامِ كَالنَّصَارَى، أَوْ شَكَّ فِي تَكْفِيرِهِمْ، أَوْ صَحَّحَ مَذْهَبَهُمْ، فَهُوَ كَافِرٌ، وَإِنْ أَظْهَرَ مَعَ ذَلِكَ

---

(١) صحيح الجامع ( ٦٠٤٧ ).

الْإِسْلَامَ وَاعْتَقَدَهُ) بەڵام بێگومان بۆ ئەو حاڵەتانەیە کە اللـه تعـالی و پێغەمـبەرەکەی صلی الله علیه و سلم کەسێکیان بە کافر دانابێت و کەسـێك ئەوە ڕەتبکـاتەوە، ئەوە ڕەتکردنەوەیە بۆ قورئان و بۆ سـوننەت، واتە ئەو بنچیـنەیە بـۆ حـاڵەتێکە کـوفرێکی ڕوون و ئاشکرا هەبێت و کەسێك نکۆڵی لێ بکات، بۆ نموونە الله تعالی لە قورئاندا جولەکەو گاورەکانی بە کافر داناوە کەسێك بڵێت من ئەوان بەکافر نازانم و بەبرای خۆمیان دەزانم، ئەم کەسە حوکم وقسەی الله ی ڕەتکردووەتەوە کەسـێکی گومـانی لە دەرچوونی لە ئیسلام هەبیت ئەویش وەکـو ئەوە، بەڵام بـۆ هەمـوو حاڵەتێـك ئەم حوکمە جێبەجێ ناکرێت وزانایان شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی زۆریـان لەسـەر ئەو بنچینە هەیە.

٤- تەکفیـری (معـین) پێویسـتی بە جێبەجێکردنـی مەرجەکـانە و وڕوانـدنەوەو نەهێشتنی ڕێگرەکانە، هەندێ جار مانع و ڕێگر هەیە لەوەی کەسێك تەکفیر بکرێت با کوفریشی لێ ببیسترێت بۆ نمـوونە لە ژێـر هەڕەشـەی کوشـتندا ئەو قسـەی پـێ کرابێت، یان هۆشی بەخۆی نەبێت و شتی لەوجۆرە.

٥- کوفر کردن گـاڵتەو سـوعبەتی تێـدا نیـیە، ئەگەر کەسـێك کـوفر بە گـاڵتە و بـۆ خۆشی بکات، یان بڵێت مەبەستم ئەوە نەبوو لە کاتێکدا بە ڕاشکاویش ئەو کـارەی کردبێت، ئەوە نابێتە ڕێگر و مانع لە تەکفیر کردنی، چونکە اللـه تعـالی لە قورئانـدا فەرمـوویەتی: (وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُـلْ أَبِـاللَّهِ وَآيَاتِـهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ * لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْـدَ إِيمَـانِكُمْ إِنْ نَعْـفُ عَنْ طَائِفَةٍ مِنْكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ) التوبة: ٦٥، ٦٦.

٦- ئەگەر کەسێك هەڵوەشێنەرەوەی ئیسـلامی بە شـێوەیەکی کردەیـی تێـدا هەبـوو، ناقیزێـك لە نەواقیـزی ئیسـلامی تێـدا هەبـوو، شـایەتمان و نـوێژ و عیبادەتەکـان

سوودیان نیيه بۆی و ئەو کارەساتەی لە عەقیدەکەیدا بۆ چارەسەر ناکەن و ئەنجامدانی ئەو هەڵوەشێنەرەوە لە بازنەی ئیسلام دەری دەکات. الله عزوجل فەرموویەتی: (وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ) الزمر: ٦٥.

٧- ئەگەر لە ڕۆشنایی بەڵگەی قورئان و فەرموودەو سوننەتدا ناکۆکی هەبوو لەسەر تەکفیر کردن و نەکردنی کەسێك و کوفرەکەی ڕوون و ئاشکرا نەبوو وبە پێی بنەماکانی قورئان وسوننەت بواری قسەکردن لەمەسەلەکەدا هەبوو، ئەو کەسە دیاریکراوە نابێت تەکفیر بکرێت ودەبێت زیاتر لە حاڵی بکۆڵرێتەوە، چونکە تەکفیر کردنی کەسێك وەکو لە فەرموودەی صحیح دا هاتووە وەکو کوشتنی وایە.

٨- تەکفیر کردنی معین وکەسێکی دیاریکراو، ئەگەر ڕوون و ئاشکرا نەبێت، لەتوانای کەسانی زانا و بەتوانایە کە لە تێگەیشتنی قورئان و سوننەتدا پێگەیشتبن، نەك کەسانی کەم شارەزا و پێنەگەیشتوو و جێگیر نەبوو لە زانستە شەرعییە ئیسلامییەکاندا کە ئەهلییەتی قسەکردن بە بەڵگەی قورئان و سوننتی پێ ببەخشێت، شارەزا بوونی تەواو لە لە زمانی عەرەبی و لە ئوسوڵەکان و لە تەفسیر و لە کتێبەکانی عەقیدە و لە بەرهەم و کتێبەکانی سەلەف و ئەوانەی لەسەر ڕێبازی ئەوان بوونە لە عەقیدەو شەریعەتدا هەندیکە لەو ئامرازانەی پێویستە بۆ ئەوانەی لە مەسەلە مەزنەکانی ئیسلامدا قسە ئەکەن، پەلە کردن لە تەکفیر کردن بەبێ دڵنیابوون و بەبێ وردبونەوە لە جێبەجێ بوونی مەرەجەکان و نەمانی ڕێگرەکان

وتەکفیر کردنی پێشەوایانی ئیسلام و چجای عەوامەکان ئەوە نیشانەی زانست نییە بەڵکو نیشانەی جەهل و دین لاوازییە!

٩- هەرکێ موسوڵمان بوونی بە یەقین و بەبێ هیچ گومانێك چەسپا و جێگیر بوو، ئیتر لە ئیسلام ناچێتە دەرەوە بە هەلوەشێنەرەوەیەك یان کوفرێکی ڕوون و ئاشکراو دیار نەبێت، ناکرێت بەگومان و قسەو بۆچوونێکی نەچەسپاو و بەبێ لێکولینەوە پەلە بکرێت لە تەکفیر کردنی کەسی دیاریکراودا.

شیخ الإسلام ابن تیمیة فەرموویەتی: (ولیس لأحَدٍ أن يُكَفِّرَ أحدًا مِنَ المُسلِمينَ وإن أخطَأَ وغَلِطَ، حتى تُقامَ عليه الحُجَّةُ، وتُبَيَّنَ له المَحَجَّةُ، ومَن ثَبَت إسلامُه بيَقينٍ لم يَزُلْ ذلك عنه بالشَّكِّ، بل لا يزولُ إلَّا بعد إقامةِ الحُجَّةِ وإزالةِ الشُّبهةِ)[1]. واتە کەس بۆی نییە موسوڵمانێك تەکفیر بکات با هەڵەشی هەبێت، تاکو ئیقامە حوججەی لەسەر ئەکرێت و بەڵگەکانی بۆ ڕوون دەکرێتەوە، چونکە کەسێك موسوڵمان بوونی بە یەقین جیگر بووبێت بە گومانێك لە بازنەی ئیسلام ناچێتە دەرەوە، بەڵکو پێویستە سەرەتا ئەو گومانەی کە هەیەتی بۆ لابرێت و ئینجا ئەو حوکمەی بەسەردا بدرێت. بەڵام ئەمە بۆ حاڵەتێك نییە کوفری کەسەکە وەکو ڕۆژی ڕوناك ڕوون و ئاشکرا بێت و پێویستی بەهیچ وردبوونەوەو لێکۆڵینەوەیەك نەبێت لەبەر ئەوەی ئایەت و فەرمودە دەربارەی بە ڕوونی و بەدیاری کراوی هاتبێت. بۆ نموونە کەسێك حوکمی الله لە قورئادا و پێغەمبەرەکەی لە سوننەتدا

(١) مجموع الفتاوى" (١٢/ ٤٦٦).

ڕەتدەکاتەوەو بە دواکەوتنی دەزانێت، یان یاساکانی ئەم سەردەمە لە شەریعەتی ئیسلام بە پێشکەوتووتر و بەگونجاوتر دەزانێت بۆ ئەم سەردەمە، یان کەسێك کە عەقڵی تەواوە و لەژێر هەرەشەدا نییە و بە ویست و ئیرادەی خۆی جنێو بە اللە و بە پێغەمبەرەکەی دەدات وسووکایەتی بە قورئان و بەفەرموودە دەکات، ئەوە هیچ لێکۆڵینەوەیەکی پێویست نییە و هەر کەسێك کەمترین شارەزایی لە ئیسلامدا هەبێت حوکمی ئەوە دەزانێت و نابێت گومانیش لە دەرچوونی لە ئیسلام بکرێت، چونکە دەقی قورئان و فەرموودەی لەسەرە و بە موسوڵمان دانانی کەسانی لەو جۆرە ڕەتکردنەوەیە بۆ ئایەت و فەرموودە.

بۆیە وەکو پێشتریش ئاماژەمان پێکرد: ئەم بنچینانەی کە باس کران دەربارەی تەکفیری کەسی دیاریکراو، بۆ حاڵەتێك نییە کەوا کەسەکە بە ئاشکرا و بەڕوونی سنورەکانی بیروباوەڕ لە قورئان و سونەتدا ببەزێنێت و لەو شتانەی کە زانایان پێی دەڵێن (معلوم من الدين بالضرورة) واتە وەکو ڕۆژی ڕوناك دیارە وکەس نییە نەیزانێت بچێت ئەو شتانە ئەنجام بدات و سەرەڕای ئەوەش بوترێت با ئیقامە حوججەی لەسەر بکرێت، کەس نییە نەزانێت سووکایەتی و جنێو دان بە اللە عزوجل و بە پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم کوفرە ، یان کاری لەو جۆرە ئەو حاڵەتانە ناچێتە ژێر ئەو بنچینانەی کە باس کران لەبەر ئەوەی مەسەلەیەکی مەعلومە و ناشارێتەوە.

لە الدرر السنية دا دەڵێت: (لكِنَّ الشَّخصَ المعَيَّنَ إذا قال ذلك ما يُوجِبُ الكُفرَ فإنَّه لا يُحكَمُ بكُفرِه حتى تقومَ عليه الحُجَّةُ التي يَكفُرُ تارِكُها، وهذا في المَسائِلِ

الخَفِيَّةِ التي قد يخفى دليلُها على بَعضِ النَّاسِ،... وأمَّا ما يقَعُ منهم في المَسائِلِ الظَّاهِرةِ الجَليَّةِ، أو ما يُعلَمُ مِنَ الدِّينِ بالضَّرورةِ، فهذا لا يُتوقَّفُ في كُفرِ قائِله) (١)

هەرکەسیکیش لە بازنەی ئیسلام دەرچوو تەماشاکردن بە دەرچوو لە ئیسلام حوکمێکی شەرعییە ونابێت موسوڵمان خۆی لێ بدزێتەوە یان پینەوپەڕۆی بۆ بکات، بەڵام مەرجیش نییە ئەو حوکمە ئیعلان بکات و بەهەموان بلێت حوکمی ئەو کەسە دیاریکراوە ئەوەیە، بەسە کە لەلای خۆی و لە ناخی دڵیدا بەو حوکمە بزانێت و بە زاهیر و بەباتن حوکمی الله تعالی لە قورئاندا و پێغەمبەر صلى الله عليه سلم لە سوننەتدا قبوڵ بکات و بیخاتە سەر سەرو سەرچاوی و پێی ڕازی بێت، وەکو الله فەرموویەتی: (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًا مُّبِينًا) الاحزاب:٣٦.

بەڵام لەبەر ئەوەی ئەمڕۆ لەسەر زەویدا دەسەڵات و حکومەتێك نییە بە هەموو قورئان و سوننەت کاربکات و دەوڵەتەکەی لە هەموو ڕوویەکەوە بەو دوو سەرچاوە واتە بەشەریعەتی ئیسلام بەڕێوەببرێت، بۆیە سزاو حوکمی دەرچوونی کەسی دیاریکراو لە ئیسلامدا لای بەندەکان نییە لە خۆیانەوە جێبەجێی بکەن، بەڵکو لەلای الله تعالی خۆیەتی و لە ڕۆژی قیامەتدا - ئەگەر ئەو کەسە تەوبە نەکات و نەگەڕێتەوە بازنەی ئیسلام - بەهەمیشەیی دەیخاتە دۆزەخەوە.

---

(١) الدرر السنية" (٤٣٣/١٠).

# ڕەجم کردن بۆ ژنێکی خاوەن مێرد یان پیاوێکی ژندار حەقە

پێشەوا أحمد بن حنبل لە درێژەی ڕوونکردنەوەی بنەماکانی ئەهلی سوننەتدا دەفەرموێت: (**وَالرَّجْمُ حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَا وَقَدْ أَحْصَنَ إِذَا اِعْتَرَفَ أَوْ قَامَتْ عَلَيْهِ بيِّنَةٌ، وَقَدْ رَجَمَ رَسُولُ اَللَّهِ صلى الله عليه و سلم وَقَدْ رَجَمَتْ اَلْأَئِمَّةُ اَلرَّاشِدُونَ**).

الرجم: مەبەست لە بەردباران کردنە تاکو مردن.

المحصن: پیاوی (محصن) مەبەست لە پیاوێکی ئازادە مارەی ژنی بە شێوەیەکی شەرعی درووست بڕیبێت و چووبێتە لای و سەرجێیی لەگەڵدا کردبێت، بۆ ئافرەتیش بەهەمان شێوە ئافرەتێکی ئازادە و مارەی بڕابێت و مێردی لە نیکاحێکی ڕاست ودرووستدا هاتبێتە لای و سەرجێی لەگەڵدا کردبێت بەو پێناسە ئیتر پێیان دەوترێت محصن، بەتەنها مارە بڕینیش نە پیاو و نە ژن نابنە (محصن) بەڵکو دەبێت گواستنەوەی تێدا بێت، مەرجیش نییە ئەو ژن و پیاوە لە ژیانی هاوسەریدا پێکەوە بەردەوام بن تاکو ئەو سیفەتە وەربگرن، بەڵکو ئافرەتی تەڵاقدار و ئەوەی کە مێردەکەی مردووە، یان پیاوێك ژنی تەڵاق دابێت یان ژنی مردبێت هەموو ئەوانە حیسابی (محصن ) یان بۆ دەکرێت. جا ئەگەر (محصن)ی پیاو یان ژن زینا و داوێن پیسی ئەنجام بدەن سزایان لە ئیسلامدا ڕەجم و بەردەباران کردنە تاکو دەمرن.

بەڵگەکانی ڕەجم کردن لە شەرعدا زۆرن، لەوانە: (خُذُوا عنِّي خُذُوا عنِّي ، قدْ جعل اللهُ لهنَّ سَبِيلًا ، البِكرُ بالبِكرِ ؛ جَلدُ مِائةٍ ، و نَفْيُ سَنةٍ ، و الثَّيِّبُ بالثَّيِّبِ ، جَلدُ

مائةٍ و الرَّجْمُ) [١]واتە لە منەوە فێر بن و دینەکەتان لە منەوە وەربگرن، چونکە اللـە تعـالی ڕێگەیەکـی بـۆ ئەوانەی کە زینایـان کـردووە دانـاوە، کـوڕو کـچ کە پێشـتر هاوسـەرگیرییان نەکـردوە ئەگەر زینـا بـکەن سـەد جەڵـدەیان لـێ دەدرێـت و بـۆ دەرەوەی شوێنی نیشتنەجێبوونی خۆیان بۆ ماوەی سـاڵێك شـاربەدەر دەکـرێن، ئەو ژن و پیاوەش کە لە ژیانی هاوسەرگیریدان یان پێشتر ژیـانی هاوسـەرییان پـێکەوە ناوە ئەگەر زینا بکەن سەد جەڵدەیان لێ دەدرێت و دوای ئەوەش ڕەجم وبەردباران دکرێن.

بەڵگەی تریش زۆرە لەسەر مەشروعییەتی ڕەجم کردن لەوانە:

-(لا یحِلُّ دمُ امرءٍ مسلمٍ إلَّا بإحدَی ثلاثٍ ، الزِّنَی ، والنَّفسُ بـالنَّفسِ ، والتَّـاركُ لدینِه المفارقُ للجماعةِ) [٢]لەم فەرموودەیەدا خوینی زیناکاری محصن حەڵاڵ کراوە وەکو سزایەکی شەرعی.

بەڵگەی تریش لەسەر ئەوەی رسول الله صلی اللـە علیـە وسـلم و خەلیفەکـانی دوای خۆی ڕەجمی ئەو جـۆرە کەسـانەیان کـردووە زۆرن و لە هەردوو صـحیح ی بوخاری و موسلیمدا گەیشتوونەتە ئاستی متواتر، لەوانە:

(قالَ عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ وَهو جَالِسٌ علَی مِنْبَرِ رَسولِ اللهِ صَلَّی اللَّـهُ علیـه وسـلَّمَ: إنَّ اللَّهَ قدْ بَعَثَ مُحَمَّدًا صَلَّی اللَّهُ علیه وسلَّمَ بالحَقِّ، وَأَنْزَلَ علیه الكِتَابَ، فَكـانَ مـمَّا

---

(١) مسلم: (١٦٩٠).

(٢) مسلم (١٦٧٦).

أُنْزِلَ عليه آيَةُ الرَّجْمِ، قَرَأْنَاهَا وَوَعَيْنَاهَا وَعَقَلْنَاهَا، فَرَجَمَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ، فأخْشَى إنْ طَالَ بالنَّاسِ زَمَانٌ أَنْ يَقُولَ قَائِلٌ: ما نَجِدُ الرَّجْمَ في كِتَابِ اللهِ فَيَضِلُّوا بتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهَا اللَّهُ، وإنَّ الرَّجْمَ في كِتَابِ اللهِ حَقٌّ علَى مَن زَنَى إذَا أَحْصَنَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ، إذَا قَامَتِ البَيِّنَةُ، أَوْ كانَ الحَبَلُ، أَوِ الاعْتِرَافُ.ا) [١]عمر الله لێی ڕازی بێت لەم فەرمودە سەحیحەدا فەرموویەتی لەوانەیە کەسانێك لە داهاتوودا نکۆڵی لە ڕەجم کردن بکەن، فەرموویەتی ڕەجم کردن لە قورئاندا بووە لەسەر ژنان و پیاوانی زیناکار، بەمەجێك بەڵگە هەبێت یان دوو گیانی لە ئافرەتەکەی دەربکەوێت یان ئیعتیراف بە تاوانەکەیان بکەن.

هەروەها علي بن أبي طالب الله لێی ڕازی بێت ئافرەتێکی لە ڕۆژی هەینیدا ڕەجم کرد و فەرمووی (قد رجمتها بسنة رسول الله صلى الله عليه و سلم) [٢] هەروەها فەرموودەکەی (ماعز) لە بوخاریدا کاتێك چوار جار شایەتی لەسەر خۆیدا کە زینای کردووە، پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم فەرمانی کرد و ڕەجم کرا. البخاري: (٦٨١٥) مسلم:( ١٦٩١) (١٦). هەروەها ئەو ئافرەتەی کە بە (الغامدية) ناسرا ئەویش لەلایەن پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم فەرمانی ڕەجم کردنی دەرچوو. مسلم: (١٦٩٥). هەروەها ئەو ژن وپیاوە جولەکەی کە دانیان بە زیناکردنەکەیاندانا ڕەجم کران وەکو لە سەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە.

(١) البخاري: ( ٧٣٢٣)صحيح مسلم: (١٦٩١).

(٢) البخاري: (٦٨١٢).

هەندێ لە تاقمە گومڕاکانی وەکو خەواریج، ڕەجمی زانی محصن یان ڕەتکردووەتەوە و وتوویانە ئێمە تەنها بەوە کار دەکەین کە لە قورئاندا هاتووەو ڕەجمیش لە قورئاندا نەهاتووە، لە ڕاستیشدا حوکمی ڕجم لە قورئانیشدا هاتووە بەو شێوەی کە لە فەرموودکەی عومەردا هاتووە الله لێی رازی بێت بەڵام لەفزەکەی کە لە سوڕەتی الأحزاب دا بووە: (الشيخ والشيخة إذا زنيا فارجموهما البتة نكالا من الله والله عزيز حكيم) نەسخ بووەو حوکمەکەی هەر ماوە، هەروەها لە سوننەتیشدا بە شێوەیەکی ڕاست و درووست و بە صحیح ی هاتووە، بۆ ئەو ئافرەتەی کە چوار شایەت لەسەر زیناکەی هەبێت یان خۆی دان بەکارەکەیدا بنێت و تا کاتی جێبەجێکردنی سزاکە لەسەر دانپێدانانەکەی بمێنیتەوە وپەشیمان نەبێتەوە.

بەڵام بۆ جێبەجێ کردنی سزای ڕەجم ئەگەر بە ئیعتیراف و دانپێدانانی بکەرەکان نەبێت، پێویستە چوار شایەت شایەتی بدەن وبلێن بەچاوی خۆمان کرداری زیناکەمان بینیوە، ئەگەر سێ کەس شاییەتی بدەن و چوارەمیان نەبێت ئەو سێ کەسە بە تۆمەتی بوختان کردن جەڵدەیان لێ دەدرێت .

بۆ جێبەجێکردنی سزای ڕەجم زانایان فەرموویانە پێویستی بە جێبەجێبوونی سێ مەرجە:

یەکەم: الشهادة: واتە شایەتیدان لە لایەن چوار کەسەوە زیناکردنەکەیان بەچاوی خۆیان بینیبێت، وەکو الله تعالی فەرموویەتی: (وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡ) النساء:١٥. هەروەها لە سوننەتیشدا بەڵگەی شایەتیدان لەسەر زینا هاتووە، بۆ نموونە ئەوەی کە لە سەحیحی موسلیمدا

هاتووە کاتێك ئەو پیاوەی بە پێغەمبەری وت صلی الله علیە و سلم ئەگەر پیاوێك لەگەڵ خێزانەکەی خۆمدا ببینم مۆڵەتی بدەم تاکو چوار شایەتی لەسەر ئەگرم فەرمووی بەڵێ.

دووەم: الإقرار: واتە دانپێدانانی بکەری زیناکە، وەکو لە فەرموودەکاندا هاتووە، بۆ نموونە ئیقراری ئەو کەسەی ناوی (ماعز) بوو، هەروەها ئەو ئافرەتەی کە زینای کرد و بە ( الغامدية) دەناسرا . (١)

---

(١) پرسیار/ دەستەکانت خۆشبێت کاک دکتۆر، بەڵام لێرەدا دەمەوێت لەبارەی بابەتی چوار شاهید بپرسم، لەم سەردەمەی ئێستاماندا جەنابت دەزانیت تەکنەلۆژیا زۆر پێشکەوتووە، ئایا ئەگەر هاتوو یەک شاهد لەڕیگەی گرتەی ڤیدیۆیی شاهیدی دا کە پیاوێک یان ژنێک زینای کردوە ، پێویست بە سێ کەسیتر دەکات بۆ چەسپاندنی ئەم بابەتە؟
وەڵام/ سوپاس بۆ ئەو پرسیارەی جەنابت لەوانەیە بۆ زۆر لە خوێنەران پرسیارێکی بە سوود بێت، لە ڕاستیدا ئەم مەسەلە زانایانی ئەم سەردەمە قسەیان تێدا کردووە بەو ئیعتیبارەی مەسەلەیەکی سەردەمیانەو (طارئ) ە، جا لەبەر ئەوەی سزای زیناکاری (محصن) سزایەکی زۆر ڤورسە و بە کەمترین گومان ئیتر جێبەجێ ناکرێت وپەک دەخرێت، هەروەها بە پێی بنەمای درء الشبهات یش کە لە فەرموودەکانەوە سەرچاوە دەگرێت و لە لایەکی تریشەوە لەبەر ئەوەی کامێرا ئەگەر بە ڕێژەیەکی کەمیش بێت بواری دەستکاری وفێڵ و شێواندنی تێدا هەیە و بۆیە زانایانی ئەم سەردەمە بە هیچ شێوەیەک بە دروستیان نەزانیوە کامێرا جێگای شایەتەکان بگرێتەوە، ئینجا شەریعەت مەبەستی بووە ئەو مەرجە زۆر قورسە بۆ ئەو سزا زۆر قورسە دابنێت ولە مێژووی ئیسلامدا بە دەگمەن ئەو مەرجە جێبەجێ بووە کە چوار کەس کرداری زیناکە وەکو میل بچێتە ناو کلدانەوە ( مثل الميل في المُكْحُلَة ) ببینن وئەو سزایە لە درێژایی سەدەکاندا کەمترین جار جێبەجێ کراوە، هەر ئەوەندەی تێدا هەیە هەندێک لە زانایان باسی ئەوەیان کردووە ئەگەر مەسەلەی زیناکە وەکو کەیسێک بوو لە دادگا دەکرێت

هەنـــدێ لە زانایـــان و لە مەزاهیـــبە ئیســـلامییەکان لە ڕۆشـــنایی بەڵگەکانـــدا فەرموویانە دەبێت چوار جار ئیعتیراف بکات لەسەر زیناکەی خۆی نەك یەك جـار، هەروەها دەبێت دانپێدانانەکە بە شیکراوەیی و بەباسکردنی وردەکاری کارەکە بێت، چونکە حوکمێکی قورسی لەسەر جێبەجێ دەبێـت و پێویسـتە هەمـوو شـتێك ڕوون ببێتەوە.

سێیەم :القرائن: واتە بەڵگەی تـر بـۆ نمـوونە سـکپڕبوونی ئـافرەتەکە کە زینـای کردووە، ئەوە بەڵگەو قەرینەیە لەسەر زینا، بەڵام زانایان لەم بارەوە قسـەیان هەیە و مەرج نییە هەموو دوو گیانییەك مەعنـای زینـا کـردن بێـت بە هـۆی ئەگەری (وطء الشبهة) و (الإکراه)و شیکردنەوەی ئەو بابەتە لە کتێبەکانی فیقهدا هاتووە.

هەروەها هەندێ لە زانایان دەڵێن (لعـان) یـش دەبێـتە قەریـنەیەك لەسـەر زینـا کردن، بۆ نموونە پیاوەکە لیعانی کرد و ئافرەتەکەی نکۆڵی کرد لەوەی لیعـان بکـات ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە زینای کردووە، بەڵام ئەم مەسەلەش بەهەمـان شـێوە جێگەی خیلافە لە نێوان زانایانـدا قسـەو شـیکردنەوەی زۆری تێـدایە. مەسـەلەی (اللعــان) بە شــیکراوەیی لە کتێبەکــانی فیقهــدا بــاس کــراوە و ئێـرە جــێگەی شیکردنەوەی نییە.

---

دادوەر وەکو قەرینەیەک ناڕاسـتەوخۆ سـوودی لـێ ببینێـت ولەگەڵ شـایەتەوبەڵگەکانی تـردا تەعزیزی ڕووداوەکەی پێ بکات والله اعلم بالصواب

درێژەی ئەم باسە بۆ کەسێك بیەوێت بە وردەکاری و بەڵگەکانەوە بیزانێت لە کتێبەکانی تەفسیر بە تایبەت لە تەفسیری سوڕەتی (النور) و هەروەها لە کتێبەکانی فەرموودەدا لە بابەتەکانی (الحدود و الاعتصام بالکتاب و السنة )و لە کتێبەکانی الفقه دا لە بابی (النکاح) دا باس کراون.(١)

(١) پرسیار / مامۆستا گیان حوکمی کەسێک چیە نکۆڵی لە ڕەجم بکات و کەسەکەش زانا بێ واتە عەوام نەبێ؟

وەڵام/ لەبەر ئەوەی خوارج و معتزلة نکۆلییان لە رەجمی زانی کردووە و ئینکارییں کردووە بۆیە زانایان لە کتێبی عەقیدەدا باسیان کردووە، جا زانایان لەم بارەوە دوو بۆچوونیان هەیە ئەوەندەی من بیزانم، ئەڵێن ئەگەر کەسەکە ئەهلی عیلم بێت و شارەزایی هەبێت دەبێت تێبگەیەنرێت و بۆی ڕوون بکرێتەوە کە ئەمە بەڵگەی قورئان و سوننەت و ئیجماعی لەسەرە و نابیت موسوڵمان ئینکاری مەسەلەیەکی وا بکات، ئەگینا مەترسی هەڵگەڕانەوەی لە دین ودەرچوونی لە ئیسلام لێ دەکرێت، بەڵکو هەر بەڕاشکاوی دەڵێن ئەگەر دوای ئەوەی بۆی ڕوون کرایە و ئەو هەر سوور بوو لەسەر ئینکارکردنی رەجم بەوە لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە، ئەمە بۆچوونی یەکەم...بەڵام هەندێ زانای تر هەیە دەڵێن ئەگەرچی حوکمی رەجم کردن بەڵگەی زۆری لەسەرە و حەقە، مەعلوم بوونی ناگاتە ئەوەی پێی بوترێت (معلوم من الدين بالضرورة) وەکو نوێژ و ڕۆژوو و وەکو حەرامی عارەق و ڕیبا وزینا و ئەو جۆرە شتانە، مەعقول نییە کەسێك حوکمی ئەو شتانە نەزانێت و بۆیە معلومە لە دیندا و دیارە و ئاشکرا بەڵام مەسەلەی ڕەجم وتوویانە وا نییە لەبەر ئەوەی ئەگەر کەسێك ئینکاری بکات پێی لە ئیسلام هەلناگەڕێتەوە بەڵام پێی دەوترێت گومڕاە و وێڵ و نەزان و ئەگەر لەو جۆرە بۆچوون و لادانانە بەردەوام بیت مەترسی دەرچوونی لە ئیسلام لی دەکرێت...من شارەزای ئەم دوو بۆچوونەم دەربارەی حوکمی ئینکارکردنی ڕجم والله أعلم.

له ئەگەری ئەوەی ڕەخنە بگیرێت یان تێبینی ئەوە بکرێت بۆچی پێشەوا أحمد لە کتێبێکی وەها تایبەت بە عەقیدە، باسی حوکمی دز و ڕێگر و ڕەجم کردنی زیناکاری کردووە کە ئەم باسانە دەچنە بواری فیقهەوە، لە کاتێکدا باسی ناوو سیفەتەکانی الله عزوجل ی نەکردووە کە بەشێکی گرنگە لە کرۆکی عەقیدە، شێخ عبدالله بن جبرین بەرەحمەت بێت دەڵێت هۆکاری بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پێشەوا أحمد لەسەرەتای ئەم کتێبەدا جەختی لەسەر دەستگرتن بە عەقیدەی کیتاب و سوننەت کردووەتەوە و ئەوەش حوکمێکی گشتییە و باسەکانی ئیمان و ئەسمائوسیفات وباسی هاوشێوەی لەخۆ دەگرێت، وەکو ئەوەی ئەم کتێبەی بۆ مەسەلە دیار و ڕوونەکان تەرخان کردبێت کە زیاتر دەچێتە چوارچێوەی کردەوەکانەوە و ڕەنگە هۆکارێکی تریش ئەوە بێت ئەم جۆرە مەسەلانە لەسەردەمی ئەودا باو بووە قسەی لەسەر بکرێت و لەبەر هۆکاری تایبەت ئەو کاتە کێشەو گرفتی لەلای خەلکی درووست کردووە، بۆیە ئەویش بەتایبەت و لە کتێبێکی عەقیدەدا باسی لی کردووە.

# نیفاق و سووکایەتی کردن بە هاوەڵان

پێشەوا أحمد بن حنبل سەبارەت بەم بنەما لە بنەماکانی ئەهلی سوننەت وجەماعەت فەرموویەتی:

**(وَمَنْ اِنْتَقَصَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اَللَّهِ صلى الله عليه و سلم ، أَوْ أَبْغَضَهُ بِحَدَثٍ كَانَ مِنْهُ، أَوْ ذَكَرَ مَسَاوِئَهُ كَانَ مُبْتَدِعًا، حَتَّى يَتَرَحَّمَ عَلَيْهِمْ جَمِيعًا، وَيَكُونُ قَلْبُهُ لَهُمْ سَلِيمًا).**

واتە هەرکەسێك سووکایەتی بەیەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرمان علیه الصلاة و السلام بکات، یان ڕقی لێیان بێت بەهۆی ڕووداوێکەوە کە ئەنجامی داوە، یان بەخراپە باسیان بکات ئەوە کەسێکی موبتەدیعە و لە ئەهلی سوننەت نییە، تاکو نەگەڕێتەوە سەر جادەی حەق و ڕەحمەت بۆ ئەو هاوەڵە ئازیزانە نەنێرێت و دڵ و سینەی بەرانبەریان ساف و سەلامەت نەبێت.

قسەوتن و بە کەم تەماشاکردن و رخنەگرتن لە دەرەوەی سنووری ڕێزو بە گەورەدانانی ئەوان، ئەوە پیشەی ئەهلی بیدەع و مونافیقانە و نیشانەیەکیشە لە نیشانەکانی مونافیق بوون، لەو سیفەتەش ڕزگاری نابێت تاکو ڕەحمەتیان بۆ نەنێرێت و دڵی پاك وبێگەرد نەبێت بەرانبەریان، بۆیە أبو جعفر الطحاوي لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا لەو بارەوە قسەی جوانی کردووەو فەرموویەتی: (ونحب أصحاب رسول الله صلى الله عليه وسلم ولا نفرط في حب أحد منهم، ولا نتبرأ من أحد منهم، ونبغض من يبغضهم، وبغير الخير يذكرهم، ولا نذكرهم إلا بخير، وحبهم:

دین، وإیمـان، وإحســـان، وبغضــهم: کفـر، ونفـاق، وطغیـان) واته ئـێمه ئەوانمـان خۆشدەوێت و ڕقمان له هەر کەسێکه ڕقی لێیان بێت و خۆشەویستی ئەوان به دین و ئیمان وچاکه دەزانین وڕق لێبوونیشیان به کوفر ونیفاق دەزانین.

هاوەڵان چاکترین نەوەن له هەموو مێژووی ئیسـلامدا و تـاکو ڕۆژی قیـامەتیش ئەو هاوکێشه هەر وا دەمێنێتەوە، پلەو پایەو پێگەیەکیان هەیه که پێگەو پلەو پـایەی کەسی تریان پێ ناگات، ئەوان یەکەمین کۆمەڵ بوون که باوەڕیان به الله و به دینی ئیسلام و به پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه و سـلم هێنـا، ئەوان هەڵگـر و گەیەنەری وەحی و سوننەت بوون، به هەوڵ و بەجیهادی ئەوان دینی ئیسلام بڵاوبوویەوە.

له قورئان و له فەرمودەی صحیح دا بەڵگەی گەلێك زۆر لەسەر فەزڵ و پـێگەی بەرێزی هاوەڵان هاتووه الله له هەموویان و لەیەك به یەکیان ڕازی بێت، لەوانه:

-ئایەتی: (لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَـاجِرِينَ وَالْأَنْصَـارِ الَّذِيـنَ اتَّبَعُـوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ ) التوبة:١١٧.

-ئایەتی: (وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَـا الَّذِيـنَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّـكَ رَءُوفٌ رَحِـيمٌ) الحشر:١٠.

-(لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُـؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَـكَ تَحْـتَ الشَّـجَرَةِ فَعَلِـمَ مَـا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحاً قَرِيباً) الفتح:١٨.

-(وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ) التوبة:١٠٠.

-(وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِنَ الْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الْإِيمَانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعِصْيَانَ أُولَئِكَ هُمُ الرَّاشِدُونَ) الحجرات:٧.

-الله عزوجل فەرمويەتی: ( مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ ۚ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا ۖ سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنْجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا) الفتح: ٢٩. لەم ئایەتەدا وزۆر ئایەتی تریش کە هەندێکیمان باس کرد، الله عزوجل ستایشی هاوەڵان دەکات ودەفەرمویت ئەوانە توند و بەهێزن لە دژی بێباوەڕان و لە نێوان خۆیاندا بەڕەحم و بەسۆزن، هەروەها ستایشی عیبادەتەکانیان دەکات و ئەوەمان بۆ باس دەکات کە نیشانەو ڕوناکی عیبادەت لە نێوچەوانیاندا دیارە و لە کۆتایی وسف و ستایشێکی زۆر فەرموویەتی :(يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ

الْكُفَّـارَ ﷻ ) كه ئەوەی لـێ وەردەگیرێـت هەركـێ ڕقـی له هـاوەڵان بێـت وبـوغزی بەرانبەریان هەبێت ئەوە موسوڵمان نییه.

-له فەرموودەكانی پێغەمبەر یشدا صلی اللـه علیـه و سـلم چەنـدین فەرمـوودە هاتووە لێرەدا هەندێكیان دەخەینەڕوو، لەوانه:

-( لا تَسُبُّوا أصْحابِي، لا تَسُبُّوا أصْحابِي، فَوالذي نَفْسِي بيَدِهِ لو أنَّ أحَدَكُمْ أنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا، ما أدْرَكَ مُدَّ أحَدِهِمْ، ولا نَصِـيفَهُ) [١] ئەگەر هەر كەسـێك له غەیـری هاوەڵان الله لێیان ڕازی بێت به ئەنـدازەی شـاخێك زێـڕ ببەخشـێت له پێنـاو اللـه عزوجل ناگاته گوێلێك بەڵكو نیو ئەوەندی بەخشینی ئەوان.

-(النُّجومُ أَمَنةُ السَّـماءِ، فـإذا ذَهَبَـتِ النُّجـومُ أتى السَّـماءَ مـا تُوعَـدُ، وأنـا أَمَنـةٌ لِأصحابي فإذا ذَهَبْتُ أتى أصحابي ما يُوعَدونَ، وأصـحابي أَمَنـةٌ لِأُمَّتـي فـإذا ذَهَـبَ أصحابي أتى أمَّتِي ما يُوعَدونَ)[٢] النـووي فەرمـوویەتی: واتـای فەرمـودەكه ئەوەیه تاكو ئەستێرەكان مابن ئاسمانیش دەمێنێت، تاكو منیش مابم هاوەڵانم له شەڕو فیتنه سەلامەت دەبن و خەڵكی لەهەڵگەڕانەوە له دین سەلامەت دەبن، تاكو هاوەڵانیشـم مابن بیدعه و ڕووداو وفیتنه و دەركەوتنی شـاخی شـەیتان و سـووكایەتی كـردن به مەدینه وزۆر كارەساتی تر ڕوو نادەن ودەرناكەون. [٣]

---

(١) البخاري: (٣٦٧٣). مسلم: (٢٥٤١).

(٢) رواه مسلم (٢٥٣١).

(٣) شرح مسلم: (١٦/ ٨٣).

-هەروەها لە فەرموودەی صحیح دا هاتووە:(يَأتي عَلى النَّاسِ زَمانٌ يَغزو فِئامٌ مِنَ النَّاسِ فيقالُ لهم: فيكم من رَأى رَسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم؟ فيَقولونَ: نَعَم، فيُفتَحُ لهم، ثُمَّ يَغزو فِئامٌ مِنَ النَّاسِ فيُقالُ لهم: فيكم من رَأى مَن صَحِبَ رَسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم؟ فيَقولونَ: نَعَم، فيُفتَحُ لهم، ثُمَّ يَغزو فِئامٌ مِنَ النَّاسِ فيُقال لهم: هَل فيكم من رَأى من صَحِبَ مَن صَحِبَ رَسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم؟ فيَقولونَ: نَعَم، فيُفتَحُ لهم)[١].

ابنُ بطَّال فەرموویەتی: (يُفتَحُ لهم لِفَضلِهِم، ثُمَّ يُفتَحُ لِلتَّابعينَ لِفَضلِهِم، ثُمَّ يُفتَحُ لِتابعيهِم لِفَضلِهِم، وأوجَبَ الفَضلَ لِثَلاثةِ القُرونِ، ولَم يَذكُرِ الرَّابِعَ، ولَم يَذكُرْ فَضلًا، فالنَّصرُ فيهِم أَقَلُّ) [٢] واتە فەتح بۆ ئەو سێ سەدە دەكرێت كە باسی سەدەی چوارەم ناكات لەبەر فەزڵ و پلەو پایەیان.

-رسول الله صلى الله عليه و سلم فەرموویەتی: (قَرْني، ثُمَّ الَّذينَ يَلُونَهم، ثُمَّ الَّذينَ يَلُونَهم، ثُمَّ يَجيءُ قَومٌ تَبدُرُ شَهادةُ أحَدِهِم يَمينَهُ، وتَبْدُرُ يَمينُهُ شَهادَتَه) .

ابنُ هُبَيرة فەرموویەتی: (في هَذا الحَديثِ دَليلٌ عَلى أنَّ خَيرَ النَّاسِ الَّذينَ صَحِبوا رَسولَ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم ورَأوهُ، ثُمَّ التَّابِعونَ لهم بإحسانٍ، كما قال عَزَّ وجَلَّ: والَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ) [٣]واتە: ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی

(١) البخاري (٢٨٩٧)، ومسلم (٢٥٣٢).

(٢) شرح صحيح البخاري: (٥/ ٩١).

(٣)بڕوانە: الإفصاح، (٢/ ٤٩).

چاکترین کەسانێك ئەوانەن کە هاوڕێتی پێغەمبەریان کردووە صلی الله علیه و سلم و ئەویان بینیوە.

لە پێشەوا أحمد بن حنبل دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: هەرکێ جنێو و سووکایەتی بە هەردوو سەرگەوەری موسوڵمانان أبوبکر و عمر بکات الله لێیان ڕازی بێت لە ئیسلام دەردەچێت. (١)

ئەهلی سوننەت هەموو هاوەڵانیان خۆش دەوێت وداوای لێخۆشبوون و ڕەزامەندی پەروەردگاریان بۆ دەکەن، لە هەموو کەس و لایەنێکیش کە ڕقی لەوان بێت یان سووکایەتییان پێ بکات یان بەکافریان بزانێت بەرائەتی خۆیان دەردەبڕن و حاشایان لێ دەکەن، هاوکات لە هەموو ئەوانەش سنووری شەرعی و ئەدەب بەرانبەر بە ئالوبەیتی پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم دەشکێنن وڕێزی پێویستیان لێ ناگرن بەرین و بەوەش ڕازی نابن وەکو چۆن بە جنێودان بە سەحابەکان ڕازی نابن.

سەبارەت بەو شەڕو ئاشووبەی لە نێوان هاوەڵاندا ڕوویداوە ئەهلی سوننەت زمانی خۆیان لە قسە کردن لەسەر ئەو مەسەلە دەگرن و داوای لێخۆشبوون و ڕەزامەندی الله بۆ هەموویان دەکەن، ئینجا وەکو شیخ الإسلام ابن تیمیة لە (العقیدة الواسطیة) دا فەرموویەتی ئەو شتانەی کە دەربارەی هاوەڵان دەوترێت وسەبارەت بەو جەنگانەی لە نێوانیاندا درووست بووە هەمووی ڕاست نییە، بەڵکو

(١) بڕوانە: المسائل والرسائل المروية عن الإمام أحمد في العقيدة(٢/٣٦٣).

هەنـدێکی هەر لە بنچینـەوە ڕاسـت نیـیە و هەڵبەسـتراوە، هەندێکیشـی ڕاسـتە و بنەمایەکی لە ڕاستیدا هەیە بەڵام دەستکاری کراوەو بۆی زیاد کراوە وزێدەڕەوی لە باسکردنیدا کراوە، ئەوەشی کە ڕاستە و لە نێوان هاوەڵاندا ڕوویداوە ئیجتیهاد بووە و لەبەر ئەوەی هاوەڵان معصوم نەبوونە هەنـدێکیان لە ئیجتیهادەکەیانـدا ڕاسـتییان نەپێکاوە وهەڵە بوونە، لەگەڵ ئەوەشدا چونکە مەبەستیان حەق بـووە یەك پاداشـت وەردەگرن و ئەوانەشی ڕاستییان پێکاوە دوو پاداشت وەردەگرن.

لەم بارەشەوە بۆ ئەوەی موسوڵمان تووشی هەڵە و تاوان نەبێت و قسەیەك نەکات سنووری ئەدەب و بەگەورەزانینی ئەوان نەبەزێنیت، پێویسـتە کتێبەکـانی عەقیـدەو ئەهلی سوننەت بخوێنیتەوە بەتایبەتی لەوانەی کە باسی هاوەڵانی بە تایبەت تێـدایە بۆ نموونە کتێبی (العقیدة الواسطیة) ی پێشەوا ابن تیمیـة و کتێبـی (العواصـم مـن القواصم) ابن العربي ش کتێبێکی چاکە دەربـارەی هـاوەڵان و هەروەهـا (مختصر السیرة النبویة) ی شێخ محمد بن عبدالوهاب.

پێش ئەمانەش لە کتێبە سەرەکییەکانی عەقیدەدا بنەمای خۆشویستنی هـاوەڵان و حوکمی سوکایەتی پێکردنیان هاتووە بۆ نموون لە کتێبی (الشریعة) ی الآجـري و (الإبانة) ی ابن بطـة و بگـرە لە زۆربەی کتێبەکـانی عەقیـدەدا ئەو مەسـەلە وەکـو بنەمایەکی سەرەکی لە بنەماکانی عەقیدە لەلای ئەهلی سوننەت باس کراوە.

لەم بارەشەوە دەبێت موسوڵمانی موەحید وریای ئەوانە بێت کە بەنـاو ئیسـلامەوە جارێك وەکو بانگخواز و جارێك وەکو سەرکردەی حیزبـی ویـان بە نـاوو سـیفەتی ترەوە سنووری ئەدەب بەرانبەر هاوەڵە مەزنەکانی پێغەمبەر مان صـلی اللـە علیـە و

سلم دەبەزێنن و قسە بەهاوەڵان دەلێن وبەناڕاستەوخۆ سووکایەتییان پێ دەکەن، کە زۆر جار ئەو کارەیان شفرە و پەیامی ناڕاستەوخۆیە بۆ لایەن و کەسانی دیاریکراو کە لەپاڵ ئەو سووکایەتی کردنەیان بە هاوەڵان پارەو بەرژەوەندی حیزبی و کەسێتی خۆیانی پێ دەستەبەر دەکەن.

زۆرن ئەوانەی لەناو عەرەبی بەناو سوننە لە وڵاتە عەرەبییەکاندا قسە بە هاوەڵان دەڵێن و سووکایەتییان پێ دەکەن، یەکێك لەوانەی کە بەو کارە ناشیرینە ناسراوە عدنان إبراهيم و طارق السويدان و زۆری تر، هەروەها لەلای خۆیشمان هەندێك هەن ماوەی جارێك قسە بە سەرگەورەمان معاوية و باوکی وبگرە بە زۆرێك لە هاوەڵان دەڵێن الله لە یەك بەیەکیان ڕازی بێت، بەو کارەیان دەیانەوێت دەستکەوت و ئیمتیازاتیان دەست بکەوێت وبەوە ناو وشوهرەت بۆ خۆیان درووست بکەن.

بۆیە موسوڵمانان دەبێت وریابن و لەسەر هاوەڵان بەغیرەت بن و ئامۆژگاری خێری ئەو جۆرە کەسانە بکەن و تێیان بگەیەنن کە سەحابەکان سەرگەورە و شانازی ئێمەن و خۆشەویستییان بەدین و ئیمان وعیبادەت دەزانین وسووکایەتی پێکردنیان بە هێڵی سوور و بە گومڕایی دەزانین.

موسوڵمان چەند ئامادەیە لە باوك ودایك و کەسوکارە نزیکەکانی خۆی بەرگری بکات، بەهەمان شیوە پێویستە بەرگری لە هاوەڵان بکات و خۆشەویستی خۆی بۆ ئەوان بسەلمێنێت وناوی منداڵەکانی بەناوی ئەوانەوە بنێت.

هاوەڵان الله لێیان ڕازی بێت وەکو ابن الصلاح لە المقدمة کەیدا دەڵێت: (للصَّحابةِ بأسْرِهم خَصيصةٌ، وهي أنَّه لا يُسألُ عن عدالةِ أحَدٍ منهم، بل ذلك أمرٌ مَفروغٌ منه؛ لكونِهم على الإطلاقِ مُعَدَّلين بنُصوصِ الكِتابِ والسُّنَّةِ، وإجماعِ من يُعتَدُّ به في الإجماعِ من الأُمَّةِ) (١)

واتە: هاوەڵان تایبەتمەندییەکیان هەیە کەسی تر جگە لەوان ئەو تایبەتمەندییەی نییە، ئەویش ئەوەیە دەربارەی دادگەرییان پرسیار لەکەس ناکرێت، چونکە مەسەلەی دادگەری و پلەو پێگەی ئەوان مەسەلەیەکە لە قورئان و لە سوننەتی پێغەمبەردا صلى الله عليه و سلم بڕاوەتەوە وئوممەتیش لەسەری یەك دەنگن.

النَّووي فەرموویەتی: (وكُلُّهم عُدولٌ رَضِيَ اللهُ عنهم، ومتأوِّلون في حُروبِهم وغَيرِها، ولم يُخرِجْ شَيءٌ من ذلك أحدًا منهم عن العدالةِ،... ولهذا اتَّفَق أهلُ الحَقِّ ومن يُعتَدُّ به في الإجماعِ على قَبولِ شَهاداتِهم ورواياتِهم، وكَمالِ عَدالتِهم رَضِيَ اللهُ عنهم أجمعين) (٢)واتە هەموو هاوەڵان ڕاستگۆ و دادگەرن و بۆ ئەو شەڕانەی کە کردوویانە تأویل یان کردووە، بۆیە ئەممەتی ئیسلام لەسەر ئەوەی ڕیوایەت و فەرموودەو شایەتییان وەرگیراوە و کۆك و یەك دنگن.

لە ڕاستیدا ئەگەرچی قسە وتن بەهاوەڵان و جنێودان پێیان - وەکو زانایان دەڵێن - هەمووی یەك ئاست نییە و لە حوکمەکەیدا جیاوازی هەیە، بەلام بەشێوەیەکی

---

(١) مقدمة ابن الصلاح،٣٩٧.
(٢) شرح مسلم، (١٤٩/١٥).

گشتی سنوور بەزاندن بەرانبەریان و سووکایەتی کردن بەرانبەریان بۆی هەیە ببێتە هەڵوەشێنەرەوەیەك لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام، لەبەر زۆر هۆکار لەوانە:

١- جنێودان بە هاوەڵان جۆرێکە لە ڕەتکردنەوەو بەدرۆدانانی قورئانی پیرۆز، چونکە قورئانی پیرۆز ئەوانی بەدادگەر ناساندووە و تەزکیەیە وستایشی کردوون، بەڵکو وەکو ابن تیمیة فەرموویەتی الله تعالی بە شێوەیەکی ڕەها لەوان ڕازی بووە وفەرموویەتی: (وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ) التوبة:١٠٧. الله تعالی لە کەسێك ڕازی نابێت تاکو نەزانێت کە هۆکارەکانی ڕەزامەندی خۆی تێدا کۆنەبووەتەوە.

٢- هەرکێ جنێو بە هاوەڵە ئازیزەکان بدات و لەشانیان کەم بکاتەوە و تۆمەتی فیسق و کوفر بداتە پاڵیان، لە ڕاستیدا ئەو کەسە سووکایەتی بە پێغەمبەر کردووە صلی الله علیه و سلم و ئازاری جەنابیانی داوە، چونکە ئەوانە لە ژێر چاودێری مامۆستاکەیاندا پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم پەروەردە بوون.

أبو زُرعةَ فەرموویەتی: (إذا رأيتَ الرَّجُلَ ينتَقِصُ أحدًا من أصحابِ رَسولِ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم فاعلَمْ أنَّه زِنْديقٌ، وذلك أنَّ الرَّسولَ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم عندنا حَقٌّ، والقُرآنَ حَقٌّ، وإنَّما أدَّى إلينا هذا القُرآنَ والسُّنَنَ أصحابُ رَسولِ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم، وإنَّما يريدون أن يَجرُحوا شُهودَنا لِيُبطِلوا الكِتابَ والسُّنَّةَ، والجَرحُ بهم أَولى، وهم زنادِقةٌ)(١).

(١) الكفاية في علم الرواية، الخطيب البغدادي (لاپەڕە: ٤٩

٣- جنێــودان بە ســـەحابە و تـــانەدان لە دینیـــان تـــانەدانە لە ئیســـلام و پووچەڵکردنەوەیە بۆ شەریعەتەکەی، چونکە شەریعەت و ئیسلام بەگشتی ئەوان بـۆ ئێمەیان گواستووەتەوە.

٤- جنێودان و سووکایەتی کردن بە هاوەڵان، بەگومرا دانـانی تێکـڕای ئـوممەتی موحەممەدە صـلی اللـه علیـە و سـلم، واتـای ئەوەش دەگەیەنێـت ئەم ئـوممەتە بە پێچەوانەی ئەوەی لە قورئاندا باس کراون خراپترین ئوممەتن.

ابن عثیمین دەربارەی حوکمی جنێودان بەهاوەڵان دەڵێت ئەو کارە دەبێـتە سـێ بەشەوە:

یەکەم/ نجنێـودان و قسـەکردنەکە بەشـێوەیەك بێـت واتـای ئەوە بگەیەنێـت کە هەموویان یان زۆربەیـان تەکفیـر بکـات، ئەوە دەبێـتە کـوفر دەرچـوون لە ئیسـلام، چونکە ئەوە بەدرۆدانان و نکۆڵی کردنە لە ڕاستیتی قسەی اللـه تعـالی و پێغەمـبەر صلی الله علیە و سلم کە ستایشی هاوەڵانیان کردووە و لێیـان ڕازی بـوونە، بەڵکـو گومان کردن لە کوفری ئەو جۆرە کەسانە بۆ خۆی دەبێتە کـوفر، چـونکە ئیسـلام بە شیوەیەکی گشتی لە ڕێگەی ئەوانەوە پێمان گەیشتووە.

دووەم/ ئەگەر جنیودانەکە تەکفیرکـردن نەبێـت بۆیـان بەڵکـو ناشـیرین کـردن و سووکایەتی پێکردنیان بێت، ئەوەش زانایان دوو بۆچوونیان هەیە لەسەری یەکێکان دەڵێت پێی کافر دەبێـت و ئەو بۆچـوونەکە دەڵێـت پێـی کـافر نابێـت بەڵام دەبێـت زیندان بکرێت تا ئەو کاتەی واز لەو کارەی دەهێنێت.

سێیەم /ئەگەر جنێودانەکە بە شـێوەیەك بێـت کە تـانە نەبێـت لە دینەکەیـان، بـۆ نموونە بە یەکێك لە هاوەڵان بڵێـت ترسـنۆك بـووە، یـان چـرووك بـووە، ئەوە تەنهـا تەعزیر ئەکرێت واتە سزایەکی کەمتر لە سزا شـەرعییەکانی زینـا و دزی و بوختـان بەسەردا دەدرێت بۆ ئەوەی ببێتە تەمبێیەك بـۆی و فێـر ببێـت چـۆن دەربـارەی ئەو کەڵە پیاوانە قسە دەکات.

# نیفاق ودووڕوویی

پێشەوای ئەهلی سوننەت أحمد بن حنبل رحمه الله لە پێناسـەو باسـی نیفاقـدا فەرموویەتی: (**وَالنِّفَاقُ هُوَ: اَلْكُفْرُ، أَنْ يَكْفُرَ بِاَللَّهِ وَيَعْبُدَ غَـيْرَهُ، ويُظْهِـرَ اَلْإِسْـلَامَ فِي اَلْعَلَانِيَةِ، مِثْلَ اَلْمُنَافِقِينَ اَلَّذِينَ كَانُوا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اَللَّهِ صلى الله عليه و سلم**) .

مونافیق ئەو کەسەیە کە دوو ڕووی هەیە، ڕوویەکیـان دیـارە و وەکـو موسـوڵمان دەردەکەوێت، ڕووەکەی تری ئەوەیە کە دیار نییە و دەیشـارێتەوە کە بـریتییە لەوەی کەسێکی بـێ بـاوڕە و پـێچەاونەی ئەوەیە کە دەریـدەخات، ئەمەش وەکـو پێشـەوا أحمد فەرموویەتی کوفرە ، چونکە حەقیقەتی حاڵی ئەو کەسە ئەوەیە باوەڕی بە الله نییە وشـەریعەتەکەی ڕەتـدەکاتەوە بەڵام لەبەر هۆکـاری جیـاواز کە لە دیارترینیـان ترس و بەرژەوەنـدی و خـۆڵ لەچـاوکردنە، دەچێـت موسـوڵمانێتی خـۆی بە درۆ و بەناڕاستی دەردەخات.

بۆ نموونە ئەو مونافیقانەی لە سەردەمی پێغەمبەردا بوون صلى الله عليـه و سـلم وەکو عبدالله بن أبي بن سلول وهاوڕێکانی و تاکو ئەم ڕۆژگارەش هەمیشە خەڵکی لەو جۆرە بوونیان هەیە کە بەزاهیر وەکو موسـوڵمان دەردەکەون وڕەنـگە هـاتوچۆی مزگەوتیش بکەن و ڕۆژوویش بگرن وبە قسەکانیشیان نەتوانیـت لەگەڵ موسـوڵمانی راستەقینەی جیـای بکەیـتەوە لە ڕاستیشـدا بـاوەری بە ئیسـلام نیـیە وبە مەبەسـتی جێبەجێکردنی بەرنامە وپلانی خۆی کات بەسەر دەبات و وەکـو ئەکـتەر تەمسـیلی غەیری حەقیقەتی خۆی دەکات.

الله تعالی وەسفی حاڵی ئەو مونافیقانە دەکات و دەفەرموێت: ( إِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمْ قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ) البقرة:١٤. واتە کاتێك بە موسوڵمانان دەگەن دەڵێن ئێمە موسوڵمانین و وەکو ئێوە باوەڕمان بە ئیسلام و شەریعەتەکەی هەیە وکاری پێ ئەکەین و ڕقمان لە بێ باوەڕی و لە بێ باوەڕانە، بەڵام کاتێك دەچنەوە ناو کۆڕو کۆمەڵی خۆیان و بە هاودینەکانی خۆیان دەگەنەوە پێیان دەڵێن ئەو موسوڵمانەمان چاك خەڵەتاندووە و باوەڕیان پێ کردووین کە ئێمەش باوەڕمان بە ئیسلام هەیە.

نیفاق و دوو ڕوویی لە کاتی بەهێزبوونی ئیسلام و موسوڵماناندا سەرهەڵدەدات، چونکە لێیان دەترسن و بە شاردنەوەی کوفرەکەیان لە سزا و لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوان ڕزگاریان دەبێت، بەڵام لەم سەردەمەدا کە ئیسلام بەهۆی شوێنکەوتووەکانییەوە کە بەبێ هەڵوێسترین نەوەی ئیسلام لە هەموو مێژوودا دەژمێردرێن لەگەڵ ئەوەی کە گۆڕەپانی سیاسەت وحوکم و بوارەکانی تردا کاریگەرییەکانی نەماوە، بەڵام بۆ درێژەدان بەو نەفامی و بێ هەڵوێستییەی موسوڵمانان تێدا دەژین و ئاگایان لە خۆیان نییە، بێ باوەڕان و نەیارانی ئیسلام تاکو ئێستاش هەر ئەو دوو ڕووییە ئەنجام دەدەن وتوانیومانە ملیۆنەها موسوڵمانی سادە وتێنەگەیشتوو لە دینەکەی وا حاڵی بکەن کە عەلمانی و لیبرالی وبگرە مارکسی و هەرچی خاوەن ڕێچکەو ڕێبازە لادەرەکان هەیە ئەوانیش هەر موسوڵمانن وبگرە نەفامی و جەهلی موسوڵمانان بە عەقیدەکەیان گەیشتووە بەوەی باوەڕیان وایە

جولەکە و نەساڕاکانیش هەر دەچنە بەهەشتەوە وبەمەش خراپترین جیل و نەوەی موسوڵمانان لە درێژایی مێژوودا ئێستا لەم سەردەمەدا بوونیان هەیە.

الله تعالى لەسەرەتای سورەتی البقرة دا باسی سێ جۆر و چینی لە خەڵکی کردووە:

جۆری یەکەم: ئیماندارن: کە لە چوار ئایەتی سەرەتای سوڕەتەکەدا باسی کردوون.

جۆری دووەم: کافر و بێ باوەڕان کە لە زاهیر و لە باتیندا هەر کافرن و لە دوو ئایەتدا باسی ئەوانی کردووە.

جۆری سێیەم: مونافیق و دوو ڕووەکانن کە لە سیانزە ئایەتدا باسی کردوون و سیفەتەکانی ئەوانی خستووەتەڕوو وەکو: ئەوەی دەیانوت: (ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ) واتە ئێمەش باوەڕمان بە اللە و بەڕۆژی دوایی هەیە کە ئەو قسانەیان ڕاست نەبوو وهەولێك بوو بۆ خەڵەتاندنی موسوڵمانان .

لە قورئانی پیرۆزدا لە چەندین سوڕەتدا باسی مونافیقەکان کراوە، بۆ نموونە لە سوڕەتی محمد صلى الله عليه و سلم کۆمەڵێك لە وەسفەکانی ئەوان هاتووە و هەروەها لە سوڕەتێکی سەربەخۆدا کە سوڕەتی المنافقون ە ئەوان باسکراون.

نزیکترین کۆمەڵ لە کۆمەڵی مونافیقان لەم سەردەمەی خۆماندا عەلمانییەکانن، چونکە سەرەڕای ئەوەی بنەماکانی ڕێبازەکەیان ئیسلام و ئاینن بە ڕەهایی ڕەتدەکاتەوە و بە بەشێك لە دواکەوتن و بە پاشماوەی سەدە تاریکەکانی دەژمێرێت وسەرەڕای ئەوەی کە ئەمڕۆ ئەوان لە تەواوی جیهاندا و لەڕێگەی سیاسەت و

حـوکم و ئـابووری و ڕاگەیانـدنەوە کە لە هەمـوو وڵاتێکـدا بەدەسـتی خۆیـانە و بەردەوام خەریکی شێواندن و ناشیرین کردنی دینن و سەرقاڵی تێکدانی ڕەوشتن لە کۆمەڵگاکاندا، لەگەڵ ئەوەشدا مەبەستیانە بەرانبەر موسوڵمانە بێ ئاگا و نەفامەکـان لە دیـنەکەی خۆیـان کە ئەمـڕۆ بـوونەتە زۆریـنە، خۆیـان وا دەربـخەن کە ئەوان موسوڵمانن و ڕێگر نین لەوەی خەڵکی بچێتە مزگەوت وحەج بـکەن و بەڵکـو ڕێگـر نین لەوەی ناوەنـدەکانی فێرکردنـی تەجویـدی قورئـان و ئەو جـۆرە چالاکییـانەش بکرێتەوە و ئاسانکاریشی بـۆ دەکەن، بـێ ئاگـا لەوەی هۆکـاری هاوکـاری کردنـی ئەوان بۆ ئەو جـۆرە چـالاکی و عیبادەتـانە لەبەر ئەوەیە کە ئەوان لە عەقیـدەکەیان دوور کەوتوونەتەوەو بنەمای (ولاء و براء) یـان لەبیـر کـردووە و هـیچ شـتێك نیـیە ئەوان بە هەڵوەشێنەرەوەی ئیسلامی بزانن و ئەو قورئانەش کە دەیخوێننەوە تەنها لە ڕواڵەتی خوێندنەوەکەی تێدەگەن و لەبەرنامەو حوکمەکانی زۆر بەکەمی تێدەگەن.

هەروەها لەناو سیاسەتمەداراندا - بەدەر لە ئینتیمایان و لە گەل هەندێ جیاوازی - سیفەتی نیفاق گەلێك زۆرە، چونکە سیاسـەت لەم ڕۆژگـارەدا بە سروشـتی خـۆی لەسەر درۆ و دوو فاقەیی دامەزراوە، سیاسییەکان بەردەوام پێویستیان بەدرۆکـردنە و بەبێ درۆکردن ڕەنگە ئیشی یەك ڕۆژیان ڕێ نەکات، بەڵام نیفاق لە ناو سیاسـەتدا ناوەکەی گۆڕاوە و بە زیرەکی و کارامەیی دەژمێردرێت و عەیبەیەکی تێدا نییە.

بەداخەوە لەنـاو بەشـێك لە چینێکـی تریشـدا کە وەکـو مامۆسـتای ئـایینی و ڕێپیشاندەری خەڵکی بۆ ئیسلام خۆیان دەناسێنن لەناو ئەوانیشدا سیفەتی نیفـاق بە شێوەیەکی بەرچاو بوونی هەیە وبە ڕواڵەت باسی قورئـان و فەرمـوودەو شـەریعەت

ئەکەن و لە واقعیشدا کەسانێکی عەلمانین ولەناو بەرنامەی نـاکۆك لەگەڵ ئیسـلام و بەرنامەو شـەرعەکەیدا کـار دەکەن و لە زۆر ڕسـدا حـوکم بە غەیـری شـەریعەتی ئیسلام دەکەن.

زانایان دەڵێن کوفری نیفاق کە یەکێکە لە شەش جـۆری کـوفر، جـۆری زۆرە و تەنها بریتییە نییە لە یەك جۆر وشێواز ، لەوانە:

١- ئیلحاد وباوەڕنەبوون بە الله عزوجل.

٢- بەدرۆ دانان و ڕەتکردنەوەی هەندێك لە حوکمەکانی الله تعالی.

٣- بەدرۆدانان و ڕەتکردنەوەی دین و پەیامی پێغەمبەر صلی الله علیە و سلم.

٤- ڕەتکردنەوەی بەشێك لە دین و شەریعەتی پێغەمبەر صلی الله علیە و سلم.

٥- بێزاری و ڕق لێبوونی الله عزوجل ودینەکەی.

٦- خۆشـــحاڵ بـــوون بە لاوازی ئیســـلام و موســـوڵمانان و خەون بینـــین بە شکستخواردنی دینی محمد صلی الله علیە و سلم.

٧- قەلس بوون و بێزاربوون بە سەرکەوتنی ئیسلام و موسولمانان.

هەنـــدێکیش لە زانایـــان بە شـــێوەیەکی تـــر مونافیقـــان پـــۆلێن دەکەن و دەڵـــێن جۆرەکانی ئەوان بریتیە لە: باوەڕنەبوون بە الله، باوەڕ نەبوون بە پێغەمبەر صلی اللـە علیـە و سـلم، ڕق لێبـوونی اللـە، ڕق لێبـوونی پێغەمـبەر صـلی اللـە علیـە و سـلم، خۆشـحاڵ بـوون بە لاوازی دینـی ئیسـلام، خۆشـحاڵ بـوون بە لاوازی ئیسـلام و موسوڵمانان.

ئەوەی کە زانایان بە (الشِّرْكُ والكُفْرُ الأكْبَرُ) ناویـان بـردووە بـریتییە لەوەی کە لەگەڵ بنچینەو بنەمـای دینـدا کە تەوحیـدە و دەسـتگرتنە بە تێکـڕای شـەریعەتەوە تێکدەگیرێت وخاوەنەکەشی لە بازنەی ئیسلام دەردەکات.

بەڵام ئەوەی کە بە (الشِّرْكُ والكُفْرُ الأصْغَرُ) ناویان بردووە بـریتییە لەو شـتانەی کە ناگاتە ئەو حاڵەتە و لەوە بچـووکترە و تەوحیـد هەلناوەشـێنیتەوەو لەو جـۆرەش نییە کە لە شەرعدا (اللمم)ی پێ دەوترێت کە گوناهی بچـووکە، وەکـو اللـه تعـالی فەرموویەتی: (إِن تَجْتَنِبُوا كَبَائِرَ مَـا تُنْهَـوْنَ عَنْـهُ نُكَفِّـرْ عَـنكُمْ سَـيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا) النساء: ٣١.

بنچینەکەش ئەوەیە هەرچـی تاوانێـك بەبەڵـگەی شـەرعی سـەلمابێت کە شـیرکە بەڵام خاوەنەکەی لە ئیسلام دەرناکات ئەوە شـیرکی بچـووکە، هەرچـی تـاوانێکیش بەبەڵگەی شەرعی سـەلمابێت کە کـوفرە و لەگەڵ ئەوەشـدا خـاوەنەکەی لە ئیسـلام دەرناچێت ئەوە کوفری بچووکە، وەکو ئەوەی لە فەرموودەکاندا هاتووە (لـیس منـا من فعل كذا وكذا) یان هەندێ جار پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم لێی بەریبـووە، یان کەماڵی ئیمانی لێ لابردووە، هەموو ئەوانە زانایان وتوویانە ئەوە کوفری بچووکە وخاوەنەکەی لە ئیسلام دەرناچێت.

هەر بۆیە أبو عُبيدٍ القاسِمُ بنُ سَلَّامٍ: دەڵێـت (أمَّـا الآثـارُ المروِيَّـاتُ بـذِكرِ الكُفْـرِ والشِّرْكِ، ووجوبِهما بالمعاصي، فإنَّ معناها عندنا ليسـت تُثبِـت عـلى أهلِهـا كُفـرًا ولا

شِركًا يزيلانِ الإيمانَ عن صاحِبِه، إنَّما وجوبُها أنَّها من الأخلاقِ والسُّنَنِ التي عليها الكُفَّارُ والمُشْرِكون) (١)

بەڵام پێشەوا أحمد بن حنبل پۆلێنێکی تری بۆ ئەو مەسەلەی کوفری گەورەو بچووکە هەیە و ئەنجامدەری تاوانی گەورەی بە ئیماندار نەزانیوەو تەنها سیفەتی ئیسلامی بۆ جێگیر کردووەو فەرموویەتی: (من أتى هذه الأربعةَ: الزِّنا، والسَّرِقةَ، وشُرْبَ الخَمرِ، والنُّهبةَ التي يرفع النَّاسُ فيها أبصارَهم إليه، أو مِثْلَهنَّ أو فوقهنَّ؛ فهو مُسْلِم، ولا أُسَمِّيه مُؤمِنًا، ومن أتى دون الكبائِرِ نُسَمِّيه مُؤمِنًا ناقِصَ الإيمانِ) (٢)واتە: هەرکێ ئەم چوار تاوانە ئەنجام بدات: زینا و دزی وعارەق خواردن وتاوانی لەوجۆرە ئەو کەسە موسوڵمانە و ناڵێم ئیماندارە، هەرکێیش لە کەبائیر کەمتر ئەنجام بدات ئەوە ئیماندارە بەڵام ئیمانەکەی نوقسان و ناتەواوە.

هۆکاری ئەو وتەیەی ئیمام أحمد یش وەکو محمَّدُ بنُ نَصرٍ المَرْوزيُّ دەڵێت ئەوەیە: (صاحِبُ هذا القَوْلِ يقولُ: لَمَّا نفى عنه النبيُّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم الإيمانَ، نَفَيتُه عنه كما نفاه عنه الرَّسولُ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم، والرَّسولُ لم يَنْفِه إلَّا عن صاحِبِ كبيرةٍ، وإلا فالمُؤمِنُ الذي يفعل الصَّغيرةَ هي مكفَّرةٌ عنه بفِعْلِه للحَسَناتِ واجتنابِه للكبائِرِ، لكِنَّه ناقِصُ الإيمانِ عَمَّن اجتنب الصَّغائِرَ) (٣) واتە: لەبەر ئەوەی پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم نەفی ئیمانی لەو جۆرە کەسانە کردووە واتە نکۆڵی

---

(١) بڕوانە: الإيمان، ٤٣.

(٢) بڕوانە: مجموع الفتاوى: (٣٥٢/٧).

(٣) بڕوانە: مجموع الفتاوى، ابن تيمية (٣٥٢/٧).

لێ کردووە، ئێمەش نەفی ئەکەین ونکۆڵی لێ ئەکەین، کە لەڕاستیدا پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم ئیمانی تەنها لەسەر ئەهلی کەبائیر نەفی کردووەو بۆ لەوانە بچووکتر بە کردەوەی چاکە دەسڕێتەوە.

نموونەی شیرکی بچووکیش وەکو ڕوپامایی و ڕیایی کە پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم فەرموویەتی: (من حَلَف بغير الله فقد أشرك). (١)

دانەر پاش ئەوەی باسی نیفاقی کرد کە کوفری گەورەیە و خاوەنەکەی لە میللەتی ئیسلام دەردەکات، ئینجا هاتە سەر باسکردنی جۆری دووەمی نیفاق کە خاوەنەکەی لە ئیسلام دەرناکات.

أحمد بەڕەحمەت بێت چەند نموونەیەك بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم جۆرە نیفاقە دەهێنیتەوەو دەڵێت: پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم فەرموویەتی: (ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ فَهُوَ مُنَافِقٌ ،هَذَا عَلَى اَلتَّغْلِيظِ، نَرْوِيهَا كَمَا جَاءَتْ، وَلَا نُفَسِّرُهَا) مەبەستی لەو فەرموودە صحیح یە کە پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم فەرموویەتی: (ثلاثٌ من كنَّ فيه فهو منافقٌ وإنْ صام وصلَّى وزعم أنه مسلمٌ إذا حدَّث كذبَ وإذا وعد أخلفَ وإذا ائتمِنَ خانَ) مسلم: (٥٩). واتە ئەم فەرموودەی کە درۆ و ناڕاستی پەیمان و ناپاکی بە مونافیقی داناوە، ئەوە مەبەستی لە نیفاقی گەورە نییە کە خاوەنەکەی لە ئیسلام دەردەکات، بەڵکو مەبەستی لە نیفاقی بچووکە و دەفەرموێت ناونانی بە نیفاق لەبەر گەورەیی تاوانەکان و بۆ ترساندنە، بەڵام دەفەرموێت ئێمە تەفسیری ئەو

---

(١) أبو داود (٣٢٥١)، والترمذي (١٥٣٥) أحمد (٦٠٧٢).

فەرمـوودە نـاکەین، زانایـان فەرموویـانە مەبەسـتی ئەوەیە بە شـێوەیەك تەفسـیری ناکەین کە بە شێوەیەك لە زاهیـری دەری بکـات ونـاڵێین پێـی کـافر دەبێـت، بەڵام زانایان وتوویانە ئەگەر کەسێك هەمـوو ئەو تـاوانەی تێـدا بێـت بـۆ نیفـاقی گەورە ڕایەدەکێشێت .

فەرموودەی پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم: ( لَا تَرْجِعُـوا بَعْـدِي كُفَّـارًا ضُـلَّالًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ)[1]. هەروەها : ( إِذَا الْتَقَى اَلْمُسْـلِمَانِ بِسَـيْفَيْهِمَا فَالْقَاتِـلُ وَالْمَقْتُولُ فِي اَلنَّارِ )[2] هەروەها: ( سِبَابُ اَلْمُسْلِمِ فُسُوقٌ وَقِتَالُهُ كُفْـرٌ ) [3] هەورەهـا فەرموودەی : (مَنْ قَالَ لِأَخِيهِ يَا كَافِرُ فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا [4] و فەرمـوودەی : ( كُفْـرٌ بِاَللَّهِ تَبَرُّؤٌ مِنْ نَسَبٍ وَإِنْ دَقَّ ) [5] دوای هێنـانەوەی ئەو فەرمـوودانە فەرمـوویەتی: وَنَحْوُ هَذِهِ اَلْأَحَادِيثِ مِمَّا قَدْ صَحَّ وحُفِظَ، فَإِنَّا نُسَلِّمُ لَـهُ، وَإِنْ لَـمْ نَعْلَـمْ تَفْسِـيرَهَا، وَلَا نَتَكَلَّمْ فِيهَا، وَلَا نُجَادِلْ فِيهَا، وَلَا نُفَسِّرْ هَذِهِ اَلْأَحَادِيثَ إِلَّا مِثْلَ مَـا جَـاءَتْ، لَا نَرُدُّهَـا إِلَّا بِأَحَقَّ مِنْهَا) واتە هەموو ئەو فەرموودە ڕاست و درووستانە کە هەندێ تاوانی بە کوفر و بە نیفاق داناوە ئێمە وەکو خۆی جێگیریان دەکەین و باوەڕمـان پێیـانە بەڵام

(١) البخاري: العلم (١٢١) , ومسلم: الإيمان (٦٥).
(٢) البخاري: الإيمان (٣١) , ومسلم: الفتن وأشراط الساعة (٢٨٨٨).
(٣) البخاري: الإيمان (٤٨) , ومسلم: الإيمان (٦٤)
(٤) البخاري: الأدب (٦١٠٤) , ومسلم: الإيمان (٦٠).
(٥) ابن ماجه: الفرائض (٢٧٤٤) , وأحمد (٢/٢١٥).

لێکـدانەوەی بـۆ خەڵکـی نـاکەین و بە پێـی زاهیـرەکەی دەڕۆیـن و ناشـڵێین ئەنجامدەری ئەو تاوانانە کافرن بە شێوەیەك لە ئیسلام دەربچن.

ئەهلی سوننەت سەبارەت بەم مەسەلە سیفەتی کوفرو نیفاقیان وەکـو لە زاهیـری فەرموودەکاندا هـاتووە جێگیـر کـردووە بەڵام وتوویـانە ئەمە کـوفرێکی بچـووکە و خاوەنەکەی لە بازنەی ئیسلام دەرناکات.

هەر لە ڕۆشنایی ئایەت و فەرموودەکاندا فەرموویانە وەکـو چـۆن کـوفر ونیفـاق گەورەو بچووکی هەیە زوڵم و جەهل وفسق یش بە هەمان شێوە دوو جۆریان هەیە، زوڵمی کوفرر و زوڵمی تاوان، جەهلی کوفر وجەهلی تاوان، فیسقی کوفر و فیسقی تاوان. هەموو ئەوانەش بەڵگەی قورئان و فەرموودەیان لەسەرە.(١)

---

(١) پرسیار ٢٦/ ئایا مامۆستا ئەوانەی کە شـوینی علمانـی و خەیـرە ئیسـلام ئەکەون بـۆ پـارەو مەسلەحەتی دنیا ئایا حوزریان بۆ هەیە یان لە دین اچنە دەرۆ ؟

وەلام/ عەلمانییەت مەعنای لادینییە وەکو خۆیـان پێناسـەی دەکەن و ئیسـلامیش دیـنە و دینـی حەقە! ئیـتر چـۆن کەسـێك موسـوڵمان بێـت ولە هەمـان کاتـدا عەلمـانیش دەبێـت؟! ئەوە سـەرگەردانییە و درۆکـردنە لە گەڵ خۆیـدا، سـەرانی عەلمـانییەت هـیچ کـات نایشـارنەوە کە باوەڕیـان نە بە ئیسـلام و نە بەهـیچ دینێکـی تـر هەیە و باوەڕیـان وایە دیـن پاشـماوەی سـەدە تاریکەکانە و مێشکی مرۆڤ دادەخات وئەیکاتە کەسێکی دواکەوتوو، ئەوانەشیان کە ڕایان بەو شێوە بەرانـبەر دیـن تونـد نیـیە دەڵـێن دیـن ئەگەر هەشـبێت بـا مەسـەلەیەکی شەخسـی و لە بازنەیەکی تەسکدا هەبێت تایبەت بە کەسەکان خۆیان و بەو شێوەش کە عەلمانیەت پێـی ڕازی دەین و بەهیچ شێوەیەك نابێت نە حوکمی پێ بکرێت و سیاسەت و ئابوری و ڕاگەیاندن و هیچ شتێك بکەویتەژێـر کـاریگەری وحـوکمی دیـنەوە، بـۆیە ئەگەر کەسـێك بڵێـت مـن موسـوڵمانم وبەتەمای چوونە بەهەشت بێت و لەولاشەوە عەلمانی بێت یان ئیشـیان بـۆ بکـات و پشـتگیری

# بەهەشت و دۆزەخ درووست کراون

پێشەوا أحمد بن حنبل سەبارەت بەوەی کە ئێستا بەهەشت و دۆزەخیش درووست کراون و بە پێچەوانەی بیروباوەڕی هەندێ لە تاقمە گومڕاکانی وەکو جەهمییە وموعتەزیلەکان دەڵێت:

**(وَالْجَنَّةُ وَالنَّارُ مَخْلُوقَتَانِ قَدْ خُلِقَتَا، كَمَا جَاءَ عَنْ رَسُولِ اَللَّهِ صلى الله عليه و سلم دَخَلْتُ اَلْجَنَّةَ فَرَأَيْتُ قَصْرًا .(و (رَأَيْتُ اَلْكَوْثَرَ) وَ(اِطَّلَعْتُ فِي اَلْجَنَّةِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا) ، وَاِطَّلَعْتُ فِي اَلنَّارِ فَرَأَيْتُ ... كَذَا وَكَذَا).**

واتە: بەهەشت و دۆزەخ لە ئێستادا درووست کراون و ئینجا هەندێ بەڵگەی لەسەر دەهێنێتەوە، وەکو فەرموودەی: ( دخلتُ الجنَّةَ فَرأيتُ فيها قَصْرًا)[1]هەروەها فەرموودەی: (لقد رأيت جهنم يحطم بعضها بعضا) [2]واتە دۆزەخم بینی خۆی خۆی دەخوارد وهەندێکی هەندێکی تری وێران دەکرد .

یەکێکی تر لەو فەرموودانەی پێشەاو أحمد کردوویەتی بەبەڵگە بۆ ئەم بنەمایە فەرموودەی: ( بَيْنَما أَنا أسيرُ فِي الجنّةِ إِذا أَنـا بِنَهَـرَ حافَتـاهُ قِبـابُ الـدُّرِّ الْمُجَـوَّفِ.

---

بیرۆکە و بەرنامەکەیان بکات ئەوە لەگەڵ خۆیدا تووشی (تناقض) بووە، لە ئیسلامیشدا شتی وا نییە ئیسلام و پێچەوانەکەی لەیەك کاتدا هەڵبژێریت! یان بەرنامەی ئیسلام یان بەرنامەی تر و هەرکەسێکیش ئازادە چی هەڵدەبژێریت چونکە بەرپرسیارێتی کارەکەی هەڵدەگرێت و ڕۆژی قیامەت ڕۆژی پاداشت و سزایە.

(١) البخاري: ( ٥٢٢٦) ومسلم: ( ٢٣٩٤).

(٢) البخاري:(١٢١٢).

قُلْتُ: مَا هاذا يَا جِبْرِيلُ؟ قَالَ: هَذَا الكَوْثَرُ الّذي أعْطاكَ رَبُّكَ، فَإِذا طِينُهُ أوْ طِيبُهُ مِسْكٌ أذْفَرُ) [١]واتە پێغەمبەر صلى اللە عليە و سلم بەناو بەهەشتدا گەڕاوە و ڕوبارێکی بینیوە کە لە قەراغەکانیدا کەپری لە مرواری درووستکراوی لێ بووە ولە جیبریلی پرسیە علیە السلام دەربارەی و ئەویش فەرموویەتی ئەوە ڕووباری کەوسەرە.

هەروەها فەرموودەیەکی تری وەکو بەڵگە لەسەر ئەم بنەمایە هێناوەتەوە ئەویش فەرموودەی: (اطَّلَعْتُ في الجَنَّةِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الفُقَرَاءَ، وَاطَّلَعْتُ في النَّارِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ)[٢] واتە: تەماشای ناو بەهەشتم کرد بینیم زۆربەی خەڵکەکەی لە هەژاران بوون، تەماشای ناو دۆزەخیشم کرد بینیم زۆربەی خەڵکەکەی لە ئافرەتان بوون. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر هەبوونی بەهەشت و درووست بوونی لە ئێستادا.

دەربارەی ئەم فەرموودە زانایان دەڵێن هۆکاری زۆریی ئافرەتان لەناو دۆزەخدا ئەوەیە کە لە فەرمووەکاندا باس کراوە کە بریتییە لەوەی قسەی خراپ و نابەجێ زۆر بەسەر زاریاندا دێت و هەروەها چاکەیان لەبرچاو نییە و نکوڵی لە چاکەی مێردەکانیان دەکەن و لەگەڵ شتێك ڕوویدا پێیان دەڵێن ئێمە هیچ چاکەیەکمان لە ئێوە نەبینیوە.

(١) البخاري: ( ٦٥٨١)ومسلم: ( ٢٣٩٤).

(٢) البخاري: (٣٢٤١).

بەڵام لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە ئافرەتان زۆرینەی ئەهلی بەهەشتن، وەڵامیش بۆ ئەوە بریتییە لەوەی ئەم قسە بە شێوەیەکی گشتی وایە، لەبەر ئەوەی هەموو پیاوێك لە بەهەشتدا ژمارەیەك حۆری خۆی هەیە کە حۆریش ئافرەتە و لەگەڵ ئافرەتە ئادەمیزادە بەهەشتییەکاندا ئەوان دەبنە زۆرینە لەو حاڵەتەدا.

پوختەی باسەکە ئەوەیە بەڵگە لەسەر ئەوەی لە ئێستادا بەهەشت و دۆزەخ درووست کراون زۆرن، پێشەوا ئەحمەد ئاماژەی بۆ چەند فەرموودەیەکیان کرد و فەرموودەی تریش زۆرە بۆ نموونە: (العَبْدُ إذَا وُضِعَ في قَبْرِهِ، وتُوُلِّيَ وذَهَبَ أصْحَابُهُ حتَّى إنَّه لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ، أتَاهُ مَلَكَانِ، فأقْعَدَاهُ، فَيَقُولَانِ له: ما كُنْتَ تَقُولُ في هذا الرَّجُلِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ؟ فيَقولُ: أشْهَدُ أنَّه عبدُ اللَّهِ ورَسولُهُ، فيُقَالُ: انْظُرْ إلى مَقْعَدِكَ مِنَ النَّارِ أبْدَلَكَ اللَّهُ به مَقْعَدًا مِنَ الجَنَّةِ،) [1]کۆتایی فەرموودەکە کە دوو مەلائیکەتەکە بەو مردووە دەڵێن الله تعالی جێگەی دۆزەخی بە جێگەیەك لە بەهەشتدا بۆ گۆڕیت و تەماشاشی دەکات ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەو کاتەدا درووست کراون.

هەروەها ئەو کەسەی کە دەمرێت دۆزەخیی بێت جێگەکەی لە دۆزەخدا پێی پیشان دەدرێت: (إذا ماتَ أحَدُكُمْ عُرِضَ عليه مَقْعَدُهُ، غُدْوَةً وعَشِيًّا، إمَّا النَّارُ وإمَّا الجَنَّةُ، فيُقالُ: هذا مَقْعَدُكَ حتَّى تُبْعَثَ إلَيْهِ.) [2]واتە کاتێك کەسێك لە ئێوە دەمرێت

(١) البخاري (١٣٣٨)، ومسلم (٢٨٧٠).

(٢) البخاري: ( ١٣٧٩). مسلم: (٢٨٦٦).

بەیانان و ئێواران جێگاکەی خۆی پێ نیشان دەدەن، یان دۆزەخە و یـان بەهەشـت، پێی دەوترێت ئەوە جێگاکەتە تاکو بۆی دەنێردرێیت.

لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزیشـدا بەڵـگەی درووسـت بـوونی بەهەشـت و دۆزەخ لە ئێستادا هاتووە، بۆ نموونە: (أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ) آل عمران:١٣٣. (أُعِـدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ) البقرة:٢٤. هەروەها دەربارەی فیرعەون و خاوخێزانەکەی فەرموویەتی: ( ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ ) غافر:٤٦ .

سەبارەت بە هەمیشەیی بەهەشت ودۆزەخ و تەواو نەبوونیـان بەڵـگەی زۆری لە قورئان و لە فەرموودەکاندا لەسەر هاتووە، بۆ نمـوونە: (لَهُمۡ فِيهَـا نَعِـيمٞ مُّقِـيمٌ ٢١ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ ) التوبة: ٢١-٢٢. عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەوەیە کە بەهەشت و دۆزەخیش هەمیشەیین و تەواو بوونیان بۆ نییە.

فەرموودەیەکی ڕاشـکاوانەتریش هەیە لەم بـارەوە کە لە موسـنەدی ئەحـمەدد و أبوداود و لە کتێبی تردا هاتووە : ( لَمَّا خلَقَ اللهُ الجنَّةَ قال : يا جِبريلُ اذهَبْ فـانظُرْ إليها فذهَب فنظَر فقال : يا ربِّ وعِزَّتِكَ لا يسمَعُ بها أحَدٌ إلَّا دخَلها، فحَفَّها بالمكارِهِ ثمَّ قال : اذهَبْ فانظُرْ إليها فذهَب فنظَر إليها فقال : يا ربِّ لقد خشِيتُ ألَّا يـدخُلَها أحَدٌ، فلمَّا خلَقَ اللهُ النَّارَ قال : يا جِبريلُ اذهَبْ فانظُرْ إليها فذهَب فنظَر إليها فقـال : يا ربِّ وعِزَّتِكَ لا يسمَعُ بها أحَدٌ فيدخُلُها، فحَفَّها بالشَّهواتِ ثمَّ قال : اذهَبْ فانظُرْ إليها فذهَب فنظَر إليها فقال : يا ربِّ وعِزَّتِكَ لقد خشِيتُ ألَّا يبقى أحَـدٌ إلَّا دخَلهـا)

[١] واته الله تعالى كاتێك بەهەشتی دروووست كردووه به جیبریلی فەرمووه علیه السلام بڕۆ تەماشای بكه و ئەویش چووه تەماشای كردووه و وتوویەتی سوێند عیزەتی تۆ هەركێ هەوالی ئەو بەهەشته ببیسێت دەچێته ناوی...هتد.

تاقمی جەهمیه و موعتەزیلەكان هەندێ بەڵگە بۆ خۆیان دەهێننەوه كه بەهەشت و دۆزخ هێشتا درووست نەبوونه ودەڵێن ئەگەر وابێت ئەوه دەبێته (عبث) و كارێكی بێ كەڵك و الله كاری بێ كەڵك ناكات، هەروەها هەندێ فەرموودەیان هێناوەتەوه لەسەر ئەو بیروباوەڕەیان بۆ نموونه فەرموودەی: (لقيتُ إبراهيمَ ليلةَ أُسْرِيَ بي ، فقال : يا محمَّدُ ! أقرِئ أُمَّتَكَ منِّي السَّلامَ ، وأخبِرْهُم أنَّ الجنَّةَ طَيِّبةُ التُّربَةِ ، عذبَةُ الماءِ ، وأنَّها قِيعانٌ ، وأن غِراسَها : ( سبحانَ اللهِ ، والحمدُ للهِ ، ولا إلهَ إلَّا اللهُ ، واللهُ أكبرُ ) مەبەستیان ئەوەیه بەهەشت هێشتا درووست نەبووه بەبەڵگەی ئەوەی باخ و سەوزاییەكانی لەبری ئەو تەسبیحات و عیبادەتانەی كه بەندەكان هێشتا نەیانكردووه درووست دەكرێت. ئەهلی سوننەت وەڵامی ئەوانیان به درێژی داوەتەوه و فەرموویانه بەهەشت خۆی درووست كراوه بەڵام تەسبیحات و عیبادەتی موسوڵمان دەبێته هۆكاری درووست بوونی بینا و سەوزایی و باخەكانی.

بەڵام له هەندێك له سەلەفەوه دەگێڕنەوه كه وتوویانه لەپاش سەردەمانێكی گەلێك زۆر دۆزەخ لەناو دەچێت و نامێنیت، هەندێ فەرموودەش بۆ ئەو

(١) شرح العقيدة الطحاوية، ابن أبي العز:٢/٦١٤.

بۆچوونەیـان دەکەنە بەڵـگە بەڵام ئەو فەرمـوودانە وەکـو فەرمووده‌ناسـان دەڵـێن (ضعیف) ن، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو بۆچوونەش هەیە.

سەبارەت بە ابن قـیم الجوزیـة بەڕەحـمەت بێـت ئەو لەم بـارەوە دوو بۆچـوونی هەیە، بۆچـوونی یەکەمـی کە لە کتێبەکـانی (حـادي الأرواح) (وشـفاء العلیـل)دا هاتووە مەیلی بەلای ئەوەیە کە دۆزەخ کۆتایی دێت و کاتێکی بەسەردا دێـت لەنێـو دەچێت، لە کتێبی (الصواعق المرسلة)شدا لەمەسـەلەکە دەوەسـتێت و قسـەی تێـدا ناکـات، قەول و بۆچـوونی دووەمیشــی کە لە کتێبــی (الوابـل الصـیب) و(طریــق الهجرتین).دا هـاتووە ئەوەیە کە هـاوبۆچوونە لە گەڵ زانایـانی ئەهلـی سـوننەت و دەڵێت دۆزەخ هەمیشەییە و هەتاهەتاییە و تەواو نابێت.

لە ڕاستیدا بـاوەڕبوون بە بەهەشـت و بە دۆزەخ بەشـێکە لە بـاوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی و یەکـێکە لە کۆڵەکەکـانی ئیمانـی موسـوڵمان لە دینـی ئیسـلامدا. عەقیـدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتیش بەو شێوەیە کە لە ئێستادا درووست بوونە وبوونیـان هەیە، نەك وەکو موعتەزیلە و جەهمیە کە دەڵێن الله لە ڕۆژی قیامەتدا بەهەشـت و دۆزخ درووست دەکات و ئێستا درووست نەکراون.

ئینجا فەرموویەتی: (فَمَنْ زَعَمَ أَنَّهُمَا لَـمْ تُخْلَقَـا، فَهُـوَ مُكَـذِّبٌ بِـالْقُرْآنِ وَأَحَادِيـثِ رَسُولِ اَللَّهِ صلى الله عليه و سلم ، وَلَا أَحْسَبُهُ يُؤْمِنُ بِالْجَنَّةِ وَالنَّارِ.) واته: هەرکێیش بڵێـت بەهەشـت و دۆزەخ درووسـت نەکـراون ئەو کەسـە بـاوەڕی بە قورئـان و فەرموودەکانی پێغەمبەر صلى الـله علیـه و سـلم نیـیە وبەڕاسـتی نەزانیـون، بەڵکـو

فەرمـوویەتی بـاوەڕ نـاکەم کەسـێك وا بڵێـت لە بنچیـنەدا بـاوەڕی بە بەهەشـت و دۆزەخیش هەبێت.

یەکێك لە لادانە گەورەکانی جەهمی کوڕی سەفوان ئەوەیە کە دەیوت بەهەشـت و دۆزەخ هەردوکیان هەتا هەتایی نین و لەنێو دەچن ، لەبەر ئەوەو لەبەر کۆمەڵێکی تر لە بیروڕاکانی کە یەکێکیان ئەوە بوو کە دیـوت اللـه بـوونێکی ڕەهـای هەیە و نە لەناوو نە لە دەرەوەی جیهاندا نییە و وەکو ئەوە بـوو بڵێـت بـوونێکی راسـتەقینەی نییە ونکۆڵیشی لە هەموو نـاوو سـیفەتەکانی اللـه تعـالی دەکـرد و ئیمانـی تەنهـا بە مەعریفە و ناسینی دڵ پێناسە دەکـرد و کە بەو پێناسـە بێـت فیـرعەونیش ئیمانـدارە وهەروەها بە عەقیدەی جەبر دەناسرا کە هەموو کردارەکانی مرۆڤی دەدایە پاڵ اللـە تعالی ودەیوت بەندە خۆی هـیچ رۆڵ و کـاریگەرییەکی نیـیە لەسـەر ئەفعالەکـانی خۆی و جگە لەوانەش وەکو ئاماژەمان پێ کرد باوەڕی بەلە نێوچوونی بەهەشـت و دۆزەخ هەبـوو، هەر بـۆیە زیـاد لە پێـنج سـەد زانـای ئەهلـی سـوننەت جەهمیـان تەکفیریان کردووە.

## هەرکێ لە ئەهلی قیبلە بە موەحیدی بمرێت نوێژی لەسەر دەکرێت و داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکرێت

پێشەاو أحمد بن حنبل لە خستنەڕووی کۆتا بنەما لەم کۆمەڵە بنەمایانەی ئەهلی سوننەت کە لێرەدا باسی کردووە فەرموویەتی: ( **وَمَنْ مَاتَ مِنْ أَهْلِ اَلْقِبْلَـةِ مُوَحِّـدًا يُصَلَّى عَلَيْهِ، وَيُسْتَغْفَرُ لَهُ وَلَا يُحْجَبُ عَنْهُ اَلِاسْتِغْفَارُ، وَلَا تُتْرَكُ اَلصَّلَاةُ عَلَيْـهِ لِـذَنْبٍ أَذْنَبَهُ صَغِيرًا كَانَ أَوْ كَبِيرًا، أَمْرُهُ إِلَى اَللَّهِ تَعَالَى)**.

مەبەستی پێشەوا أحمد لە ئەهلی قیبلە کەسانێکە کە موەحید بـن و ڕوو لە قیـبلە بکەن بۆ نوێژکردن، وەکو لە فەرموودەدا هاتووە: ( مَن صلى صلاتَنا ، واسْتَقْبَلَ قِبْلَتَنا ، وأكل ذبيحتَنا ، فذَاكُمُ المسلمُ له ذِمَّةُ اللهِ ، وذِمَّةُ رسولِه ، فلا تُخْفِرُوا اللهَ في ذِمَّتِه) [١] واتە: هەرکێ نوێژی ئێمەی کرد و ڕووی لە قیبلەمان کـرد وسـەربڕاوو قوربـانی ئێمەی خوارد ئەوە موسوڵمانە...هتد.

مەبەستی پێشەوا احمد هەر ئەوە نییە ڕوو لە قیبلە بکـات و نـویژی موسـوڵمانان بکات و ئیـتر ئەوە موسـوڵمانێکی تەواو بێـت، لەوانەیە کەسـێك نـوێژیش بکـات و ڕۆژوویش بگرێت و حەجیش بکـات وخێـرو چـاکەیش بکـات و لەگەڵ ئەوەشـدا موسوڵمان نەبێت! لەبەر ئەوەی یەکێك لە هەڵوەشێنەروەکانی ئیسـلامیی تێـدا بێـت، چـۆن دەسـتنوێژ و نـوێژ و ڕۆژوو بـۆ نمـوونە بەهەنـدێك کـردار بەتـاڵ دەبـنەوە،

(١) البخاري: ( ٣٩١).

ئیسلامیش بەهەمان شێوە هەندێك كردار هەیە كە زانایان بە (نـواقض الشـهادتین) دەربڕینی لێ دەكەن هەڵدەوەشێتەوە.

بەڵكـو دەبێـت كەسـەكە كە نـوێژی لەسـەر بكریـت و داوای لێخۆشـبوونی بـۆ بكرێت موەحید بێـت و لە هەمـوو جـۆرە شـیركێك بەری بێـت و بەدوور بێـت، جـا كەسێك ئەوە حاڵی بێت و لە سەر تەوحیـد و عەقیـدەی پـاك وپـاراو بێـت، كاتێـك دەمرێت نوێژی لەسەر دەكرێت با تاوانباریش بێت و گوناه و تاوانی ئەنجامدابێت، هەر نوێژی لەسەر دەكرێت.

بەڵام ئەوەی باس كرا بەو مەعنا نیـیە ئەنجامـدانی هـیچ تاوانێـك كـوفر نەبێـت وهـیچ تاوانێـك نەبێـت مـرۆڤ لە ئیسـلام دەربكـات، وا نیـیە، ڕاڤەكـاری العقیـدة الطحاوێة لەم بارەوە فەرموویەتی: (ولهذا امتنع كثير من الأئمة عـن إطـلاق القـول بأنا لا نكفر أحدا بذنب، بل يقال لا نكفرهم بكل ذنـب كـما يفعلـه الخـوارج...) [(١)] واتە ئەهلی سوننەت ناڵێن كەس بە تاوان تەكفیـر نـاكەین، بەڵكـو دەڵـێن كەس بە هەموو تاوانێك تەكفیر ناكەین، چونكە خەواریجەكـان خەڵكـی بەهەمـوو تاوانێـك تەكفیر ئەكەن.

بەواتایەكی ڕوونـتر وتەكەی پێشـەوا أحمـد مەعنـای ئەوەیە: هەركـێ لە ئەهلـی قیبلە بە موەحیدی بمرێت، شایەتی تەوحید بۆ الله بدات و شـایەتی پێغەمبەرایەتـی بـــۆ محمـــد صـــلی اللـــە علیـــە و ســـلم بـــدات وهـــیچ هەڵوەشـــێنەرەوەیەك

(١) بڕوانە: شرح العقيدة الطحاوية، ابن أبي العز، ٣١٧.

لەهەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام ئەنجام نەدات و مافەکانی تەوحید بدات و کردەوەی چاکی هەبێت، ئەوە موسوڵمانە و مافی موسوڵمانێتی هەیە.

بۆ ئەوەی کەسێك ئەو وەسفەی بەسەردا جێبەجێ بێت و ببێتە موسوڵمانێك بەو شێوەی کە پێشەوا أحمد باسی دەکات، پێویستە ملکەچ بێت بۆ مافەکانی تەوحید و لە هەڵوەشێنەرەوەکانی دوور بکەوێتەوە، چونکە ئەگەر بۆ غەیری الله تعالی سەربڕین و قوربانی بکات دەبێتە موشریك، ئەگەر جنێو بە الله تعالی و پێغەمبەرەکەی بدات کافر دەبێت، ئەگەر نکۆڵی لەهەر مەسەلەیەك بکات لەوانەی کە زانایان بە (معلوم من الدين بالضرورة) دەربڕینی لێ دەکەن لە بازنەی ئیسلام دەردەچێت.

زۆر شت هەیە تەوحید هەڵدەوەشێنێتەوەو موسوڵمانان ئاگایان لێی نییە، بە کورتی هەرکەسێك لە ئەهلی ئیسلام لەسەر تەوحید بمرێت و نەزانرابێت کە هەڵوەشێنەرەوەیەك لەوانەی ئیسلام و تەوحید هەڵدەوەشێننەوە ئەنجامی دابێت، ئەوە موسوڵمانە و دروست نییە نوێژی لەسەر نەکرێت، تەنانەت ئەگەر هەندێ تاوانیشی ئەنجام دابێت هەر دەبێت نوێژی لەسەر دەکرێت، وەکو الله تعالی فەرموویەتی: ( وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِۦ) التوبة:٨٤. ئایەتەکە هۆکاری نوێژنەکردنی لەسەر ئەو کەسانە بۆ کوفرەکەیان گەڕاندووەتەوە. ئەم ئایەتەش دوای ئەوە دابەزی کە پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم نوێژی لەسەر جەنازەی عبدالله بن أبي بن سلول ی سەری مونافیقان ئەنجامدا.

کەواتە هەر موسوڵمانێك کە ئەنجامدەری گوناهەکانی وەکو غەیبەت و گوناهی لەو شێوە بێت، یان کەبائیر و تاوانە گەورەکانی ئەنجام دابێت، مادام موەحید بێت نوێژی لەسەر دکرێت و داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکرێت.

بەڵام لە پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم جێگیر بووە کە نوێژی لەسەر هەندێ لە ئەنجامدەرانی تاوانە گەورەکان نەکردووە وەکو قاتل و ئەو کەسەی کە دەستی دەچێتە خۆی و خۆی دەکوژێت وهەروەها نوێژی لەسەر قەرزاریش نەکردووە و فەرموویەتی من نوێژی لەسەر ناکەم بەڵام ئێوە نویژی لەسەر بکەن.

نوێژ لەسەر موسوڵمان دەکرێت ئەگەر کوفر و شیرك و جەهل و ستەمی گەورەی نەکردبێت، با گوناهی بچووك و تاوانی گەورەشی ئەنجام دابێت، تاوانی کەبیرە واتە هەموو تاونێك کە حەددێی شەرعی وەکو سزا لەسەر بێت وەکو دزی و داوێن پیسی، یان هەڕەشەی سزای لە ڕۆژی قیامەت لەسەر هاتبێت، یان پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم لێی بەریبووبێت، وەکو بەریبوونی لەوانەی لەکاتی مردنی کەسێکیاندا دەنگ بەرز دەکەنەوەو دەقیژێنن و هاوار دەکەن، یان ئەو ئافرەتەی کە بەهۆی مردنی کەسێکەوە سەری دەتاشێت یان جل لەبەری خۆیدا دەدرێت.

ابن تیمیة فەرموویەتی: سەلەف و پێشەوایان یەك دەنگ بوونە لەسەر ئەوەی هەندێ لە تاوانبارانی موەحیدەکان لە ئەهلی قیبلە دەبێت بچنە دۆزەخەوە ودوایی لێی دەردەچن، بەڵام ئەو قەولەی کە دەڵێت ئەهلی تەوحید بەهیچ شێوەیەك ناچنە

دۆزەخەوە ئەوە نەمانزانیوە قەولی کەسێك بێت لە ئەهلی عیلم. [١] لە جێگەی تریشدا لە مجموع الفتاوی ئەو واتای دووپات کردووەتەوە و فەرموویەتی: ئەم بوچوون و تێگەیشتنەش هاوەڵان و سەلەف و پێشەوایانی لەسەر بووە کە وتوویانە بەیەقین هەندێك لە تاوانبارانی ئەهلی تەوحید دەچنە دۆزەخەوە و هەندێکیشیان الله تعالی لێیان خۆش دەبێت و ناچنە دۆزەخەوە.

بەمەش پێشەوا أحمد بن حنبل کۆتایی بەو بنەمایانەی ئەهلی سوننەت دەهێنێت کە لەم نامیلکەیەدا خستوویەتیی ڕوو وصلی الله وسلم وبارك علی محمد وعلی آلـه و صحبه و سلم تسلیما کثیرا .

(١) بڕوانە: مجموع الفتاوی: ( ٧/٥٠١ ).

# کۆتایی

سوپاس و ستایشی زۆر و بێ پایان بۆ الله عزوجل، که به میهرەبانی خۆی بواریدام و یارمەتیدام بۆ تەواو کردنی ئەم کتێبه، که بریتییه له شەرحێکی کورت و پوخت بۆ مەتنی (أصول السنة)ی پێشەوا أحمد بن حنبل بەڕەحمەت بێت، که بۆ ئەنجامدانی له کۆمەڵێك له زانا هاوچەرخەکان سودمەند بوومه وجگه له شەرحەکانی ئەوانیش بۆ زۆر کتێب و سەرچاوەی تر گەڕاومەتەوە.

وصل اللهم وسلم على سيدنا وقرة أعيننا، معلمنا وهادينا، محمد وعلى آله وصحبه الطيبين الطاهرين، ومن اقتفى أثرهم وسار على نهجهم إلى يوم الدين.

والحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات.

إحسان برهان الدين

٢٦ ذو القعدة ١٥/١٤٤٤ حزيران/٢٠٢٣

سلێمانی- گرین سیتی

# پوختەیەك

# دەربارەی فیرقە و تاقمە لادەرەکان

ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی ئەم پاشکۆیە

ئەم وتـارانەی لەم پاشـکۆیەدا هـاتوون، بـریتین لە کـۆمەڵە بابەتێـك کە لە تـۆڕە کۆمەڵایەتییەکانـدا پێشـتر بڵاوکـراونەتەوە و لەیەك کاتـدا نەنـووسراون، خـاڵی هاوبەشی نێوانیـان ئەوەیە بە گشـتی بـاس لە فیـرقە و تـاقمە لادەرەکـانی مێـژووی ئیسلامی دەکات کە لە سەردەمی سەلەف و دوای ئەواندا سـەریان هەڵـدا و خـاڵە سەرەکییەکانی بیروبـاوەڕ و عەقیـدەکەیان و جیاوازییـان لەگەڵ عەقیـدەی ئەهلـی سوننەت و جەماعەت دەخاتە ڕوو.

لە باسەکاندا هەوڵمداوە سەرەتا پێناسەیەك بۆ ئەو کۆمەڵ و تاقمانە بکەم و ئینجا دیارترین بنچینەو بنەماکانی بیروباوەڕیان بخەمەڕوو وهەنـدێ جـاریش هەڵوێسـتی زانایانی ئەهلی سوننەتم لەسەر ئەو تاقمانە و بیروبۆچوونەکانیان باس کردووە.

هۆکاری جێگیر کردنی ئەم وتارە نووسراوانە پەیوەندی بەهێزی ئەم بابەتانەیە بە ناوەڕۆکی ئەم شەرحەی بۆ کتێبەکەی پێشەوا أحمد بن حنبل لێرەدا کردوومـانە، کە لە ڕاستیدا ئەم وتارانە ئاوێتەیەکە لە کۆکردنەوەی قسە و نووسین وفەتـوای ئەهلـی عیلم دەربارەی ئەو تـاقمانە، هاوکـات لەگەڵ هەبـوونی ڕەهەنـدێکی تـوێژینەوەیی و بەستنەوەی بابەتە توێرییەکان بە واقیعی ئەمڕۆ کە بریتییە لە خوێندنەوەو تێگەیشتن و پەراوێزی خۆم لەسەر ئەو بابەتانە.

لەناو شـەرحی کتێـبەکەی پێشـەوا أحمـد بـن حنبـل بەرەحـمەت بێـت نـاوی کۆمەڵێك لە فیرقەو تاقمەکان هاتووە، وەکـو مرجئـة وجهميـة ومعتزلـة و معطلـة و جبرية وأشاعرة وتاقمی تر، بۆیە بەباش زانرا ئەم پاشـکۆ وەکـو بەرچـاڕوونی لەبەر دەستی خوینەراندا بێت.

# مورجیئەکان

مورجیئە فیرقە و تاقمێکە لە تاقمە گومڕاکانی ئیسلام کە لەسەر الصراط المستقیم لایانداوە، بۆیە پێیان وتراوە مورجیئە چونکە لە مەسەلەی ئیماندا قەول پێش دەخەن و کردار دوا دەخەن! مورجیئەش وەکو ئەشاعیرەو خەواریج جۆریان زۆرە، بەڵام ناودارترین فیرقەکانیان دوو جۆرن:

یەکەم / مرجئة الفقهاء : ئەم جۆرە پێیان وایە کە ئیمان بریتییە لە داننان وشایەتمان هێنان بە زمان و باوەڕ هێنان بە دڵ، بەلای ئەوانیشەوە ئیمان نەزیاد دەکات و نەکەم، أبو جعفر الطحاوي لەو مەسەلەدا تووشی هەڵەی مورجیئە بووە لە عەقیدەدا کە دەڵێت: (والإيمان هو الإقرار باللسان والتصديق بالجنان، وجميع ما صح عن رسول الله صلى الله عليه وسلم من الشرع والبيان كله حق، والإيمان واحد، وأهله في أصله سواء، والتفاضل بينهم بالخشية والتقى ومخالفة الهوى، ملازمة الأولى). هەروەها ئەبوحەنیفە و حەمادی کوڕی سولەیمانی مامۆستای و ئەو مورجیئانەی کوفە کە شوێنیان کەوتن لەوەی کە کردەوەیان لە ئیمان جیاکردەوە، لەم جۆرە مورجیئانە دەژمێردرێن.

دووەم/ مرجئە المتكلمين: ئەمانە بریتین لە جەهمییەکان و ئەوانەش کە لەسەر ڕێبازیانن لە ئەشاعیر ە و ماتوریدییەکان، الفضيل بن عياض دەربارەیان دەڵێت : " أهل الإرجاء - إرجاء الفقهاء - يقولون : الإيمان قول بلا عمل، وتقول الجهمية: الإيمان المعرفة بلا قول ولا عمل، ويقول أهل السنة: الإيمان المعرفة والقول والعمل

" ( تهذيب الآثار الطبري ١٨٢/٢). واتە: مورجیئەی فوقەها دەڵێن ئیمان گوفتارە بە بێ کردار ، جەهمییەکان دەڵێن ئیمان تەنها زانینە بەبێ گوفتار و بەبێ کردار، بەڵام ئەهلی سوننەت ئەڵێن: ئیمان زانین و گوفتار و کردارە پێکەوە.

سەلەف زۆر لە دژی مورجیئەکان توند بوونە و ڕایان لە ئەوانـدا گەلێك خراپ بووە ، سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: : " المرجئة مثل الصابئين " واتە مورجیئە وەکو سابیئەکانن، هەروەها پێشەوا زوهری دەیفەرموو: " ما ابتدعت فى الإسلام بدعة هى أضر على أهله من هذه - يعنى الإرجاء - " . واتە لە ئیسلامدا هیچ بیدعەیەك دانەهێنراوە زیانی زۆرتر بێت لە زیانی مورجیئەکان لەسەر موسوڵمانان. ابن بطة دەڵێت: (أما المرجئه فعلى دين الملوك ). واتە مورجیئە لەسەر دینی پاشاکانن ئەوان چۆنیان بوێت وایان بۆ دەکەن. النضر ابن شميل دەلێت: ( الإرجاء دين يوافق أهواء الملوك ) واتە دینی مورجیئە بەدڵی پاشا و سەرۆکەکانە، بە گشتی سەلەف و ئەوانەی دوای ئەوانیش لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت توند بوونە لەسەر مورجیئە و هەجریان کردوون وقسەیان لەگەڵیان نەکردووە.

بەڵام مورجیئەش وەکو تاقمەکانی تر جۆریان زۆرە و هەموویان لە مەسەلەی لادان لە مەنهەجی ئەهلی سوننەتدا بە یەك ئاست و شێواز نین، هەندێکیان هەن کە باوەڕیان وایە ئیمان تەنها وتنی شایەتمانە و تەواو، هەیانە دەلێن نەخێر جگە لە وتنی شایەتمان ئەبێت کەسەکە لە دڵیشەوە باوەڕی هەبێت، توندڕەوەکانیان بە دووری مەگرە فیرعەون و ئەبوجەهلیش بە ئیماندار بزانن وەکو محمد صالح المنجد دەڵێت، ئەوەشی کە مورجیئەیەکی توندڕەو نییە بۆی هەیە تەنها ئەبوبەکر اللە لێی ڕازی بێت بخاتە هەڵەوە لە مەسەلەی شەڕکردنی لەگەڵ ئەوانەی کە زەکاتیان نەدەدا.

# نیشانەکانی مورجیئە کە پێی دەناسرێنەوە

١- بە پـێچەوانەی ئەهلـی سـوننەتەوە، مـورجیئە عیبـادەت و کـردەوە بە مەرج نازانن بۆ ڕاست و درووستی ئیمان، واتە کەسەکە بەبێ عەمەل دەگونجیـت ئیمانـدار بێت. گرنگ ئەوەیە ئیمان لە دڵدا بوونی هەبێت! واتە ئیمان لەلای مـورجیئە بـاوەڕی دڵە و قەولی زمانە و تەواو، کردەوەش هەبێت باشە ئەگینا عەمەل بەلایـانەوە (شرط کمال) ی پـی دەوترێـت نەك (شرط صـحة)! نەبـوونی کـاریگەری خراپـی لەسـەر ئیمانەکە نییە!

٢- لە مەسەلەی تەکفیریشدا بە پێچەوانەی ئەهلی سوننەتەوە، مـرۆڤ تەنهـا بە کوفری دڵی کافر دەبێـت نەك بە کـوفری زمـان و کـردەوە. بـۆیە ئەگەر کەسـێك لە دڵیدا ئیمانی هەبێت و بە زاهیر و کردەوەکانی کوفری لـێ ببینرێـت ئەوە مەرج نیـیە کافر بێت تا خۆی نەڵێت من لە دڵیشەوە هەر بێ بڕوام! هەروەهـا ئەوەی کە هـیچ کردەوەیەکی نەبێـت بەلای مورجیئەکـانەوە کـافر نابێـت ئەگەر لەنـاو دڵیـدا ئـیمان هەبێت.

٣- مورجیئە هەمیشە بەوە ناسراون کە بەرگری لە ستەمکاران و تاغوتـان دەکەن و پاساویان بۆ دەهێننەوە و بەرگریان لێ دەکەن و پاسـاو بـۆ کـردەوە خراپەکانیـان دەهێننەوە و خۆیانی لێ کەڕ دەکەن، سەرۆك و پادشاکان هەرچەند لە دینیش دوور بن ئەوان هەر هانی خەڵکی ئەدەن لە قسەیان دەرنەچن و گوێڕایەڵییان بکەن. بـۆیە سەلەف پێیان وتوون لەسەر ئایینی پادشاکانن.

٤- کافر بەکافر نازانن با هەرچەندیش بە کردەوەیان وابن، چونکە ئەڵێن گرنگ ئیمانی ناو دڵە و کێ دەڵێت ئەم کەسەی کە بە زمانی کوفر دەکات یان جنێو بە اللە و بە پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم دەدات لە دڵەوە ئیماندار نییە، بۆیە بە دەگمەن مورجیئەیەك هەبێت هیچ کافرێك بە کافر بزانێت، جاری وا هەیە لەوەش زیاتر ئەو کەسەی کە دژایەتی ئیسلامیش دەکات ئەوان بە وەلی ئەمرو بە سەرکردەی موسوڵمانی دەزانن کە واجبی سەرشانیتی گوێڕایەڵی بێت، بۆیە دەسەڵاتداران هەمیشە حەزیان پێیانە و لە درێژایی مێژوودا ڕێزی زۆریان لێ گرتوون.

٥- دەڵێن: الإيمان لا يزيد ولا ينقص: واتە ئیمان لە دڵدایە و جێگیرە، یان هەیە و یان نییە! نەزیاد دەکات و نەکەم دەکات، ئەوەش لە کاتێکدایە ئایەت و فەرموودەیەکی زۆر هەیە لەسەر ئەوەی ئیمان بە کردەوەی باش زیاد دەکات و بە کردەوەی خراپ کەم دەکات، البغوي بە ڕەحمەت بێت دەڵێت: "اتفقت الصحابة، والتابعون، فمن بعدهم من علماء السنة، على أن الأعمال من الإيمان" هەروەها فەرموویانە: "إن الإيمان قول وعمل وعقيدة، يزيد بالطاعة وينقص بالمعصية، على ما نطق به القرآن في الزيادة، وجاء في الحديث بالنقصان". [شرح السنة: ٣٨/١].

٦- لە نیشانەکانی تری مورجیئەکان ئەوەیە کە هەمیشە ئەهلی سوننەت و جەماعەت بە خەواریج وەسف دەکەن.

٧- مورجیئەی فوقەها باوەڕیان وایە موسوڵمان بۆی نییە (استثناء ) لە باوەڕیدا بکات، واتە بۆی نییە بڵێ من إن شاء الله ئیماندارم، بەڵکو دەبێت بڵێت من ئیماندارم.

٨- هەندیکیشیان هەیە دەڵێن مرۆڤ خۆی کردەوەکانی خۆی درووست دەکات و الله تعالی لە ڕۆژی قیامەتدا نابینرێت.

مورجیئە هاوشێوەی خەواریج ئەگەرچی لەم سەردەمە تاقم و کۆمەڵێك نییە بە فەرمی هەموو بیروباوەڕەکانیانی هەڵگرتبێت و وەکو مورجیئەکانی سەردەمانی دێرین بێت، بەڵام زۆرێك لە کەسایەتی و کۆمەڵ و تاقم هەن لە سەرانسەری جیهانی ئیسلامیدا بەشێکی دیاریان لە بیروباوەڕ و نیشانەکانی مورجیئەیان لە خۆیاندا بەرجەستە کردووە و بانگەشەی بۆ دەکەن، بەڵکو هەندێ جار لە مورجیئەکانی جارانیش توندتر و بێ شەرمتر لادانەکانیان دەخەنە ڕوو و بانگەوازی بۆ دەکەن.

بەڵام ئەوەندەی من بزانم لە ئێستادا نە مورجیئە و نە خەواریج کۆمەڵێك نییە لە سەدا سەد بۆچوونەکانی ئەو دوو تاقمەیان لە خۆیاندا بەرجەستە کردبێت و هەمووی جێبەجی بکەن، ئەگەرچی ڕێژەیەك لە سیفەت و نیشانە و خەسڵەتەکانیان لە کەسایەتی و کۆمەڵ و تاقمی دیاریکراودا هەیە لەم سەردەمەدا و جاری وا هەیە وەکو ئەوان و جاری واش هەیە لەوان زیاتر جێبەجێی دەکەن.

# جەهمییەکان

جەهمییەکان فیرقەیەکی ترن لەو فیرقەو تاقمانەی کە لە ئیسلام لایانداوە و بە بەشێکی دیاری مورجیئە دەژمێردرێن، ئەم تاقمە سەر بە جەهمی کوڕی سەفوانن کە لە سەرەتای سەدەی دووەمی کۆچیدا لە خوراسان سەری هەڵدا و شارەزایی لە فەرموودەدا نەبوو، بەڵکو زۆر سەرقاڵی مەنتیق و عیلمی کەلام بوو و هەر لەو ڕێگەشەوە لە ئایەتەکانی قورئان و سیفەتەکانی الله تعالی تێدەگەیشت.

جەهم یەکەم کەس بوو لە ئیسلامدا بڵێت قورئان مەخلوقە و سیفەتەکانی الله ی هەمووی تەئویل کرد و پەککخست و لە واتاکانی خۆیان لایدان، جەهم ئەگەر چی هەندێ لە مێژوونووسان بە کەسێکی شارەزا و خاوەن ئەمر بە مەعروف و نەهی لە مونکەر حیسابیان کردووە، بەڵام لە ڕووی عەقیدەو بیروباوەڕەوە کەسێکی سەرلێشێواو بووەو بەردەوام خەریکی مشت و مڕ و موجادەلە و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکانی خۆی بووە، سەرەتا بیروبۆچوونەکانی جەهم لە (ترمذ) بڵاوبوویەوە بەڵام دواتر بە شێوەیەکی بەرفراوان لە ناو خەڵکیدا تەشەنەی کرد، هەر بۆیە زانایانی سەلەف بە توندی بەربەرچی بیرۆکەکانیان دەدایەوە و ورییایان لە بارەیەوە دەدا بە خەڵکی، پێشەوا (أحمد بن حنبل) بەڕەحمەت دەربارەی فەرموویەتی: "وكذلك الجهم وشيعته دعوا الناس إلى المتشابه من القرآن والحديث فضلوا وأضلوا بكلامهم بشراً كثيراً، فكان مما بلغنا من أمر الجهم عدو الله أنه كان من أهل خراسان من أهل ترمذ، وكان صاحب خصومات وكلام" (الرد على الزنادقة

والجهمية) (ص ٢٣). واتە: جەهـم و هـاوەڵانی خەڵکیـان بـۆ ئـایەت و فەرمـوودە لێکچووەکانی بانـگ دەکـرد و ئیـتر گـومڕا بـوون و خەڵکێکـی زۆریشـیان لەگەڵ خۆیاندا گومڕا کـرد و ئەوەشـیان پـێ گەیشـت کە جەهمـی دوژمنـی اللـە خەڵکـی خوراسـان بـووە لە نـاوچەی ترمـذ و بەنـاکۆکی و تێـوەگلان بە عیلمـی کەلامەوە ناسراوە.

جەهمی کوڕی سەفوان لە ساڵی ١٣٠ یـان ١٣٢ ی کـۆچی لەلایەن (سـلم بـن أحوز ) لە شاری (مـرو) کـوژرا. جومهـوری زانایـان لەسـەر ئەوەن کە کـوژرانی جەهم بە هۆکـارێکی دینـی بـووە، واتە بەهـۆی لادانەکـانی لە عەقیـدەی ئیسـلامی کوژراوە، شایانی باسە جەهم هاوڕێ و تەلەبەی جەعدی کوڕی دیـرهەم بـووە و لە پاش کوژرانی جەعد لەسەر دەستی (خالد بن يزيد القسري) جەهم لەسەر ڕێبازی مامۆستاکەی هەر بەردەوام بوو، تا دوا جار ئەویش کوژرا.

بەڵام لە هاوچەرخەکاندا شێخ (جمال الدين القاسمی) دەڵێت: کـوژرانی جەهـم لەبەر هۆکاری دینی نەبووە، بەڵکـو هۆکـارەکەی سیاسـی بـووە، چـونکە سـەرەڕای ئەوەی کە لە عەقیدەی ئیسلامی لایدابوو، بەڵام ئەو بۆچوونەکانی خۆی بەڕاسـت دەزانی و مەبەستی دژایەتی ئیسلام نەبوو، قاسمی دەڵێت کـوژرانی جەهـم بەهـۆی وەسـتانی بـووە لە ڕووی حـوکمی بەنـی ئـومەییە و ئەو لەبەر بیروڕکـانی شـایانی کوشتن نەبووە. بڕزانە: کتێبی(تاريخ الجهمية والمعتزلة) ١٤-١٨.

# نیشانەکانی تاقمی جەهمییەکان

١- هەموو ئایەت و سیفاتێکی الله تەئویل دەکەن و جێگیر کردنی دەست و دەم وچاو تەنانەت قسەکردنیشیان بۆ الله بە کارێکی نەشیاو دەزانن و دەڵێن کەلامی الله لە ناو نەفسی خۆیدایەو ئەمەش دوا جار سەری لەوە دەرکرد وتیان قورئانیش مەخلوقە و ئاخاوتنێکی دەروونی الله خۆیەتی!

٢- نکۆڵییان لە سیفەتە ئەزەلییەکانی اللە تعالی کرد وەکو (القدرة و الإرادة والعلم)، بۆیە دەیانوت الله خاوەن توانا نییە بە سیفەتی قودرەت و توانا بەڵکو هەر زاتێتی و زاتێکی ئەزەلییە بەڵام ئەو سیفەتانە ئەزەلی نین و ئەگەر ئەو سیفەتانەش ئەزەلی بن لەگەڵ زاتی الله ئەوا دەبێتە ڕێخۆشکەر بۆ مەسەلەیەك کە پێیان دەوت (تعدد القدماء).

٣- باوەڕیان وایە کە مرۆڤ بە خۆی هیچ توانایەکی نییە و بەڵکو ناچار و مەجبورە ئەو کردارانەی کە تێیدا درووست کراوە ئەنجامی بدات بۆیە پێیانیش دەوترا (الجبرية) و ئەم مەسەلەش وردەکاری و شیکردنەوەی زۆری تێدایە.

٤- دەیانوت ئیمان تەنها لە دڵدایە و لەگەڵ هەبوونی ئیماندا هیچ تاوانێك تەنانەت کوفریش بە ڕواڵەت و قسەی ئەو خاوەن ئیمانەوە ببینرێت هیچ زیانێکی نییە ، بۆیە بە شێك لە مورجیئەش دەژمێردرێن.

٥- باوەڕیان وا بووە کە الله لە هەموو جیگەیەکدا بوونی هەیە و جەهم خۆی دەربارەی الله وتوویەتی: (هو هذا الهواء مع كل شيء وفي كل شيء ولا يخلو منه

شيء). واته الله ئەو بایەیە و لەگەڵ هەموو شتێکدایە و له ناو هەموو شتێکدایە و شتیش نییە بەدەر بێت لەو زاتە! بەم شێوەش نکۆڵییان لەوە دەکرد الله لەسەر عەرش بێت و وشەی (استوی) یان له ئایەتی (الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى) [طه:٥]،تەئویل دەکرد به استولی!

٦- باوەڕیان وابوو کە بەهەشت و دۆزەخ هەمیشەیی نین و لەناو دەچن! سەبارەت بە ئەو ئایەتانەی کە ئاماژە بۆ هەتا هەتایی بەهەشت و دۆزەخ دەکات دەڵێن ئەوە بۆ موبالەغە و تێگەیاندنی خەڵکە کە کاتی مانەوەیان زۆر زۆرە بەڵام هەمیشەیی و هەتا هەتایی نییە و هەندێ بەڵگەیان لەو بارەوە دەهێنایەوە.

٧- بێگومان لە ئەنجامی نکۆڵی کردنیان لە ئایەتەکانی ناوو سیفەتەکانی الله تعالى نکۆڵییان له بینینیشی کرد له ڕۆژی قیامەتدا و ئەم عەقیدەیان دواتر موعتەزیلە بەرگرییان لێکرد لەخۆیاندا بەرجەستەیان کرد و بڵاویان کردەوە.

جەهمییەکان بۆ هەموو بۆچوونەکانی خۆیان له مەسەلەی نکۆڵی کردن له ئەسمائوسیفات و مەسەلەی جەبر و ناچاری مرۆڤەکان و لەناوچوونی بەهەشت و دۆزەخدا بە دوورودرێژی بەڵگەی قورئان و عەقڵ و عیلمی کەلام دەهێننەوە ، له بەرانبەردا زۆرێك له زانایانی ئیسلام وەکو ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و پێشەوا بوخاری و زۆری تر له زانا گەورەکان بەرپەرچی ئەوانیان داوەتەوەو یەك بەیەکی گومانەکانی ئەوانیان بە ئایەت و فەرمووده و عەقڵ هەڵوەشاندووەتەوە.

له دوای کوژرانی جەهم بیروباوەڕی جەهمییەکان کز و لاواز بوو، بەڵام بەتەواوی کۆتایی پێ نەهات و هەندێك له بیروباوەڕەکانیان لەناو تاقمی

موعتەزیلەدا ڕەنگی دایەوە وەکو خەلقی قورئان و هەندێك لە بۆچوونەکانی تریان دەربارەی سیفات.

بە کورتی: جەهمییەکان بنچینەی هەموو گومڕایی و لادان و شێواندنێك بوون لە ئیسلامدا و پێشەنگیش بوون بۆ گومڕاکانی دوای خۆیان، چونکە فیرقەیەکی کەلامی بەتوانا بوون لە مشت ومڕ و سەرلێ شێواندن و گومان درووست کردندا

# موعتەزیلە

# لە نێوان دوێنێ و ئەمڕۆدا

**موعتەزیلەکان:**

موعتەزیلە فیرقەیەکن لەوانەی کە پێیان دەوترێت (الفرق الكلامية) دامەزرێنەی (واصل بن عطاء)ە، کە بە هۆی بیروڕاکانی لە بازنەی وانەکانی حەسەنی بەسری جیابوویەوە و ئیعتیزالی دەرسەکانی کرد، موعتەزیلە بە تێگەیشتنیان لە ئیسلام خاوەن پێنج بنەمای سەرەکی خۆیانن و لە جێگەی تر بە شیکراوەیی باسمان کردوون.

موعتەزیلە بەوە ناسراون کە دەقەکانی قورئان و ئەو بڕەش کە لە فەرموودەکان باوەڕیان پێیەتی دەخەنە ژێر هەژموونی عەقڵ و تێگەیشتنی خۆیانەوە، بەناوبانگترین ئەو تاقمانەن کە عەقڵیان پێش نەقل خست و زاڵیان کرد بەسەر دەقەکانی شەرعدا، لەوەشدا شێواندن و تەئویلی واتاکان گەورەترین ئامراز و هۆکاری دەستیان بوو بۆ بەجێهێنانی ئەو مەبەستە، بۆ نموونە ئەو میزانەی کە لە قورئان و لە سوننەتدا بە ڕاشکاوی باسکراوە نکۆڵیان لێ کرد و وتیان مەبەست لەو ترازووە دادگەری پەروەردگارە نەك بە ڕاستەوە تەرازوویەك دانرابێت بۆ کێشانەی کردەوەی مرۆڤەکان، بە هەمان شێوە پردی صراط و سزای ناوگۆڕ و سیحر و هەموو ئەوانەو چەندین شتی تری جێگیر لە کیتاب و سوننەتیان لەواتاکانی خۆیان لایانبرد و نکۆڵییان لێ کرد.

ئەمەش دیـارترین بنەمـاو نیشـانەکانی مـوعتەزیلەن کە پێیـان جیـادەبنەوە لە فیرقەکانی تر:

١- موعتەزیلە عەقیدەو بیروباوەڕیان لە سەر پێنج بنەما بونیات نراوە:

* التوحید: مەبەستیان پێـی تەوحیـدی اللـە یە و نکـۆڵی کـردنە لە هـاوبەش و هاوشێوەیە بۆی و دەڵێن: الله نە (جوهر) و نە (عـرض) لە زات و حەقیقەتیـدا و نە پانە نە درێژە نە تـامی هەیە نە ڕەنـگ و بـۆنی هەیە و نە بە سـاردی و نە بەگەرمـی وەسف ناکرێت و وەسفی سەلبی لەو شیوە زۆر دەکەن بە خیلافی ئەهلی سوننەتەوە کە درێژە بەو سـیفەتە نەشـیاوانە نـادەن و دەڵـێن هـیچ سـیفەتێکی نەشـیاوی نیـیە نەگۆنجیت لە گەڵ مەزنی و پەروەرداگرێتی خۆیدا.

* العـدل: مەبەسـتیان پێـی پێـوانە و دیـاریکردنی حوکمەکـانی اللـە یە بەپێـی دادگەری و حـیکمەت، بەو پێـیەش نکۆڵییـان لەوە کـرد اللـە تعـالی کـردەوەی بەندەکانی درووست کردبێت، بەڵکو بەندەکان خۆیان ئەگەر خێر بێت و ئەگەر شەڕ بێت، دروستکەری کردەوەکانی خۆیانن.

* المنزلة بين المنزلتين: لەم بنەمایە مەبەستیان پێی کەسی فاسق ە، کە پێیـان وایە فاسـق لە دونیـادا نە ئیمانـدار ەو نە کافریشـە، بەڵکـو لەو نێـوانەدایە، ئەگەر تەوبە بکات دەگەڕێتەوە ناو خانەی ئیمان، ئەگەریش بەو حاڵەوە بمرێت بە هەمیشـەیی لە ئاگردا دەمێنیتەوە.

* الوعـد والوعيـد: مەبەسـتيان لەم بنەمـايە ئەوەيە ئەوانەی تـاوانی گەورەيـان ئەنجام داوە لە ڕۆژی قيامەتدا سوود لە شەفاعەت وەرنـاگرن و بە هەتـا هەتـايی لە دۆزەخدا دەمێننەوە.

* الأمـر بـالمعروف والنهـي عـن المنكـر: ئەم بنەمـا هەڵوێسـتی مـوعتەزيلە لە ئەنجامدەری تاوانە گەورەكان ڕوون دەكاتەوە، ئيتر ئايا دەسەڵاتدار بن يان خەڵكی ئاسايی، ئەوان يەك دەنگن لەسەر ئەوەی كە ئەمر بە مەعروف و نەهـی لە مـونكەر واجبە بە زمان و بە دەست و بە شمشـێر، جەنگـيش لە دژی هەر دەسـەڵاتدارێكی ستەمكاردا بە واجـب دەزانـن ئەگەر فاسـق بـن و مەرج نيـيە كـافر بـن ئەو كـاتە جەنگيان لە دژ بكرێت و خەڵكی هەڵسنەوە لە دژيان.

٢- هەروەها باوەڕيان وايە نە لە دونيا و نە لە قيامەتدا، كە هەرگيـز اللـە بە چـاو نابينرێت ، دەڵێن چونكە ئەگەر بينيمان بۆی جێگير كـرد واتە جـێگە و ئاراسـتەمان بۆی دياری كردووە و الله يش جێگەی و ئاراستەو جيهەتی نيـيە، ئـايەتی ( وُجُـوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ٠ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ) يشـيان تەئويـل كـرد و وتيـان (نـاظرة) بە واتـای (منتظرة) هاتووە لە ئايەتەكەدا!

٣- دەلێن قورئان كەلامی الله نییە وەكو قسە كردبێتی، بەلكو قسەكەی درووست كردووە و قورئـان مەخلـوقە! ئەو ئـايەتەی قورئانيشـە كە بەڕاشـكاوی اللـە تعـالی فەرموويەتی: {وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا} [النساء:١٦٤] دەڵێن: اللـە بە شـێوەيەك

قسەی لەگەڵ موسی کرد کە قسەکەی لەو دارەدا دروست کرد کە موسی لەلایدا بوو!

٤- نکۆڵی دەکەن لەوەی الله تعالی لەسەر عەشی بەرزی خۆی بێت و ئایەتی(الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى ) تەئویل دەکەن و دەلێن مەبەست لە وشەی (استوی) (استولی) یە!

٥- نکۆڵی لە شەفاعەتی پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم دەکەن بۆ تاوانبارانی ئومەتەکەی لە ڕۆژی قیامەتدا.

٦- هەروەها نکۆڵییان کردووە لەوەی شتێك هەبێت بەناوی کەراماتی ئەولیا، دەلێن ئەگەر کەرامات هەبێت تێکەڵی لە نێوان وەلی و پێغەمبەردا درووست دەبێت.

ئەمانەی باسم کرد دیارترین بیروباوەر و نیشانەکانی موعتەزیلەن و بیروباوەڕی تریشیان هەیە کە هەڵقوڵاوی ئەمانەن لەسەرەوە ئاماژەیان پێکرا،

موعتەزیلە لەم سەرەدەمەدا به گوڕو تینێکی تازەوە گەڕاونەتەوە گۆڕەپانی ئیسلامی و زیاتر لە ناو حیزبە ئیسلامییەکان ، هەروەها لەسەر ئاستی کەسایەتی و نووسەر و ڕۆشنبیر ومامۆستای زانکۆ و بانگخوازاندا بوونیان هەیە، عەلمانییەکانیش بە گشتی پێشوازییەکی گەرم لەو بیرکردنەوە دەکەن و ڕێز لە هەڵگرانی ئەو بیروباوڕە دەکەن!

بەڵام ئەمانیش وەکو مورجیئە و خەواریج هەموو بیرۆکە و عەقیدەکانیان لە جەماعەتێکی دیاریکراودا بە تەواوی ڕەنگی نەداوەتەوە، بەڵکو بە ڕێژەیە و

کەمێکیش جوانکاری و گۆڕانکاری بۆ دەکەن وەکو خۆڵ لە چاوکردنی خەڵکی بـۆ ئەوەی قبول بکرێت..

سەبارەت بە کوردستانی خۆمان، بە هەمـان شـێوە لەنـاو حیـزبە ئیسـلامییەکاندا بیروبۆچوونەکانی موعتەزیلە ڕەنگدانەوەو پشتگیری زۆری لـێ دەکرێـت و لەسـەر ئاستی سەرکردایەتی و کەسە دیارەکانیاندا بەرگری لە بیرۆکەکانیان دەکرێت، بەڵام بەهــۆی ئەوەی ئاســتی زانســتی شــەرعی ئەو ســەرکردانەی لەنــاو حیــزبە ئیسلامییەکاندا پشـتگیری لە بیـرۆکەی مـوعتەزیلە دەکەن زۆر لاوازە، بـۆیە زیـاتر پاشکۆیی موعتەزیلە عەرەبە هاوچەرخەکانیان پێوە دیارە .

# جیاوازی عەقیدەی موعتەزیلە لە عەقیدەی ئەهلی سوننەت

**(سەرەتاکان):**

لە ڕاستیدا موعتەزیلەکان هیچ گومانێکی تێدا نییە کە تێگەیشتنیان بۆ ئیسلام تێگەیشتنێکی نامۆیە و بنەماکانیشیان لەمەڕ عەقیدەو بیروباوەڕدا بنەماگەلێکی جیاواز و نامۆن و هەڵقوڵاوی تێگەیشتنی فەیلەسووفەکانی یۆنان و فەیلەسوفە ئەژمارکراوەکانن لەسەر ئیسلام.

موعتەزیلە تاقمێکن لەو تاقمانەی کە لە کیتاب و سوننەت لایانداوە و ڕێڕەوەکەیان لەسەر بنەمای ڕەتکردنەوەی زۆرێك لە سوننەت و تێگەیشتنی خۆیان بۆ قورئان دامەزراندووە، موعتەزیلە بەوە ناسراون کە شوێنکەوتووی ئەقڵن و بەتێڕامان و تیگەیشتنی خۆیان بۆ دەقەکان لە دین تێدەگەن و هەر بەو شێوەش دەیکەن بە کردار!

هۆکاری ناونانیان بە موعتەزیلە چەند بۆچوونێکی لەسەرە، یەکێك لەوانە ئەوەیە کە موعتەزیلە دریژەپێدەری ڕێگای ئەوانەن کە بێ لایەنییان هەڵبژارد لە شەڕی نێوان عەلی و موعاویە الله لێیان رازی بێت، بەڵام بەناوبانگترینی ئەو بۆچوونانە ئەوەیە کە دامەزرێنەری تاقمەکە (واصل بن عطاء) پاش درووست بوونی کێشە وناکۆکی لە نێوان خۆی و (الحسن البصري)دا بازنەکەی ناوبراوی لە مزگەوتی

بەسڕە بەجێهێشت و خۆی لێیان جیاکردەوەو و بازنەیەکی تری سەربەخۆی دامەزراند.

موعتەزیلە بە کۆمەڵێك بیروباوەڕی فەلسەفی و و قەناعەتی نامۆ و عەقیدەی جیاواز لە عەقیدەی ئەهلی سوننەت جیادەبنەوە، پێناسی سەرەکی ئەوان لە مەزهەبەکەیاندا ئەوەیە بە ئەقڵ و تێگەیشتنی کەسێتی خۆیان دینداری دەکەن و ئەقڵیان پەسەند دەکەنە سەر ڕواڵەتی دەقەکانی قورئان و هەروەها ئەو بڕە فەرموودەش کە باوەڕیان پێیەتی، چونکە باوەڕیان بە فەرمووده لە بنچینەوە سنووردار و مەرجدارە بە هۆی هەلوێستی خراپیان دەربارەی زۆرێك لە هاوەڵان الله لێیان ڕازی بێت، هەروەها لەبەر هەندێ هۆکاری تر کە پەیوەندی بە ڕێڕەوە نامۆکەیان هەیە لە تێگەیشتنی ئیسلام لە ڕۆشنایی عەقڵ و پەسەندکردنیشی بەسەر نەقڵدا!

موعتەزیلە بەو ناوەی خۆیان ڕازی بوون و نکۆڵییان لێ نەدەکرد، ئەگەرچی پێیان خۆشتر بوو پێیان بوترێت (أهل التوحيد والعدل) وەکو ئاماژەیەك بۆ ئەو دوو بنەمایەی بیروباوەڕیان، یان بە (العدلية)، بەڵام لەلای ئەهلی سوننەت زیاتر بە (المعطلة) ناسراون لەبەر ئەوەی سیفاتی اللە پەك دەخەن و نکۆڵی لێ دەکەن، هەندێ جاریش بە (الجهمية) دەناسرێن لەبەر ئەوەی لەمەسەلەی سیفاتدا درێژە پێدەری ڕێبازی جەهمیەکانی شوێنکەوتووی جەهمی کوڕی سەفوانن.

موعتەزیلە بەلای ئەهلی سوننەتەوە تاقمێکی گومڕان و لە مەنهەجی قورئان و سوننەت لایان داوە و کەسی موعتەزیلیش ئەو کەسەیە کە باوەڕی بە پێنج

بنەماکانی ئەوان هەبێت کە لە ئەهلی سوننەت پێی جیا دەبنەوە، بەڵام وەکو أبو الحسن الخیاط لە کتێبی (الإنتصار) دا دەڵێت: کەسی موعتەزیلی تا نکۆڵی لە سیفاتەکانی پەروەردگار نەکات با باوەڕی بە بنەماکانی تریشیان هەبێت پێی ناوترێت موعتەزیلی.

لە ڕاستیدا موعتەزیلە لە خۆیانەوە بەبێ هۆکار درووست نەبوون، بەڵکو کۆمەڵێك هۆکار و پاڵنەر لە دوای سەرهەڵدانیانەوە هەبوو، لەوانە:

- ئەو فیتنەی کە لە نێوان هاوەڵانـدا اللـه لێیان ڕازی درووست بوو لە پاش کوژرانی عوسمان الله لێی ڕازی بێت.

- درووست بوونی هەندێ تاقم وەکو خەواریج و شیعە و تاقمی تر.

- دزەکردنی زۆر کلتور و بیرۆکە و هزری میللەتانی تر بۆ ناو فیکری ئیسلامی لە ئەنجامی موسوڵمان بوونی کەسانێکی زۆر لە غەیری عەرەب.

گەورەترین جیاوازی لە نێوان ئەهلی سوننەت و موعتەزیلەدا ئەوەیە کە سەرچاوەی وەرگرتنی ئیسلام لەلای ئەهلی سوننەت تەنها قورئان و سوننەتە وئیجماعی ئوممەتیش لەسەر بنەمای کیتاب و سوننەت ئیعتیباری خۆی هەیە، بەڵام موعتەزیلە شوێنکەوتووی ئەقڵ و تێگەیشتنی کەسی خۆیانن، بەو عەقڵەیان زۆرێکیان لە واتاکانی قورئان ڕەتکردەوەو تەئویلیان کرد و سەبارەت بە سوننەتیش ڕێژەیەکی زۆر کەمیان قبوڵە لەبەر هەندێ هۆکار کە دواتر إن شاء الله ڕوونیان دەکەینەوە.

بە کورتی موعتەزیلە عەقڵیان کرد بە دەسەڵاتدار بەسەر نەقڵەوە واتە بەسەر دەقەکانی قورئان و سوننەتەوە لەو بەشەی کە باوەڕیان پێی بوو، هەموو حوکمەکانی ئیسلامیشیان خستە ژێر ڕکێفی تێگەیشتن و هزری خۆیانەوە، هەر بۆیە دواجار زۆرێکیان لە بنەما جێگیرەکانی ئیسلام ڕەتکردەوە و عەقڵیان لێ بوو بە جۆرە پەروەردگارێك کە دەیانپەرست و ملکەچی فەرمانەکانی دەبوون.

# جیاوازی عەقیدەی موعتەزیلە لە عەقیدەی ئەهلی سوننەت

**(سەرچاوەکانی وەرگرتن):**

لە ڕاستیدا جیاوازییەکانی عەقیدەی موعتەزیلە لەگەڵ ئەهلی سوننەتدا لە ڕووی چەندێتی وبڕەوە گەلێك زۆرن، لە ڕووی نـاوەڕۆك و چۆنێتیشـەوە بـریتین لە پرسـی گەورەو هەســتیار، ســەرەکیترین ئەو جیاوازییــانە خــۆی لەوەدا دەبیتــێەوە کە مـوعتەزیلە سـەرچاوەی وەرگرتنیـان لە سـەرچاوەی وەرگرتنـی ئەهلـی سـوننەت جیاوازە، موعتەزیلە عەقیدەیان لە کیتاب و سوننەت وەرنـاگرن! بەڵکـو لە زانسـتی کەلام و مەنتیق و فەلسەفە وەریدەگرن و هەر ئەوانەش دەکەنە پێوەر بۆ تێگەیشـتن لە تێکڕای ئیسلام.

باسەکانی عەقیدە لەلای موعتەزیلە لە ژێر ناوی (علم الکـلام) دا دەخوێنرێـت و پێشــکەش دەکرێــت، ئەمەش لە کاتێکــدایە کە ئەو زانســتە کــۆمەڵە باســێکی فەلسەفییە و کراوەتە پێوەر و زاڵ کراوەتە سـەر باسـەکانی بیروبـاوەڕ لە ئیسـلامدا، مەگەر بۆ مشت ومڕ و خـۆڵ لە چـاوکردن نەبێـت ئەگینـا موعتەزیلەکـان ئـایەت و فەرمووده ناکەنە بەڵـگە، ئەگەر بشـیکەن ئەبێـت بە فلـتەری عەقـڵ و تێگەیشـتن و میزاجی خۆیاندا تێپەڕێت، چونکە مەعلومە ئەوان لە کوێ عەقڵ و نەقڵ تێکگیـران عەقڵ پێش نەقڵ دەخەن! بەڵکو هەندێ بنەمای زانستی کەلام و مەنتیق و بنەمـای فەلسەفی دەکەنە پێوەری تێگەیشـتن لە دیـن و لە نێویشـیاندا ئایەتەکـانی قورئـان، واتە تێگەیشتنیان بۆ ئایەتەکانی قورئان بە پێی ئەو بنەمایانەیە کە ئاماژەمان بۆ کـرد،

بەڵام ئەهلی سوننەت عەقیدەکەیان ڕاستەوخۆ لە کیتاب و سوننەت وەردەگرن و لە ڕۆشنایی تیگەیشتنی زانایانی سەلەفدا بۆ دەقەکانی ئەو دوو سەرچاوەیە دینداری دەکەن و لە دەقەکان تێدەگەن.

الله تعالی فەرموویەتی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ) الحجرات:١. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان بە الله و بە پێغەمبەرەکەی هێناوە صلی الله علیه و سلم! لە شەریعەتی دینەکەتاندا هیچ کارێك ئەنجام مەدەن و بڕیاری هیچ شتێك مەدەن بەبێ گەڕانەوە بۆ الله و بۆ پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه و سلم بۆ ئەوەی نەکەونە ناو بیدعەو ئەقڵی خۆتان پێشی ئایەت و فەرمووده مەخەن نە بە قیاس و بەراوردکردن و نەبە حەزو بۆچوونی کەسێتی خۆتان.

مەنهەجی ئەهلی سوننەت ئەوەیە لە ئاستی دەقەکاندا دەوستن و تێیاناپەڕێنن و ڕەتیاناکەنەوە، بەڵام ئەهلی بیدەع و لە سەروویشیانەوە موعتەزیلەکان، تەنانەت مەسەلەی قیاس ئەهلی سوننەت یەکدەنگن کە قیاس لە پرسەکانی عەقیدەدا نابێت و درووست نییە.

سەرچاوە سەرەکییەکانی وەرگرتن لەلای ئەهلی سوننەت بریتین لە کیتاب و سوننەت و ئیجماع، هەروەها سەرچاوەی لاوەکیش هەیە کە بریتین لە فیترەتی ساغ و نەشێوێندراو وعەقڵ بەڵام لە ڕۆشنایی کیتاب و سوننەتدا.

موعتەزیلە - هاوکات تاقمەکانی تریش وەکو جەهمییەو ئەشاعیرە و ماتریدییە - وەکو (ابن القیم) لە کتیبی (الصواعق المرسلة ) دا دەگێرێتەوە، تێگەیشتنیان بۆ

عەقیـدە و بـۆ دەقەکـانی قورئـان و سـوننەت بە گشـتی لە ژێـر ئەم چـوار بنەمـا ناکۆکەدایە کە (ابن القیم) بە چوار بنەما تاغوتییەکان ناویان دەبات و بریتین لە:

١ - ئەوان دەڵێن: وتەی الله و پێغەمبەرەکەی صلی اللـه علیـه و سـلم بەڵـگەی لەفـزی و وتەیـین، خۆیـان لە خۆیانـدا نـابنە زانسـتێکی بەسـوود و نـابنە مـایەی درووستبوونی یەقین و دڵنیایی تەواو!

٢ - ئەوان باوەڕیان وایە: هەرچی ئایەتەکاتی سـیفات هەیە هەمـووی مەجـازە و خواستنە و بۆ نموونەیە، نەك بەڕاستەقینە مەبەست لەو شـتانە بێـت کە لە ئـایەت و فەرموودەکاندا لەوبارەوە هاتوون بەتایبەتی ئەوەی بە (الصفات الخبریة) ناسراون.

٣ -هەرچی ئەو فەرموودانەی لە پێغەمبەرەوە پێمان گەیشتووە صلی اللـه علیـه و سـلم و، لەڕێـگەی کەسـانی مـتمانە پێکـراو و دادگەرەوە وەرمـانگرتوون، هەمـووی ناگاتە ئاستی ڕاستی و دڵنیایی، بەڵکو دوا جار تێکڕایان جێگەی گومانن.

٤- ئەوان پێیان وایە: هەر کاتێك عەقڵ و دەقەکانی قورئان تێکگیران، ئەوا بەبـێ دوو دڵی عەقڵ پێشی دەق دەخرێت.

# جیاوازی عەقیدەی موعتەزیلە لە عەقیدەی ئەهلی سوننەت

**(نکۆڵی کردنیان لە سیفەتەکانی الله تعالی):**

موعتەزیلە ناوەکانی الله تعالی جێگیر دەکەن و نکۆلی لێ نـاکەن، بەڵام جێگیـر کردنەکەشیان بەهەمان شێوەی بەشەکانی تری عەقیدەکەیان بە شێوەیەکی بیدعی و نامۆیە و جیاوازە لە جێگیر کردنی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە:

- سەرەتا هەموو ناوەکانی اللـە تعـالی جێگیـر نـاکەن، بـۆ نمـوونە: ئەو نـاوەی لەڕیگەی فەرموودەی ئاحادەوە هاتبێت باوەڕیان پێی نییە، با لە هەر سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراوی فەرموودەشدا هاتبێت!

- ئینجا بۆ نموونە کە ناوی (العلیم و القدیر و السمیع و البصیر) جێگیر دەکەن ودەڵێن باوەڕیان پێیەتی، لە ڕاستیدا باوەڕیـان تەنهـا بەناوەکـانە بەبـێ سـیفەتەکان! واتە: باوەڕیان بە عەلیمە بەڵام بەبێ سیفەتی عیلم، قەدیر بەبێ سـیفەتی قـودرەت و ئیتر بەو شێوە، چونکە دەڵێن ئەو سیفەتانە زیادەیە لەسەر زاتی الله و وەکـو دەڵـێن دەبێتە هۆکار بۆ (تعدد القدماء)!

- هەروەها ناوەکانی الله بەلای مـوعتەزیلەوە تەوقیفـی نیـین! واتە ئەتوانرێـت ناوی تر جگە لەوەی لە قورئـان و لە سـوننەتدا هـاتووە بـۆ اللـە دابتاشرێـت ، لەو بارەشەوە (أبـو عـلي الجُبّـائی) کە یەکـێکە لە سـەرانیان، ڕۆچـوونی زۆری هەیە و وتـوویەتی هەر ناوێـك بەبەڵـگەی عەقـڵ ئاسـایی بێـت بە اللـە بوترێـت کەواتە ئەتوانرێت بدرێتە پاڵی!

- هەروەها لە گومڕاییەکانی تریان وەکو زانایان فەرموویانە ئەوەیە ، دەڵـێن ئەو ناوانەی الله مەخلوق و دروست کراون، واتە دەڵـێن: سـەرەتا اللـە بـووەو نـاوی نەبووە! تا بوونەوەری درووست کردووە و ئینجا ئەوان ئەو ناوانەیان لێ ناوە!

بە کـورتی - وەکـو توێژەرێـك دەڵێـت - بیروبـاوەڕی مـوعتەزیلە لە مەسـەلەی ناوەکانی الله تعالی دا، ئەگەرچی لە ناپەسەندی و گومڕاییدا ناگاتە ئاستی ئەوانەی پێشی خۆیان، بەڵام زۆریشی لەوان جیاواز نییە!

بەڵام ئەهلی سوننەت و جەماعەت هەموو ناوەکانی اللـە تعـالی کە لە قورئـان و سەحیحی سوننەتدا هاتووە بۆی جێگیر دەکەن، لەگەڵ ئەو سیفەت و شـوێنەوارەش کە ئەو ناوە ئاماژەی بۆ دەکات، باوەڕیان بەوە هەیە ئەوانە ناوی الله ن و هاواریـان پێ دەکرێت وەکو خۆی فەرموویەتی: { وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَـادْعُوهُ بِهَـا وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ } [الأعراف: ١٨٠].

سەبارەت بە سیفەتەکانی الله تعالی، موعتەزیلەکان هەڵوێست و بیروباوەڕیان لە گەڵ هەموو زانایانی سەلەفدا جیاوازە و بە بەهانەی پاراو ڕاگرتن و بەمەزن زانینـی الله تعالی سیفەتەکانی پەروەردگاریان پەك خست و تەعتیل و تەئویل کرد و لەسەر حەقیقەتەکانی خۆیان لایان برد تەنها لەبەر ئەوەی لەگەڵ بەڵگەکانی عەقڵـی ئەوان و ئەو فەیلەسووفانەی ئەوان شوێنکەوتوویانن یەکناگرنەوە.!

(القـاضي عبـدالجبار ) کە یەکـێکە لە سـەرانی ئیعتیـزال دەڵێـت: (إذا ورد في القرآن آيات تقتضي بظاهرها التشبيه، وجب تأويلها لأن الألفـاظ معرضـة للاحـتمال ودليل العقل بعيد عـن الاحـتمال). واتە: ئەگەر لە هەنـدێ لە ئایەتەکـانی قورئانـدا

بەرواڵەت واتای تەشبیهو لێکچواندن هات، لەو حاڵەتەدا پێویستە تەئویل بکرێن ولە واتا ڕواڵەتییەکانیان لابدرێن، چونکە وشەکانی قورئان ئەگەر و گومان هەڵدەگرن، بەڵام بەڵگەی عەقڵ دوورە لە ئەگەر و گومانەوە، وەکو دەردەکەوێت بەڵگەی عەقڵی لە زاهیری قورئان بەلاوە بەهێزترە!

بۆیە زۆربەی موعتەزیلەکان نکۆڵی لە هەموو سیفەتەکانی اللە تعالی دەکەن جگە لە چوار سیفەت نەبێت کە بریتین لە: ( الوجود ، الحیاة ، القدرة ، العلم) واتە: بوون وژیان و توانا وزانست، تەنانەت سیفەتی قسەکردنیش بۆ اللە جیگیر ناکەن! هەموو موعتەزیلەکانیش لەسەر ئەم بیروباوەڕەن هەر لە ڕەتکردنەوەی سیفاتدا لە شوێنکەوتووە کۆنەکانی (واصل بن العطاء) تاکو دەگاتە: (أبو الهذیل العلاف) کە ڕۆچوو بوو لە وتەو باسی فەیلەسووفەکانی یۆناندا وسیفەتەکانی اللە ی بۆ دوو جۆر پۆلێن کرد کە ناوی لێ دەنێت: (صفات أفعال وصفات ذات)، بەڵام دوا جار هەموویان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی تەنها ئەو چوار سیفەتە بۆ اللە جێگیر دەکەن کە سیفاتی (ذات) ی پی دەڵێن و تێکڕای سیفەتەکانی تری اللە ڕەتدەکەنەوە.

موعتەزیلە لەمەسەلەی سیفاتدا شوێنی عەقڵ و هەواو ئارەزووی خۆیان کەوتبوون و بە ئایەتە موتاشابیهاتەکانەوە خەریك بوون و زاهیری قورئان و سوننەتیان بەگشتی لەبەرژەوەندی ئەقڵ و تێگەیشتنی کەسێتی خۆیاندا ڕەت دەکردەوە.

موعتەزیلە لە مەسەلەی سیفاتدا مەنهەج و ڕێبازێکی نامۆیان ڕەچاو کردووە کە هەڵقوڵاوی تێگەیشتنی فەیلەسووفەکانی یۆنان و فەیلەسوفە بەناو موسوڵمانەکان بووە، مەنهەجەکەیان نەك هەر پێچەوانەی سەرلەبەری ڕێبازی هاوەڵان و زانایانی سەلەف و پێشینانی ئەم ئوممەتەیە، بەڵکو بە ئاشکرا لەگەڵ مەنهەجی خودی قورئانیشدا تێکدەگیرێت، چونکە چۆن دەکرێت الله سیفاتێکی زۆر بۆ خۆی لە قورئاندا جێگیر بکات و دوایی هیچ لەو سیفەتانە واتا نەبەخشن و تەئویل بکرێن وپەك بخرێن! هەر ئەو مەنهەجە نامۆ و گومڕایەش بوو موعتەزیلەی گەیاندە ڕێڕەوی تعطیل و نکۆڵی کردن لە سیفەتەکانی الله تعالی.

ئینجا چونکە بەڵگەی عەقڵ بەلای موعتەزیلەوە بەڵگەیەکی سەلمێنەر و حاشا هەڵنەگرە! بۆیە عەقڵ و بۆچوونی کورت و تەسکی خۆیانیان پێشی ڕواڵەتی قورئان و سوننەت خست و دواجار عەقڵەکەیان سەری لە بێ عەقڵیەوە دەرکرد! چونکە ڕێگەیان بەخۆیان دا عەقڵی مرۆڤێکی پڕ لە کەم و کورتی بکەن بە خاوەن دەسەڵات و دادوەر بە سەر دەقەکانەوە!

موعتەزیلە لە پاساوی ڕەتکردنەوەی سیفەتەکانی الله تعالی دەڵێن ئەو سیفەتانە (عرض)ن، ( مەبەستی موعتەزیلە لە وشەی العرض وەکو القاضي عبدالجبار دەڵێت بریتییە لە: ڕەنگ و تام و بۆن و گەرمی و ساردی و ئازار و دەنگ، یان وەکو الرازي دەڵێت: بریتییە لە شتێك پێویستی بە جێگەیەك بیت بچێتە ناوییەوە) درووستیش نییە الله بە هیچ سیفەتیکی زیاد لە زاتی خۆی وەسف بکرێت، ئەوەش لە کاتێکدایە کە هیچ زانایەك لە ئەهلی سوننەت وشەی (عرض) ی بۆ الله

بەکارنەهێناوە ، بەڵکو ناوو سیفەتەکانی الله یـان وەکـو ئەوەی لە قورئانـدا هـاتووە بەو شێوەی کە شایستەی پەروەردگارە بۆی جێگیر کردووە.

لە دەرەنجامی ڕێڕەوی گومڕای موعتەزیلە و نکۆڵی کردنیان لە سیفاتەکانی اللـە تعالی، کە لە ڕاستیدا ئەوانیش ئەو بیدعە گەورەیان لە سیفاتدا لە (الجعد بن درهم) و (جهـم بـن صـفوان) وەرگرتبـوو، هەموویشـیان وا دەردەکەوێـت لە فەیلەسـووفە یۆنانییەکـانەوە وەریـان گرتـووە وەکـو ئەفلـۆتین، بەو عەقیـدە ناکۆکەیـان لە گەڵ عەقیدەی ئیسلامدا دەرگایان لەسەر پشـت بـۆ دووبەرەکـی و نـاکۆکی لە ئـوممەتی ئیسـلام کـردەوەو بیانوویەکیـان دا بە دەسـتی دوژمنـانی ئیسـلامەوە بەتـایبەتی ڕۆژهەڵاتناسەکان کە هێرش بکەنە سەر عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسـلام و موسـوڵمانان و بەو بۆنەشـەوە تـاکو ئێسـتەش مـوعتەزیلە هەمیشـە لەلایەن نەیـارانی ئیسـلام و بەتایبەت عەلمانییەکان زۆر بەچاوی ڕێزو گەورەییەوە تەماشای دەکـرێن! تەنـانەت هەرچی ئەوانەش کە بەناو ئیسلامەوە لە ئیسلام لایانداوەو لە سەر ئیسلام حیسـاب دەکرێن هەموویـان بە فیکـری مـوعتەزیلە سەرسـامن و گومراییەکانیـان بە حەق و ڕاستی دەزانن!

بەڵام ئەهلـی سـوننەت بە پـێچەوانەی مـوعتەزیلەوە، باوەڕیـان بە هەمـوو ئەو ناووسیفەتانەی پەروەردگار هەیە کە لە لە ئایەت و فەرموودە سەحیحەکاندا هاتووە و بەو شـێوەی کە لایـق بێـت بە زاتـی اللـە بـۆی جێگیـر دەکەن بەبـێ چـۆنیتی دیاریکردن و بەبـێ پەکخسـتنی مەعناکـانی و بەبـێ تەئویـل و گـۆڕینی واتاکانیـان باوەڕیان پێی هەیە.

# جیاوازی عەقیدەی موعتەزیلە لە عەقیدەی ئەهلی سوننەت

**(پێناسەیان بۆ قورئان):**

جیـاوازییەکی گەورەی تـری موعتەزیلەکـان ئەوەیە ئەوان پێناسـەو عەقیـدیان سەبارەت بە قورئانی پیرۆز جیاوازی بنچینەیـی تێـدایە لە گەڵ پێناسـەو عەقیـدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بۆ قورئـانی پیـرۆز وئەوەش یەکـێکە لەو هۆکـارانەی ئەوان شاییستەی نازناوی تاقمی گومڕا بوونە.

عەقیـدەی ئەهلـی سـوننەت سـەبارەت بە قورئـانی پیـرۆز ئەوەیە کە لە خـودی قورئان و سوننەتدا ئاماژەی ڕوون و ئاشکرای پێکراوە، کە الله تعالی خۆی قورئانی وەسـف کـردووە بەوەی کە قسـەو کەلامـی خـۆیەتی: (وَإِنْ أَحَـدٌ مِـنَ الْمُشْرِـكِينَ اسْتَجارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ) التوبة:٦. وەکـو دەبینـین الله سیفەتی کەلامی بۆ خۆی جێگیر کردووە، قورئان کەلامی اللـە یە هەم بە لەفـزو وشەکانی، هەم بە ناوەڕۆك و واتاکانی، جیبریل علیـە السـلام بە زمـانێکی عەرەبـی پاراو دایبەزاندووەتە سەر دڵی پێغەمبەرماندا صلی الله علیه و سلم.

قورئان بە پێی ڕوداوەکان بەش بەش دابەزیوە، لەلای الله تعـالی هـاتووە و هەر بـۆ لای خۆیشـی دەگەڕێـتەوە، ئەمە عەقیـدەی ئەهلـی سـوننەتە لە قورئانـدا وەکـو زانایان دەفەرموون.

بەڵام موعتەزیلە لەبەر ئەوەی سـیفاتەکانی اللـە تعـالی جـگە لە چـوار سـیفەتی نەبێت ڕەتدەکەنەوە و لەڕێگەی تەئویل و گـۆڕینی ڕواڵەتەکەیەوە تەعتیڵـی دەکەن -

کە سیفەتی قسەکردنیش بە هەندێ بیانووی فەلسەفی بە هەمان شێوە ڕەت دەکەنەوە - بۆیە باوەڕیان وایە قورئان کەلامی الله نییە و بەڵکو ئەویش درووست کراوێکی خۆیەتی وەکو درووستکراوەکانی تر!

لەم بارەوە زانایانی موعتەزیلە هەموویان کۆکن لەسەر ئەوەی قورئان مەخلوقە و کەلام و قسەی الله نییە! تەنها بۆ نموونە:

القاضي عبدالجبار کە شێخی موعتەزیلە بووە لەسەردەمی خۆیدا لە (المغني في أبواب التوحيد والعدل) ( ٧ / ٢٠٨ ) دەڵێت: (فصل : في وصف القرآن وسائر كلام الله تعالى بأنه مخلوق وما يتصل بذلك ) : قد بيَّنَّا فيما تقدم أن كلامه تعالى محدث ...... وإذا ثبت ذلك وجب أن يجري مجرى سائر أفعاله ، وإذا كانت توصف بأنها مخلوقة ؛ فكذلك القول في القرآن ...... والقرآن بهذه الصفة ، فيجب أن يوصف بأنه مخلوق ) وەکو دیارە چەندین جار بە ڕاشکاوی دەڵێت قورئان مەخلوقە و وەکو وتم هەموویان لەسەر ئەم عەقیدە گومڕاییەن کە دوورە لە عەقیدەی قورئان و سوننەتەوە.

موعتەزیلە قەناعەتی تەواویان بەو عەقیدە لاڕێ و ترسناکەی خۆیان هەبوو و شەڕی مان و نەمانیان لەسەری دەکرد، قەناعەت کردنی خەلیفە (المأمون) یش بەو بیرۆکەیە سەرەتا و وەرچەرخانێکی گەورە بوو بۆ بەهێزکردن و سەپاندنی ئەو بیروباوەڕە ،چونکە ئەو بڕیاریدا بە زۆر زانایان وقازییەکانی سەردەمی خۆی ناچار بکات باوەڕ بەو عەقیدە بهێنن، تەنانەت چەندین زانایان لەسەر باوەڕنەهێنان بەو

عەقیدەیە کوژران، وەکو: (نعیم بن حماد و البویطي و أحمد بن نصر الخزاعی و محمد بن نوح ) وەکو یەکێك لەزاناهاوچەرخەکان دەیگێڕێتەوە!

لەبەرانبەردا ئەهلی سوننەت لەو سەردەمەو تا ئەو کاتەی موعتەزیلە قەوارەو بوونیان هەبوو بەرگرییەکی توندیان لەوە کرد کە قورئان قسەو کەلامی اللە یە و مەخلوق نییە، ناخۆشی و زیندانی و ئەشکەنجەی زۆریشیان لەو پێناوەدا تووش بوو، چونکە موعتەزیلە خاوەن دەسەڵات و حوکم بوون، بەتایبەتی پێشەوای ئەهلی سوننەت أحمد بن حنبل بەڕەحمەت بێت.

(ابن قیم الجوزیة) رحمە اللە لە پێنج سەد زاناوە حوکمی کوفری هەرکەسێکی گێڕاوەتەوە کە باوەڕی وابێت قورئان مەخلوقەو کەلامی اللە نییە.

ترسناکی باوەڕبوون بەوەی کە قورئان مەخلوقە وەکو (عثمان الخمیس) لە زانایانەوە پوختی کردووەتەوە و لێیان دەگێڕێتەوە، خۆی کە چەند خاڵێکدا دەبینێتەوە:

١ - ئەو وتەیە، واتە کەسێك باوەڕی وابێت قورئان مەخلوقەو کەلامی اللە نییە، بەدرۆخستنەوەی اللە ی تێدایە، چونکە اللە خۆی فەرموویەتی: (أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ ۗ ) الأعراف:٥٤. واتە اللە جیاوازی کردووە لە نێوان دروستکردن و فەرماندا، فەرمانەکانی بە قسەکردن و بە کەلامی خۆی دەبێت نەك بە دروست کردن.

٢ -الله فەرموویەتی: (إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ أَن نَّقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ ) واتە الله تعالی بە قەولی خۆی خەلق درووست دەكات، بۆیە ئەگەر قەول خۆی مەخلوق و درووستكراو بوایە درووستكراوی تری پێ درووست نەدەكرد، چونكە مەخلوق توانای خەلق كردنی نییە (المخلوق لا يَخلق) و( الخالق لا يُخلق). حالقیش درووست ناكرێت

٣- كەلامی الله سیفەتێكە لە سیفەتەكانی، بۆیە ئێمە لە دوعاكانماندا وەكو پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم فێری كردووین دەڵێین: (أعوذ بالله بكلمات الله التامات) ئەگەر وشەكانی الله مەخلوق بوونایە چۆن فەرمانمان پێدەكرا پەنایان پێبگرین. واتە كلمات الله لێرە سیفەتێكی اللە یە و ئێمە پەنای پێ دەگرین، نەك درووستكراوی ئەو بێت!

٤- ئینجا ئەگەر وتمان كەلامی الله مەخلوقە و سیفەت نییە، ئەوە دەرگایەكی زۆر ترسناك لە عەقیدەدا دەكرێتەوە كە ئەو كاتە دەوترێت (سمع و بصر و قدرة ) و هەموو سیفەتەكانی تری اللە تعالی مەخلوق و درووستكراون و بەو شێوەیەش لەسەر ئەو عەقیدە گومڕایەیی ئەوان باوەڕت بە پەروەردگارێك دەبێت كە هیچ سیفاتێكی نییە! بەڵكو وەكو ئەوەیە لە بنچینەوە باوەڕت پێی نەبێت، چونكە مەگەر عەدەم و نەبوون سیفەتی نەبێت و بێ سیفەت بێت! گومڕاییش نییە لەمە گەورەتر.

٥- زانایان فەرموویانە باوەڕبوون بەوەی قورئان مەخلوقە، بەتاڵكردنەوەیە بۆ فەرمانەكان و قەدەغەكراوەكان! چونكە كە الله تعالی فەرمویەتی: (وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ) البقرة:٤٣. یان ( وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَا ۖ ) الإسراء:٣٢. زۆر جیاوازە

لەوەی بڵێیـت اللـە نـوێژ بـکەن و ڕۆژوو بگرنـی دروووسـت کـردووە! یـان خەلقـی قەدەغەکردنی زینای کردووە!

زانایـــانی ئەهلـــی ســـوننەت هەر لەو کـــاتەوە کە حەســـەنی بەسری هەڵســـا بەدەرکردنی (واصل بن عطاء ) لە بازنەی دەرسەکانی، لەو سـەردەمەوە کە پێشـەوا ئەحمەد سزاو ئەشکەنجەی زۆری لە میحنەتی خەلقـی قورئانـدا تـووش بـوو، هەر لەو دەمەی پێشـــەوایان و زانایـــان هەڵســـان بە نووســـینی ســـەدان کتێـــب بـــۆ هەڵوەشـاندنەوەی بیروباوەڕەکـانی مـوعتەزیلە و لەنێویشـیاندا گـومڕایی خەلقـی قورئان، تا دەگاتە هەوڵە مەزنەکانی (ابن تیمیة و ابن القـیم) بـۆ بەرگـری کـردن لە مەنهەجی ئەهلی سوننەت کە بەشێکی زۆری نووسـینەکانیان بـۆ بەرپەرچـدانەوەی موعتەزیلە تەرخان کرد و بەهەمان شێوە زانایـانی دوای ئەوانـیش، هەمـوو ئەمـانە بەڵگەن لەسـەر ئەوەی ئەهلـی سـوننەت هەر زوو دەرکیـان بە ترسـناکی عەقیـدەی گومڕای موعتەزیلەکان کردووە و بەرگریان لە قورئـان و سـوننەت هەر بە قورئـان و سوننەت کردووە و ڕەددی نەیارەکانیان پێ داوەتەوە.

# موعتەزیلە هاوچەرخەکان

تاقمی موعتەزیلە ئەگەر چی وەکو فیرقەیەکی ئیسلامی لادەر لە قۆناغێکی زەمەنی دیاریکراودا سەریان هەڵدا و وەکو قەوارە تەواو بوون، بەڵام وەکو هزر و کاریگەری فیکری و ڕێڕەو ، بە شێوەیەك لە شێوەکان هەر مانەوە ، لەوانەشە - بەبۆچوونی خۆم - ئەوان زۆرترین گاریگەری سەلبیان پاش نەمانیان لەسەر موسوڵمانان بەجێ هێشتبێت ، بەهۆی ژمارەیەکی زۆر لە گومان وتەمومژ نانەوە سەبارەت بە پرسەکانی قەدەر وکردەوەی بەندەکان ومەسەلەی ئەسماوسیفات و پشت بەستنی ڕەها بە عەقڵ، هاوکات ڕەتکردنەوەی فەرموودەو تێگەیشتنی سەلەف بۆ دەقەشەرعییەکان .

تاکو ئەم ڕۆژگارەی خۆمان ڕێبازی موعتەزیلەکان ڕاکێشان وکاریگەرییەکی بەرچاوی هەیە لەسەر هەندێ کەسایەتی و لایەنی ئیسلامی، بەڵام بە بێ ئەوەی دان بە ناوی موعتەزیلە بنێن بە ڕاشکاوی، ئەوەش بە هۆی ئەو ناوبانگە خراپەیە لە مێژوودا وەکو فیرقەیەکی لاڕێ و گومڕا بەدەستیان هێنا، بۆیە وەکو خۆڵ لە چاوکردن وچەواشەکاری خۆیانیان وەکو ڕەوتیکی عەقلی نیشاندا.

ئەگەر بمانەویت لایەنێك دیاری بکەین وەکو میرات هەڵگەری موعتەزیلەکان لەم سەردەمەدا ، ئەوا پێویستە قوتابخانەی عەقلانی دیاری بکەین ، کەسەرەتا لەسەر دەستی (جمال الدين الأفغاني) و ( محمد عبده) پەرەی سەند و گەشەی کرد ، دواتر تاکو ئێستاش بەردەوامییان هەیە لە ژێر ناوونیشانی جۆراوجۆر، وەکو:

تازەکردنـەوەی گوتـاری ئـایینی ، خوێندنـەوەی نـوێ بـۆ دەقـەکان، قوتابخانـەی چاکسازی، ئیسلامی هاوچەرخ، هەموو ئەم جۆرە بانگەشانەش لە ئاستێکدا سەر بە قوتابخانەی ئیعتیزالن و، کۆمەڵێ ئامانجیان هەیە کاری بـۆ دەکـەن ، پـێش هـەموو شتێکیش بەرنامەڕێژی دەکەن بۆ گونجاندن ونزیکبوونەوە لەنێوان فیکری ئیسـلامی و فیکری ڕۆژئاوادا، ئەوەش لە ڕێگەی کۆمەڵێك ئـامڕازو هۆکـاری دیـاری کـراو ، لەوانە: تەسك کردنەوەی ڕوبەری غەیبیات و تـەئویل کردنـی زۆرێـك لـەو هـەواڵ ڕوداوانەی لەقورئاندا هاتووە بەشێوەیەك عەقلی هاوچەرخ بـۆی قـوت بـدرێت، بـۆ نموونە (محمد عبدە) (حجارة من سجيل) ی تـەئویل دەکرد بەنەخۆشـی ئاوڵـە ، مەسەلەی فرەژنی ئەوەندە سنووردار کردبوو نزیك بـوو لـە قەدەغـە کـردن ، ئینجـا تەڵاقیش بەهەمان شێوە بە شـێوازێك باسـی دەکرد ڕۆژئـای پـێ ڕازی بکـات! بـە کورتی وەکو پیاوچاکێك دەفـەرموێت: ئـەم عەقلانییانە(موعتەزیلـە تازەکـان) وەکـو کۆمەڵێك عەیب و عار تەماشای ئیسلامییان دەکرد و خۆیشیان کردبوو بـە پینـەچی بۆ ئیسلام! بۆیە بێگومان ئەو قوتابخانەیە درێژەدانێك بوو بە ڕێڕەوی ئەو فیرقەیە.

موعتەزیلەکانی دوێنێ و ئەمڕۆیش چەند خاڵێکی هاوبەشـی جەوهـەری کۆیـان دەکاتەوە:

١- عەقڵ دەکەنە ڕکابەری وەحی وجاری واهەیە دەیکەنە داوەر بەسەریدا.

٢- پاشکۆیی بۆ فەلسەفەو ڕێڕەوی بێگانە، ئەوان کاریگەر بوون بـە یۆنانییـەکان وئەمانیش بە ئەوروپا وشارستانی ڕۆژئاوا.

٣- بە ڕەوا بینینی خۆ هەڵقورتان لە باسە غەیبیەکان و تەئویل کردنیان بەو شێوەی کە بە باشی دەزانن.

٣- بە گومان تەماشاکردنی فەرموودەکان و سوننەت بە گشتی، ئیتر بە ڕەتکرنەوەی بێت بە شێوەیەکی گشتی، یان ڕەتکردنەوەی فەرموودەی ئاحاد، واتە: تەنها وەرگرتنی متواتر.

٤- شەیدا بوون بە بڵاوکردنەوەی گومان و قسەی سەیرو بێ سەرو بەر دەربارەی شەریعەتی ئیسلام.

٥- هەروەها هەردوو لایان هاوبەشن لە بەرزکردنەوەی دروشمی لێبوردەیی ئایینی و ئازادی بیرو ڕاکە جێگای زۆر شتی دژ بە ئیسلامی تێدا دەبێتەوە.

موعتەزیلە تازەکان هەمیشە بە ئەهلی سوننەت دەڵێن: ئوصوڵی ، یان توندڕەوەکان و وزۆر ستایشی قوتابخانەی موعتەزیلە دەکەن: وەکو زەمەخشەری و هاوشێوەکانی، ئێستاش بەشێوەیەکی گشتی چەند بیروباوەڕیکی موعتەزیلە هاوچەرخەکان دەخەینەڕوو:

* نەهێشتنی بیروباوەڕی (الولاء والبراء) لە ڕێگەی بانگەشە کردن بۆ یەکگرتنی ئایینەکان و نزیکبوونەوە لەگەڵ شیعە وشتی لەشێوە.

* سڕینەوەی جیهاد بەتەواوەتی و گۆڕینی بە دفاع وبەرگریکردن ئەویش لە کاتی پێویستیدا.

* نکۆڵی کردن لە زۆرێك لەسزا شەرعییەکان بە تایبەتی ڕەجمی زانی و حـەددی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام ، چونکـە ئـەوە تێکـدەگیرێ لەگـەڵ ئـازادی بیروبـاوەڕ و ڕا دەربڕیندا.

* ڕیگەدان بە تێکەڵاوی ژنان وپیـاوان بـە شـێوەیەکی زۆر بـەرفراوان و گومـان درووسـت کـردن سـەبارەت بـە شـەرعیەتی سەرپۆشـی ئـافرەت وڕێگـەدان بەتەوقـەکردنی پیـاو لـە گـەڵ ژنـی نامـەحرەم و حـەڵاڵ کردنـی چەنـد جۆرێـك لەجۆرەکانی سوو وشتی تر.

* ڕەتکردنەوەی فەرموودەی ئاحاد لە بواری عەقیـدە یـان لای هەندێکیشـیانەوە بە ڕەهایی.

* نکـۆڵی کـردن لەهەنـدێ لـە موعجیزەکـانی پێغەمبـەر (صـلی اللـە علیـە وسلم)،هەروەها کەراماتی ئەولیا وشتی تر.

قوتابخانەی عەقلانی یان موعتەزیلە تازەکان ، لەسەرەتای سـەدەی بیسـتەوە بـە گەرمی کاردەکەن و بەرهەمیان هەیە، ئەمەش ناوی هەندێکە لەناودارەکانیان ، بەڵام هەموویان وەکو یەك نین سەبارەت بە ڕێژەی کاریگەری بوونیان بەو ڕێڕەوە ، بـەڵکو جیاوازییان هەیە لەڕووی زۆری وکەمیەوە: (جمال الدین الأفغـانی ومحمـد عبـدە ، أحمد خان الهندي وأحمد أمین، زهدي جار اللـە، زکي نجیـب محمـود ، معـروف الدوالیبي ، محمد البهي ، حسن الترابی ، سلیم العـوا ، طـارق السـویدان ، عمـرو خالد ، محمود شلتوت ، محمود ابـو ریـە ، طـە حسـین، عبـد الـرحمن الکـواکبی، محمد حسین هیکل نووسەری کتێبی (حیاة محمد) ، أحمد زکی أبو شادی، توفیـق

الحكيم، محمد فريد وجدى، أبو زيد الدمنهورى، فرج فوده، رشاد خليفة، أحمد صبحى منصور، عبد الله عنان، مصطفى محمود، مصطفى كمال المهدوى، معمر القذافي، روجيه جارودى، محمد عمارة، مصطفى المراغى، حسن حنفي، نصر حامد أبي زيد ، هشام جعيط ) زۆری تریش.

پرسیارێك دەمێنینەوە بیکەین: ئایا موعتەزیلەی هاوچەرخ لە کوردستان بوونیان هەیە؟ بەڵێ بێ گومان بوونیان هەیە، بە ئاسانی دەتوانین لە ڕۆشنایی ئەوەی باسمان کرد بیانناسین ، ئەوان چالاکن بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو ڕەوتە لە بیرکردنەوە لە ڕێگەی نووسین و کارکردنیان لە ناو هەندێ لەحیزبە ئیسلامییەکان وهەروەها وەکو چالاکوان لە ڕێکخراوی ناحکومیەکان و هەندێکی تریان وەکو مامۆستا لە زانکۆکان، هەندێکیش لەوانە بەڕاشکاوی لەسەر شاشەی تەلەفزیون و لە ڕۆژنامە وگۆڤار و تۆڕی جاڵجاڵۆکەیی بیروباوەڕی خۆیان دەخەنە ڕوو وبەرگری لێ دەکەن ولۆمەی موسوڵمانان دەکەن سەبارەت بە باوەڕ هەبوونیان بە هەندێ باس وخواست کە ئەوان بە دواکەوتنی دەزانن، بەڵام ئەوان لە ژێر ناوونیشانی بیرۆکەی ئیعتیزالدا کار ناکەن لەوانەشە ئەو پرسە ڕەتکەتەوە، لە نیشانە دیارەکانیان ئەوەیە زۆر بە بیری عەلمانییەت کاریگەرن و بەردەوام ڕەخنە لە مەنهەجی سەلەف دەگرن و لە ڕووی زانستی شەرعییەوە هیچیان پێ نییە و بە قسەی زل و درووشمی بێ ناوەڕۆك و ناڕاست خەڵکی و تایبەتی گەنجان فریو دەدەن، بۆ زیاتر شارەزابوون لەمانەی باسمان دەکرد، بڕوانە:

- مذاهب فكرية معاصرة، محمد قطب.

- تاريخ الفلسفة الحديثة، يوسف كرم.

- درء تعارض العقل والنقل، ابن تيمية بتحقيق د. محمد رشاد سالم.

– المعتزلة بين القديم والحديث لمحمد العبده وطارق عبد الحليم

والعصريون لمحمد حسين رحمه الله.

والفكر الإسلامي المعاصر لغازي التوبة.

غزو من الداخل لجمال سلطان.

مقال "المدرسة العقلية الحديثة وصلتها بالقديمة" للشيخ ناصر العقل.

كتاب دعوة جمال الدين الأفغاني في ميزان الإسلام لمصطفى غزال.

كتاب العصريون معتزلة اليوم ليوسف كمال

حوار هادئ مع الغزالي .سلمان العودة

العصرانيون و مزاعم التجديد - محمد حامد الناصر.

موقف المدرسة العقلية من السنة النبوية - الأمين الصادق الأمين

مفهوم تجديد الدين - بسطامي سعيد

مفهوم التجديد بين السنة النبوية وبين أدعياء التجديد المعاصرين - د.محمود الطحان

العصرانية في حياتنا الاجتماعية - د.عبدالرحمن الزنيدي.

العصرانية قنطرة العلمانية - سليمان الخراشي

# ماتوریدییەکان

ماتوریدییەکان تاقمێکن لە تاقم و فیرقە ئیسلامییەکان کە بە داهێنانی هەندێ بیدعە لە بواری عەقیدەدا لە مەنهەجی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لایاندا، ئەو تاقمە سەر بە (أبو منصور الماتریدي )ن کە یەکێك بووە لەو زانایانەی لە دژی بیدعە و بنەما فیکرییەکانی موعتەزیلە و جەهمییەکان وەستاوەتەوە، بەڵام دواجار خۆیشی کەوتووەتە کۆمەڵێکی تر لە لادان لە مەنهەجی ئەهلی سوننەت.

ئەبو مەنسوری ماتوریدی لە بابەتەکانی عەقیدەدا لەسەر مەزهەب و تێگەیشتنی ئەبو حەنیفە بووە وکۆمەڵێك کتێب و نووسینی لە دژی موعتەزیلە و بابەتەکانی تری عەقیدە هەیە بە تێگەیشتنی خۆی کە مەبەستی بووە بەرگری بکات لە بیروباوەڕی ئیسلامی لە دژی موبتەدیعەکان و لەو سەروبەندەدا خۆیشی تووشی هەڵە و لادان بووە، بۆیە خۆی و ئەوانەش کە شوێنکەوتووی ئەون بە فیرقەیەك دادەنرێن لەو تاقم و فیرقانەی کە لە مەنهەج لایانداوە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی تەکفیر نەکراون و ئەوانیش یەك جۆر نین و بە پێی گەورەیی و ئەندازەی بیدعەکەیان لە ڕێبازی ئەهلی سوننەت دوور دەکەونەوە،

ئەوانەی کە لێکۆڵینەوەیان لە مێژووی ئەم کۆمەڵە کردووە دەڵێن ئەوان بە چوار قۆناغدا تێپەڕیون:

١- قۆناغی دامەزراندن: ئەم قۆناغە لە سەر دەستی ئەبو مەنسور خۆی بەڕێوەچووە کە یەکێك بووە لە سەرانی قوتابخانەی عەقڵی و شارەزایی زۆری لە

گێڕانەوەی فەرموودەو شوێنەوارەکانی سوننەت نەبووە، بەڵام بە توندی چووەتە گژی موعتەزیلە و هەندێ تاقمی کەلامی تردا و بەرپەرچی داونەتەوە، ئەبو مەنسوری ماتوریدی لە سالی ٣٣٣ ی کۆچی وەفاتی کردووە.

٢- قۆناغی پێکهێنان: ئەم قۆناغە لەسەر دەستی قوتابی و شوێنکەوتوانی ماتوردی بەڕێوەچووە ولەم قۆناغەدا ئیتر ماتوردیدیە بوو بە مەزهەبێکی کەلامی و شوێنکەوتوانی زۆری پەیدا کرد و سەرەتا لە سەمەرقەند بوون و کۆششیان دەکرد بیروبۆچوونەکانی مامۆستاکەیان بڵاوبکەنەوە و کتێبی زۆریان نووسی و ئەبو حەنیفەش وەکو پێشەواو پێشەنگ بوو بۆیان، لە دیارترین کەسایەتییەکانی ئەم قۆناغەی ماتوریدی: أبو القاسم إسحاق بن محمد بن إسماعيل الحكيم السمرقندي وأبو محمد عبد الكريم بن موسى بن عيسى البزدوي .

٣- قۆناغی نووسینی کتێب و بنەمادیاریکردنی مەزهەبەکە: لەم قۆناغەدا کتێبی زۆرتریان نووسی و بەڵگەکانی مەزهەبەکەی خۆیانیان کۆکردەوە، لە دیارترین کەسایەتییەکانی ئەم قۆناغە: أبو المعين النسفي ، ونجم الدين عمر النسفي ..

٤- قۆناغی تەشەنە سەندن و بڵاوبوونەوە: ئەمە گرنگترین قۆناغەکانی مێژووی ماتوریدییەکانە، چونکە تیدا بە هۆی پشتگیریکردنی سوڵتانە عوسمانییەکان بۆ ئەم عەقیدەو بیروباوەڕە مەزهەبی ماتوریدی بە زۆرێك لە وڵات و ناوچەکانی ئەو سەردەمەدا تەشەنەی کرد و لە هیندستان و صین و بەنگلادش و لە ناو تورکەکان و لە وڵاتانی عەرەبدا بڵاوبوویەوە، لە دیارترین زاناکانی ئەو سەردەمەیان الكمال بن الهمام بوو.

بنەما و نیشانەكانی مەزهەبی ماتوردیی:

یەكەم: ماتوریدییەكان دینیان كرد بە دوو بەشەوە، عقلیات و سمعیات! كە ئەمەش بیدعەیەكی ئاشكرا بوو ئەنجامیاندا، دەیانوت: عەقلیات كە مەستیان پێی بابەتەكانی عەقیدە و تەوحید و ئەو پرسانەی پەیوەندی بە ئەسمائو سیفات و بیروباوەڕەوە هەیە، بە عەقڵ دەتوانرێت لێی تێبگەیت و نەقڵیش لەو مەسەلەدا تابیعی ئەقڵە! بۆیە زاهیری قورئان و سوننەت و ئیجماعی هاوەڵان لەو جۆرە باسانە لەلای ماتوریدییەكان نابێت بە بەڵگە، بەڵگە عەقلە و عەقڵ مەسەلەكان یەكلا دەكاتەوە!

دووەم: ماتوریدیەكان هەشت سیفەتیان لە سیفەتەكانی الله تعالی جێگیر كرد: (الحیاة، القدرة ، العلم، الإرادة ، السمع ، البصر ، الكلام ، التكوین) . جگە لەوانە هەموو سیفەتەكانی تریان وەكو سیفەتە خەبەرییەكان تەئویل كرد و لە سەر ڕوالەتەكەی لایاندا!

سێیەم: ئەگەرچی ئەوان دانیان بەوەدا ناوە كە كەلامی الله حەقیقەتە و ئەنجامی داوە، بەڵام مەبەستیان كەلامی نەفسییە كە الله تعالی لە نەفسی خۆیدا كردوویەتی و بەندەكان ناتوانن گوێیان لێی بێت، ئەوەش كە دەبیسترێت لە كەلامی اللە ئەوە بریتییە لە سیفەتێكی نەفسی قەدیمە نەك حەقیقەتی قسەكردن و كەلام! بەو پێیەش هیچ ڕێگرێك نییە لە لای ئەوان كە قورئان مەخلوق بێت و لەوەشدا چوونەوە سەر مەزهەبی موعتەزیلە!

چوارەم: دەڵێن ئیمان باوەڕهێنانە بەدڵ و نوتق کردنە بە زمان! نە زیـاد دەکـات و نە کەم دەکات، ناشبیت بڵێی من ئیمانـدارم ان شـاء اللـە، ئیسـلام و ئیمانـیش بەلای ئەوانەوە یەك واتایە و جیـاوازی نیـیە، واتە کردەوەیـان لە ئەسـڵی ئـیمان دەرکـرد و جیایان کردەوە، بەوەش چوونەوە سەر مەزهەبی مورجیئە.

پێنجەم: هەموو ئـایەت و فەرموودەکـان کە (قطعـي الثبـوت) ن و ئەگەر بە پێـی عەقڵ و تێگەیشتنی ئەوان (قطعي الدلالـة) ش بـن واتە ئاماژەکەیـان ڕوون بێـت و جێگای گومان نەبێت کاری پێ دەکەن، بەڵام ئەگەر ئاماژەکەی ڕوون نەبێت بە پێی عەقڵ و تێگەیشتنی ئەوان با جێگیر و (قطعي الثبوت) یش بێت کاری پێ ناکرێـت و تەئویل دەکرێت. هەنـدێ جـاریش تەئویـل نـاکەن بەڵام (تفـویض) دەکەن و بـۆ زانینی واتاکەی ئەڵێن نازانین واتای چییە الله زاناترە.

شەشەم: فەرموودەی ئاحاد بـا لە بوخـاری و موسلیمیشـدا بێـت یـان سـەنەدی صحیح بێت، لەلای ماتوریدیەکان جێگای گومانە و ئیشی پێ ناکرێت بەتایبەتی لە مەسەلەی عەقیدەدا.

حەوتەم: بنەمایەکی تریان هەیە پێی دەوترێت (التحسین و التقبیح) بالعقل واتە: عەقـڵ بـۆ خـۆی لە جـوانی و ناشـیرینی شـتەکان تێـدەگات، ئەمەش سـەری لە کۆمەڵێك پرسی فەلسەفی و عەقڵی جیاوازو ئاڵۆزەوە دەرکرد.

هەشتەم: لە مەسـەلەی مەجـازدا لە قورئـان و فەرمـوودە و زمانـدا زیـدەڕەوییان هەیە و بەو بەهانەوە زۆر لە ڕواڵەتـی قورئانیـان لەڕیـگەی تەئـویلەوە ڕەتکـردەوە و واتای تریان بۆ دیاری کرد.

نۆیەم: ناوەكانی الله یان جێگیر كرد و لەوەشدا هاوڕای ئەهلی سوننەت بوون، بەڵام چەندین ناوی تریان بۆ الله زیاد كرد وەكو (الصانع و القدیم و الذات) و بەوەش دیسان لە ئەهلی سوننەت جیابوونەوە.

دەیەم: لەبەر ئەوەی سەرچاوەی سمعیات لەلای ئەوان كیتاب و سوننەتە بە پێچەوانەی عقلیات، بۆیە لە پرسگەلێكی وەكو: (أحوال البرزخ، وأمور الآخرة من: الحشر، والنشر، والميزان، والصراط، والشفاعة، والجنة، والنار ) هاوڕای ئەهلی سوننەت و جەماعەت بوون.

یانزەیەم: باوەڕیان بەبینینی الله هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا، بەڵام نكوڵی لە جێگەو ئاراستە دەكەن بۆی، بەوەش لەگەڵ خۆیاندا كەوتنە تناقض و هەڵوێستی دژوارەوە.

دوانزەیەم: لە مەسەلەی قەدەریشدا بەهەمان شێوە موافەقەی ئەهلی سوننەتیان كرد و باوەڕیان وایە كە هەرچی لە گەردووندا ڕوو دەدات بە ویست و مەشیئەتی اللـه ڕوو دەدات و كردەوەی بەندەكان هەمووی درووستكراوی اللـه یە بەڵام بەندەكان لەوەی كە داوایان لێكراوە سەرپشكن ئەنجامی بدەن یان نەیدەن.

جگە لەوەش لە مەسەلەی هەڵوێستی موسلمان لە هاوەڵاندا هاوبۆچوون بوون لە گەڵ ئەهلی سوننەت وەكو تەرتیبی خەلیفەكان و ئەوەی كە ڕوویداوە لە نێواندا ئیجتیهادێك بووە و پێویستە ئێمە قسەی تێدا نەكەین و وتوویشیانە تانەدان لە هاوەڵان یان كوفرە یان بیدعەیە یان فیسقە.

لە ڕاستیدا مەزهەبی ماتوریدی لەگەڵ ئەشاعیرەدا جیاوازییەكی ئەوتۆیان نییە، جگە لە هەندێك مەسەلەی كەم نەبێت وەكو هەندێك لە لێكۆڵەرەوان دەڵێن و لە

ینەماکانیاندا یەکدەگرنەوە، هەندیك جیاوازییەکانی ئەشاعیرە و ماتوریدییە بە پەنجا مەسەلە دەگەیەنن. بەڵکو لە گەڵ موعتەزیلەشدا کە زۆر سەرقاڵی بەرپەرچدانەوەیان بوون بە هەمان شێوە خاڵی هاوبەشیان هەیە.

لەم سەردەمەشدا عەقیدە و بیروبۆچوونی ماتوریدییە لە زۆر جێگەی جیهاندا بەربڵاوەو ئیشی پێ دەکرێت بەتایبەتی لەلای ئەوانەی کە لەسەر مەزهەبی ئەبو حەنیفەن لە فیقهدا زۆر جار لە عەقیدەشدا لەسەر تێگەیشتنی ماتوریدیەکانن و جەماعەتی (طالبان) یش لە ئەفغانستان پەیڕەوی لەو مەزهەب و بۆچوونە دەکەن.

# قەدەرییەکان

قەدەرییەکـان ئەوانەن کە نکـۆڵی لە قەدەری اللـە تعـالی دەکەن، دەڵـێن اللـە عزوجل کردەوەی بەندەکانی خۆی درووست نەکردووە، بەڵکو خۆیان کردەوەکـانی خۆیان درووست دەکەن، هەروەها یەکێکی تر لە بیروبۆچوونە ناکۆکەکانیـان لەگەڵ عەقیدەدا ئەوەیە دەڵێن کە الله زانستی بە شتەکان نییە پێش ڕوودانی.

مێژووی سەرهەڵدانی قەدەرییەکان بۆ کۆتـایی سـەردەمی هـاوەڵان دەگەڕێـتەوە دوای تەواو بوونی سەردەمی خولەفای ڕاشیدین، بۆیە هەر یەك لە هاوەڵان عبدالله بن عمر وجابر بن عبدالله وأبي هريرة وابن عباس وأنس بن مالك وعبدالله بن أبي أوفى وعقبة بن عامر الجهنـي و هاوچەرخەکانیـان اللـە لێیـان ڕازی بێـت لە وتەو بیروباوەڕی ئەوان بەری بوون و نکۆڵییان لێ کرد، هەروەها ڕاسپاردەشـیان کـرد بـۆ دوای خۆیان کەوا کەس سەلامیان لێ نەکات و نوێژ لەسەر مردووەکانیان نەکات.

بیـدعەی قەدەر یەکەمـین جـار لە کەسـێکەوە بیسـترا بەنـاوی سنسـویە (یـان سوسن) بن يونس الأسواري، کە نەسڕانی بوو موسوڵمان بوو، دواتریش جارێکی تر هەڵگەڕایەوە و بوو بەنەسڕانی، لەویشەوە (معبد الجهني) ئەو بیدعەیەی وەرگرت و لەسەر دەستی الحجاج بن يوسف لە ساڵی ٨٠ی کـۆچی کـوژرا. لە مەعبەدیشـەوە (غـيلان الدمشــقي) بیــدعەی قەدەری وەرگــرت و بــڵاوی کــردەوەو بە فەرمــانی خەلیفەی موسوڵمانان هشام بن عبدالملك کوژرا.

زانایانی سەلەف زۆر توند بوونە بەرانبەر قەدەرییەکان و تەنانەت تەکفیری ئەوانەیان کردووە ە نکۆڵییان لە زانستی الله تعالی کردووە پێش ڕوودانی شتەکان، وەکو عبدالله بن أحمد بن حنبل بە ڕەحمەت بێت دەڵێت: سمعت أبي - رحمه الله - وسأله علي بن الجهم عمن قال بالقدر يكون كافرًا؟ قال: "إذا جحد العلم، إذا قال: إن الله عز وجل لم يكن عالمًا حتى خلق علمًا فعلِم، فجحد علم الله عز وجل، فهو كافر"؛ (السنة لعبدالله بن أحمد، رقم: ٨٣٥).

قەدەرییەکان لە ناو خۆیاندا دەبن بە بیست بەشەوە، لەوانە:

(الواصلية، والعمرية، والهذلية، والنظامية، والمردارية، والمعمرية، والثمامية، والجاحظية، والخياطية، والشحامية، وأصحاب صالح قبة، والمريسية، والكعبية، والجبائية، والبهشيمية) (الفرق بين الفرق لعبدالقاهر البغدادي صـ ٤٤) هەمووشیان لە ڕێگای حەق و لە مەنهەج و عەقیدەی ئەهلی سوننەت کە مەنهەجی قورئان و فەرموودەکانە لایانداوە، ، ئەمەش چەند نموونەیەکە لە بیروباوەڕی تاقمەکانیان:

١- الأحمرية: دەڵێن تەواوی دادگەری ئەوەیە کە الله واز لە بەندەکانی بهێنیت خۆیان چی ئەکەن بیکەن.

٢- الثنوية: ئەمانە دەڵێن هەموو خێرێك الله دروستی کردووە و هەموو شەڕ و خراپەیەکیش دروستکراوی شەیتانە.

٣- المعتزلة: کە بە مەسەلەی خەلقی قورئان و زۆر بیروباوەڕی تر ناسراون.

٤-الشيطانية: ئەمانە پێیان وابوو الله تعالى مرۆڤەکانی درووست کردووە بەڵام شەیتانی درووست نەکردووە.

٥- الشريكية: ئەمانە دەیانوت: خراپەکان قەزاو قەدەرە جگە لە شیرك نەبێت.

٦- الراوندية: ئەمانە باوەڕیان وابوو هەموو کتێبێك کە الله تعالى دایبەزاندووە، کاری پێ دەکرێت با مەنسوخیش بێت.

٧- البترية: ئەمانە دەیانوت الله تعالى تەوبەی تاوانباران وەرناگرێت.

٨- النظامية: ئەمانە شوێنکەوتووی إبراهيم النظام بوون دەیانوت هەرکێ بڵێت الله شتە (شیء)ە، ئەوە کافرە.

تاقمی قەدەرەییەکان بە دوو نیشانەی سەرەکی و دیار جیادەبنەو ودەناسرێن:

یەکەم: دەڵێن هەموو ڕووداوەکان دوور لە ویستی الله تعالى ڕوو دەدەن و پەروەردگاریش بەو ڕووداو و شتانە نازانێت تا ڕوو نەدەن.

دووەم: دەلێن مرۆڤ یان بەندە خۆی لە کردەوەکانی خۆی بەرپرسە کە لە ژیانیدا ڕوو دەدات و تەنها خۆی هۆکاری یەکەمی درووست بوونیانە.

باسی ئەم فیرقەیە لە هەموو کتێبەکانی سەلەفدا هاتووە کە دەربارەی عەقیدە نووسراوە و لە زانایانی متأخرين یش، شێخ الإسلام ابن تيمية و ابن القيم لە کتێبەکانیاندا زۆر باسیان دەکەن، بۆ نموونە کتێبی: (الصواعق المرسلة على الجهمية والمعطلة) ی ابن القيم کە باسی ئەوان و فیرقەکانی تر دەکات.

# جەبرییەکان

جەهمییەکـان فیـرقەو تـاقمێکن لە تـاقمە گومڕاکـان کە لە ئیسـلام لایانـداوە، پوختەی بیروباوەڕیان ئەوەیە کە مرۆڤ هەڵبژاردنی جۆری کردەوەکـانی بە دەسـتی خۆی نییە و لە هەموویدا ناچارە و توانای بڕیاڕدانی نییە و مەجبورە.

یەکەمین کەس کە ئەم بیرۆکەی لێ بیسترا (جعد بـن درهم)بـوو، دوای ئەویـش لەڕێگەی (جهم بن صفوان ) ەوە کە قوتابی ئەو بوو بڵاوی کردەوە.

هۆکاری ناونانیان بە جەبری یـان مجـبرة ئەوەبـوو وەکـو الشهرسـتانی دەڵێـت: (سمِّي الجَبريَّة بذلك لأنهم يقولون: إن العبد مُجبرَ على أفعاله، ولا اختيـار لـه، وأن الفاعل الحقيقي هو الله تعـالى، وأن اللـه سـبحانه أجـبر العبـاد عـلى الإيمـان أو الكفر؛ (الملل والنحل للشهرستاني جـ ١ صـ ٨٧). واتە: لەبەر ئەوە ئەو ناوەیان لـێ نـراوە چـونکە دەڵـێن بەنـدە ناچـارە لەسـەر ئەنجامـدانی کردەوەکـانی و هـیچ هەڵبژاردنێکی نییە، بەڵکو بکەری ڕاسـتەقینە اللـه تعـالی یە کە هەر خـۆی ئەوانـی ناچاری ئیمان و کوفر کردووە.

جەبریەکان دەڵێن هیچ کەسێك لە ڕاستیدا توانای ئەنجامدانی هیچ کردەوەیەکی نییە و الله خۆی خاوەنی هەموو کردەوەیەکە، ئەوەش کە دەوترێت فـڵانە کەس ئەو کارەی ئەنجامدا ئەوە قسەیەکی مەجازییە و وا نییە، وەکو چۆن دەوترێت خۆر ئاوا بوو، دەستارەکە خولایەوە، ڕوبارەکە ڕێی کرد، خۆیشی لە ڕاسـتیدا ئەو بـێ گیانـانە

توانای نە ڕێکردن و سوڕانەوەو ئاوابوونیان نییە، بەڵکو ئەوەی ئەو کارانە ئەنجام ئەدات پەروەردگارە.

درووست بوونی جەبرییەکان کاردانەوەیەك بوو بۆ تاقمی قەدەرەییەکان، چونکە بە پێچەوانەی جەبریەکانەوە دەیانوت بەندەکان خۆیان کردەوەکانی خۆیان درووست دەکەن و الله تعالی پێی نازانێت تا ڕوو نەدات، بۆیە ئەمان بە پێچەوانەوە وتیان نەخێر بەندەکان خاوەنی هیچ توانایەك نین لەسەر ئەنجامدانی هیچ کردەوەیەك و ئەوەشی کە ئەیکەن بە دەستی خۆیان نییە و الله ناچاری کردوون بیکەن.

جەبرییەکان کۆمەڵێك نیشانە و بنەمای تایبەتیان هەیە بە تاقمەکەی خۆیانەوە کە پێی جیا دەبنەوە لە تاقمەکانی تر، لەوانە:

١- یەکەم بنەمایان ئەوەیە کە بەندە خاوەن کردەوەی خۆی نییە و هەرچی چاکەیەك یان خراپەیەك بکات بە دەستی خۆی نییە بەڵکو ناچارە بیکات و مەجبورە ئەنجامی بدات، ئەوان دەڵێن: بەندەکان وەکو گەڵای دارێکن با بیەوێت بەکاملا بیانبات دەیانبات. بۆیە هەرچیش کە دەدرێتە پاڵ مرۆڤ و بێ گیانەکان هەمووی لە ڕووی مەجازییەوەیە ئەگینا بکەری ڕاستەقینە الله یە نەك ئەو مرۆڤ و بێ گیانانە.

٢- جەبرییە نکۆڵییان لە سیفەتەکانی الله تعالی کرد و ئەوەش سەری لە بیدعەیەکی تری گەورەوە دەرکرد کە مەسەلەی خەلقی قورئان بوو، چونکە ئەوان نکۆڵی ئەوەیان کرد هیچ سیفەتێکی الله تعالی قەدیم بێت و کەلامیش یەکێکە لە

سـیفەتەکانی اللـه تعـالی بـۆیه نکۆڵییـان لێـی کـرد و وتیـان قورئـان له لایەن اللـه درووست کراوه نەك وتەی خۆی بێت و به قسه کردن ئەنجامی دابێت.

٣- باوەڕیان وابوو که الله تعالی هیچ سیفەتێکی زیادی نییه لەسەر زاتـی، بـۆیه نکۆڵییان له سیفەته ئەزەلییەکانی الله تعالی کرد و وتیان نابێت الله لەچەند بەشـێك پێکهاتبێت و ئەوەیان به شیرك دانا.

٤- نکۆڵییـان له هەر سـیفەتێك له سـیفەتەکانی اللـه تعـالی کـرد که مرۆڤەکـان هەیانبێت وەکو بینین و بیستن و وتیان ئەوه لێچواندنی الله یه به بەندەکانی خۆی.

٥- باوەڕیان وایه بەهەشت و دۆزەخ کۆتاییان پـێ دێـت و تەواو دەبـن له پـاش ئەوەی که ئەو ماوەی دیاری کراوه بۆیان لەلای الله تعالی تەواو دەبێت، بەهەشـت و دۆزەخیش کۆتاییان پی دێت.

٦- ئیمان لەلای جەبرییه جەهمییەکان تەنها ناسین و مەعریفەیه، بۆیه هەرکـێ به دڵی الله ی ناسی ئیتر با به زمانی کوفریش بکات زیانی بۆی نییه.

٧- نکۆلی دەکەن لەوەی الله تعالی لەسەر عەرش بێت بەڵکو دەڵێن اللـه تعـالی له هەموو شوێنێکه و له ڕۆژی قیامەتیشدا الله تعالی نابینرێت.

جەبرییەکان بەو بیروباوەڕەی که هەیانه دەربـارەی ئەوەی که مـرۆڤ مەجبـور و ناچـاره لەسـەر ئەنجامـدانی کردەوەکـانی خـۆی، بەو عەقیـدەو باوەڕەیـان هەمـوو شەریعەتەکانیان هەڵوەشاندەوەو باوەڕیان پێ نەما، چونکه ئەگەر مرۆڤ ناچار بێت لەسەر ئەنجامدانی کردەوەکانی کەواته هیچ سوودێك بۆ ڕەوانه کردنـی پێغەمـبەران و هەوڵی چاکسازان نامێنیت.

بەو واتا بێت مرۆڤ موسوڵمان بێت یان بێ باوەڕ، چاکەکار بێت یـان خراپەکـار، عیبادەت بکات یان تاوان ئەنجـام بـدات، لە هـیچ لەوانەدا بڕیـار بەدەسـتی خـۆی نییە! ئەوەش ڕاستەوخۆ لە گەڵ عەقیـدەی قورئـان و سـوننەت و سـەلەفی چاکـدا ناکۆکە چونکە ڕاسـتە اللـه تعـالی کـردەوەی بەنـدەکانی درووسـت کـردووە، بەڵام ئازادی بڕیارڕدانیشی بۆ خۆیان بە جێهێشتووە ئایـا ئیسـلام یـان کـوفر هەڵـدەبژێرن، چاکە یان خراپە ئەنجام ئەدەن.

جەبرییەکان بۆ بیدعەکەیان کۆمەڵێك گومانیان خستە روو لە ئایتەکانی قورئـانی پیـــرۆز بەڵام ئەهلـــی ســـوننەت یەك بەیەك ئەو گومانانەیـــان وەڵام دایەوە و هەڵوەشاندەوە.

# ئەشاعیرە

# پێناسەو بنەماکانی بیروباوەڕیان

**بنەماو مەرجەکانی ئەشعەری بوون:**

ڕێڕەوی ئەشاعیرە کۆمەڵە بنەماو بنچینەیەکی تـایبەت بە خـۆی هەیە، بەڵام سـێ لەو بنەمایـانە بە بنەمـای سـەرەکی دەژمێـردرێن کە لە ئەهلـی سـوننەت پێـی جیـا دەبـنەوەو بەو هۆیەشـەوە بـووە، کە ئەوان بـوون بە تـاقمێکی لادەر و، ئەگەرچـی خۆیـان دان بەو ڕاسـتیەدا نـانێن، بەڵام چەنـدین خـاڵی هاوبەشـی یـان لەگەڵ موعتەزیلە و جەهمیە و پێش ئەوانیش لەگەڵ فەلاسیفەدا هەیە.

زانایان دەڵێن: هەر کەسێك ئەو سێ بنچینەو مەرجـانەی پـێکەوە تێـدا مەوجـود بێت، ئەوە ئەشعەرییەکی تەواوە ، ئەگەر بۆ نموونە تەنهـا دانەیەکیـانی تێـدا بێـت، کەواتە بەشێکی لە ئەشعەرییەت تێدایە، ئەمانەش بنەماکانن:

١- پێشخستنی عەقـڵ لەسـەر نەقـڵ: سـەرانی ئەشـعەرییەت وەکـو فخرالـدین الرازي و أبـو المعـالي الجـويني وابـن فـورك و هەمـوو ئەوانـی تـر، ئەم بنەمـایە بە بنەمایەکی سەرەکی و مەزنـی مەزهەبەکەیـان دەزانـن. بـۆ نمـونە قـال اللـە و قـال الرسول لەلای ئەوان - وەکو زانـایەك دەڵێـت - تەنهـا خـۆی بەس نیـیە بـۆ ئەوەی وەربگیرێت، بەڵکو دەبێت بەفلتەری عەقڵیاندا تێپەڕ بێت و لەوێ مەعناکەی دیاری بکرێت، جا ئەگەر قایلکەر بوو باشە، ئەگینا ئەو کێشە لەلای ئەشـاعیرە دوو حەلـی هەیە، یەکەم ئەگەر دەقەکە فەرموودە بێت لە ڕێگەی تانەدان لە سـەنەدەکەی ئەگەر

ئاحـاد بێـت چارەسـەی دەکەن، چـونکە ئەوان فەرمـوودەی ئاحـاد لە عەقیـدەدا وەرناگرن با لە بوخاری و موسلم یشدا بێت، ئەگەر بەوە چارەسەر نەبوو، بۆ نموونە ئایەت بوو، ئەوە تەئویلی دەکەن و مەعنایەکی تری جیاواز لە زاهیری بۆ دادەنـێن، بۆ نمـوونە: ( وَجَـاءَ رَبُّـكَ) دەڵـێن، ئەوە مەبەسـتی هـاتنی ڕاسـتەقینە نیـیە، بەڵکـو مەبەستی (وجاء أمر ربك)ە، واتە الله خۆی نەهاتووە فەرمانەکەی هاتووە، ئیـتر بەو شـێوە زۆربەی زۆری ئەو ئایەتـانەی لەگەڵ عەقڵیانـدا ڕێکنەکەوێـت، بە سـووك و ئاسان تەئویلی دەکەن، بۆیە زۆر جار دەبینین ڕواڵەتی ئایەتەکە واتـایەکی هەیە و لە لای ئەوان واتایەکی تری هەیە.

٢- دابەشکردنی نەقڵ بۆ متواتر و ئاحـاد: بنچیـنەو بنەمـای دووەمـی سـەرەکی ئەشاعیرە بریتییە لەوەی هەرچی فەرمووودەو فەرموودەی قودسیش هەیە، دەیـانکەن بە دوو بەشـــەوە، متـــواتر کە ژمـــارەیەکی کەمە لە فەرموودەکـــان و لە پرســـەکانی عەقیـدەدا وەکـو بەڵـگە قەبـوڵی دەکەن، بەشـی دووەمـیش پێـی دەڵـێن ئاحـاد، کە ئەمەیـان زۆرترینـی فەرموودەکـانە و هەرچەنـد سـەحیح بێـت و بـا لە بوخـاری و موسـیلمدا بێـت، لە بـواری عەقیـدەدا هەر وەرینـاگرن و ڕەتیـدەکەنەوە، تەنهـا لە باسەکانی فیقهو غەیـری عەقیـدەدا وەریـدەگرن. بەڵام لە مەسـەلەکانی بیروبـاوەڕو عەقیدەدا عەقڵ دەخەنە پێش فەرموودەی ئاحادەوە.

٣- پێویسـتە هەرچـی نەقـڵ هەیە(واتە دەقەکـانی کیتـاب سـوننەت) تەئویـل بکرێـت، تـاکو لە گەڵ عەقڵـدا یەك دەگـرنەوە: واتە ئەوەش کە متـواتر بـوو و وەریانگرن، یان هەر ئـایەت و فەرمـوودەیەکی تـر کە لە گەڵ عەقـڵ و تێگەیشـتنی

ئەواندا ڕێکنەکەوێت، بەم بنەمـایەی سـێیەمەیان چارەسـەری دەکەن. بەم شـێوەش بنچینەی یەکەم و دووەمیان لە خزمەتی ئەم بنچینەی سێیەمەدایە.

بۆ نموونە: الله تعالی فەرموویەتی: (الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى) طه: ٥. ئەوان بەزمانی حاڵ دەڵێن: نابێـت! هەرچەنـد اللـه فەرمـوویەتی: (اسْـتَوَى) بەڵام خـۆی مەعناکەی (استولی) یە و نابێت ڕواڵەتی ئەو ئایەتە وەربگرین.

ئەشـاعیرە بەم سـێ بنەمـا نـامۆیە و بنەمـای تریشـیان هەیە، کە لە باسـەکانی داهاتوودا إن شاء الله باسیان دەکەیـن، مەودایەکـی گەورەیـان لە نێـوان خۆیـان و عەقیدەی سەلەفدا درووست کرد و بە هۆی تعصب و دەمارگیری بۆ مەزهەبەکەیـان و، هەروەهـا بەهـۆی ئەوەی لە زۆر لە سـەدەکاندا دەسـەڵاتیان بەدەسـتەوە بـوو وتوانیویانە زۆرێك لە زانا و ناوداران لە ڕێـگەی پێـدانی بەڕێـوەبردنی قوتابخـانە و دار الحدیث و ئەو شوێنانەی بەدەستیانەوە بووە، بـۆ لای خۆیـان ڕایـان بکێشـن و خۆیشیان لە گەڵ ڕۆژگاردا لە بنەما و بنچیـنە نامۆکانیـان لەگەڵ عەقیـدەی ئەهلـی سوننەتدا ڕۆ بچن و دوورتر بکەوتەوە.

## ئایا ئەشاعیرە شوێنکەوتووی ئەبولحەسەنی ئەشعەرین؟

ئەمە پرسیارێکە زانینی وەڵامەکەی زۆر گرنگە، ئایا ئەشاعیرە کە بەنازناوەکەیان بێت سەر بە ئەبولحەسەنی ئەشعەرین، لە حەقیقەتدا شوێنکەوتووی ئەون؟ ئەگەر لە بنچینەو بنەماکانی مەزهەبەکەیاندا ڕەچاوی عەقیدە و تێگەیشتنی ئەبولحەسەنیان کردبێت، ئەوە ڕاستە ئەوان شوێنکەوتووی ئەون، ئەگەرنا، لە ڕووە زانستییەکەوە شوێنکەوتووی ئەو نین، با ئەو ناوەش لە خۆیان بنێن.

گرنگە بزانین أبو الحسن الأشعري کە لە سەر بۆچوونی پەسەند لە دەوروبەری ساڵی ٣٢٤ی کۆچی وەفاتی کردووە، چل ساڵ لەسەر ڕێڕەوی موعتەزیلەکان بووە و، لەگەڵ سەرگەورەی موعتەزیلەکاندا کە أبو علي الجبائي بووە لە یەك ماڵدا ژیاون، لە دوای ئەوە حەقیقەتی گومڕایی موعتەزیلەکانی بۆ دەرکەوتووە و لەسەر مینبەرەوە وەکو ابن النديم لە کتێبی (الفهرست ل٢٢٥) دا دەڵێت، أبو الحسن الأشعري وتوویەتی: خەڵکینە، ئەوەی دەمناسێت دەمناسێت، ئەوەشی نامناسێت خۆمی پێ دەناسێنم، من فلانی کوڕی فلانم، قەناعەتم وا بوو کە قورئان مەخلوقە و الله بەچاو نابینرێت و وامدەزانی کردەوە خراپەکانم خۆم درووستی دەکەم، بەڵام من لەو بیروباوەڕانە تەوبە دەکەم و بەرپەرچی موعتەزیلە دەدەمەوە ولەدوای ئەوە دەستی کرد بە بەرپەرچدانەوەو هەڵماڵینی پەردە لەسەر بیروبۆچوونەکانیان. ئەمەش جگە لە ابن النديم زۆرێك لە زانایان و مێژوونووسانی تر باسیان کردووە.

دوای ئەوە بۆ ماوەیەك ئەبولحەسەنی ئەشعەری چووەتە سەر ڕاوبۆچوون وعەقیدەی (عبد الله بن سعید بن كُلاَّب)، كە ئیمام ئەحمەد زۆر توند بووە لە دژی ئەو كەسە بە هۆی عەقیدەكەیەوە، وەكو لە كتێبی " سیر أعلام النبلاء " (٣٨٠/١٤)دا هاتووە.بەڵكو ابن تیمیة لە كتێبی ( في درء تعارض العقل والنقل) (٦/٢)دا دەگێڕێتەوە ئیمام ئەحمەد زۆر بەرانبەر الحارث المحاسبی ش توند بووە تەنها لەبەر ئەوەی لە ابن كُلاَّب نزیك بوو و لەسەر مەزهەبی ئەو بووە لە عەقیدەداە،:ئەمەش بە قۆناغی دووەمی فیكرو عەقیدەی ئەبولحەسەن دادەنرێت كە لە هەندێ مەسەلە لەسەر مەزهەبی ئەهلی سوننە بووەو لە هەندێكی تردا پێچەوانەیان بووە، بەڵام بە شێوەیەكی گشتی مەزهەبێكی جیاواز بووە لە مەزهەبی ئەهلی سوننەت و جەماعەت.

ئەوەی كە هەیە هەر ئەوەندەیە بەراورد بە قۆناغی یەكەمی موعتەزیلە بوونی، ئەبولحەسەنی ئەشعەری ئەم قۆناغەی جۆرێك بووە لە نزیك بوونەوەی لە عەقیدەی سەلەف ئەگەرچی تەواو لە بازنەی هیدایەتدا نەبووە. بۆیە لەم قۆناغەدا ئەبولحەسەنی ئەشعەری ڕاستە لەسەر فیكرە و بیروباوەڕی ئیعتیزال نەماوەتەوە، بەڵام نە بەتەواویش بۆ مەنهەجی ئەهلی سوننەت نە گەڕاوەتەوە، چۆن بڵێی لە عەقیدەدا لە نێوان هیدایەت و گومڕاییدا بووە.

لێروشەوە خیلاف لە نێوان زانایان و مێژوونووساندا درووست بووە، هەندێك پێیان وایە أبو الحسن الأشعري تاكو مردنی، لەسەر ئەو عەقیدەیە ماوەتەوە و لەڕاستیدا ئەشاعیرەكانی دوای خۆی و ئەم ڕۆژگارەش لەسەر عەقیدەی ئەشعەرین

لەو قۆناغەدا، ، هەندێكیش وەكو ابن كثیر ی موفەسیری قورئان وزانای تـر، پێیـان وایە أبـو الحســن لەدوای ئەو قۆنــاغە، ئینجـا بە تەواوی خــۆی لەو بیروبــاوەڕە موخالیفانەی ابن كلاب یش پاك كـردووەتەوەو گەڕاوەتەوە سـەر مەزهەبـی ئەهلـی سـوننەت و چـووەتە سـەر مەزهەب و تێگەیشـتن و عەقیـدەی ئەحـمەدی كـوڕی حەنبەل، بەڵگەش لەسەر ئەوە نووسینێتی بۆ كتێبی(الموجز) و(مقالات الإسـلاميين) و (الإبانة في أصول الـديانه) كە دوا كیتابەكـانە لە ژیانیـدا نووسـیوێتی و تێیـدا لە زۆربەی مەسەلەكاندا، عەقیدەی سەلەفی بڕیارداوەو لەسەری جێگر بووە.

با لێرەدا هەندێك لە بیروباوەڕو عەقیدەی أبو الحسـن الأشـعري بخەیـنەڕوو، كە لەو كتێبـانە وەریـدەگرین لە كۆتـا قۆنـاغ و كۆتـایی تەمەنیـدا نووسـیوێتی، بـزانین ئەشــاعیرەی ســەردەمەكانی دوای خــۆی لەســەر عەقیــدەی ئەون، یــان نەخێـر ، پێچەوانەی ئەو عەقیدەن:

١ -ئەبولحەسەنی ئەشعەری لە كتێبی (الإبانة في أصول الديانة)دا دەڵێـت: اللـه تعالى لەسەر عەرشی خـۆیەتی و ئینجـا ئەم ئـایەتەی هێنـاوەتەوە: ( الـرَّحْمَنُ عَـلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى) الله تعالى دوو دەستی هەیە بەبـێ دیـارییكردنی كەیـف و چـۆنێتی ئەو دەستە، ئەم ئایەتەشی هێناوەتەوە: ( خَلَقْتُ بِيَدَيَّ ) هەروەها ئـایەتی ( بَـلْ يَـدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ ) هەروەها وتوویەتی الله چاوی هەیە بەبێ دیاریكردنی چۆنێتی: (تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا) ئینجا دەڵێت الله وەجهـی هەیە:( وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلالِ وَالْأِكْـرَامِ) دوای ئەوە باسی عەقیدەی خـۆی دەكـات لەوەی كە ئـیمان قەولەو عەمەلە، زیـادو كەم دەكـــات، هەروەهـــا بە ڕاشـــكاوی وتـــوویەتی عەقیـــدەم وایە وەكـــو لە

فەرمودەداهاتووە کە الله بۆ ئاسمانی دونیا دادەبەزێت و دەفەرموێت: کێ داوای لێخۆشبوون دەکات لێی خۆش بم؟ ئینجا باسی باوەڕی بە فەرموودەکانی رسول الله دەکات

وهەروەها بە وەرگرتنی لە قورئان و لەفەرموودە و ئەم ئایەتە دەهێنێتەوە:( فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ) دوای ئەوە باسی باوەڕو عەقیدەی خۆی دەکات لە شوێنکەوتنی سەلەف و دەڵێت نابێت هیچ بیدعەیەك لە دیندا ئەنجام بدرێت و دەڵێت ئێمە لەسەر مەزهەب و ڕێبازی سەلەفین هەرچییان وتووە ئێمەش ئەوە دەڵێین.

٢ - أبو الحسن الاشعري لە کتێبی (رسالة إلى الثغر بباب الأبواب) دا هەموو سیفەکانی الله عزوجل جێگیر دەکات و وەکو خۆی و بەبێ گۆڕینی واتاکانی باوەڕی پێیەتی و دەڵێت: (وأجمعوا على إثبات حياة الله عز وجل لم يزل بها حيا وعلما لم يزل به عالما وقدرة لم يزل بها قادرا وكلاما لم يزل به متكلما وإرادة لم يزل بها مريدا وسمعا وبصرا لم يزل به سميعا بصيرا). لە دوای ئەوەش دەڵێت: ( وأجمعوا على أنه عز وجل يسمع ويرى وأن له تعالى يدين مبسوطتين وأن الأرض جميعا قبضته يوم القيامة والسموات مطويات بيمينه من غير أن يكون جوارحا وأن يديه تعالى غير نعمته، وقد دل على ذلك تشريفه لآدم عليه السلام حيث خلقه بيده وتقريعه لإبليس على الاستكبار عن السجود مع ما شرفه به بقوله ( مَا مَنَعَكَ أَنْ تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ) واتە بەدیاری کراوی دەڵێت دەست حەقیقەتی شایستەی بە اللە هەیە و مەعنای نیعمەت نییە و جگە لە هێنانەوەی بەڵگەی ئایەتەکان

بەڵگەی ئەوە دەهێنیتەوە کە اللە فەرموویەتی ئادەمم بە دەستی خۆم دروووست کردووە و سەرکۆنەی ئیبلیسی کردوە لەسەر خۆبەزلزانینی ئەو و سەجدە نەبردنی بۆ ئەو کەسەی اللە بەدەستی خۆی دروووستی کردووە.

ئینجا دەڵێت: ( وأجمعوا على أنه عز وجل يجيء يوم القيامة والملك صفا صفا لعرض الأمم وحسابها وعقابها وثوابها فيغفر لمن يشاء من المذنبين ويعذب منهم من يشاء). لێرەشدا وەکو بەڕاشکاوی دیارە سیفەتی هاتن بۆ اللە تعالى جێگیر دەکات و باوەڕی پێیەتی و ئایەتەکان بەبێ تەئویل کردن وگۆڕینی واتاکانی وەکو بەڵگە دەهینێتەوە، کە ئەمە خاڵێکی دابڕان و جیاوازی سەرەکییە لەگەڵ سەرانی ئەشاعیرەی دوای خۆیدا.

دوای ئەوە بە ڕوونی و بەراشکاوی، بەرزی اللە و (استواء)ی اللە لەسەر عەرشی خۆی جێگیر دەکات و بە (استولى) و هیچ واتایەکی تر تەئویلی ناکات و دەڵێت: (وأنه تعالى فوق سمواته على عرشه دون أرضه وقد دل على ذلك بقوله ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ﴾ وقال ( إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥۚ )وقال ( اَلرَّحْمٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوىٰ) وليس استواؤه على العرش استيلاء كما قال أهل القدر لأنه عز وجل لم يزل مستوليا على كل شيء). واتە خۆی لە قەولی قەدەرییەکان بەری دەکات کە وتوویانە (استوى) بە مەعنای (استولى) دێت و دەڵێت وا نییە و هەر بەحەقیقەت ئیستوای کردووە و سەرانی ئەشعەرییەت چەندین سەدەیە کێ باوەڕی بەو شێوە بێت و واتای ئایەتەکە وەکو خۆی لێی تێبگات بەبێ تەئویل کردن، پێی دەڵێن موجەسیمە و بەو واتا بێت ئەبولحەسەنی ئەشعەریش موجەسیمەیە.

٣ -أبو الحسن الأشعري لە سەرەتاکانی کتێبی (الإبانة في أصول الديانة)دا زۆر بە ڕوونی، باس لە دەستگرتنی بە کیتاب و سوننەت و ڕێبازی هاوەڵان و سەلەف لە پێشەوایانی أهل الحديث دەکات و بەتایبەتی باس لەوە دەکات کە ئەو لە عەقیدەدا لەسەر مەزهەب و تێگەیشتی پێشەوا ئەحـمەدی کـوڕی حەنـبەلە کە عەقیـدەی ئەو دیارە بۆ هەموو خاوەن زانستێك چۆن بـووە وچەنـد لەگەڵ عەقیـدەی ئەشـاعیرەی دوای ئەشعەری جیاوازی هەیە، دەڵێت:

(قولنا الذي نقول به وديانتنا التي ندين بها التمسك بكتاب الله ربنـا عـز وجـل وبسنة نبينا محمد وما روي عن السادة الصحابة والتـابعين وأئمـة الحـديث ونحـن بذلك معتصمون وبما كان يقول به أبو عبدالله أحمد بن محمد بن حنبـل نضرـ اللـه وجهه ورفع درجته وأجزل مثوبته قائلون ولما خالف قوله مخـالفون) ئینجـا لە دوای وەسف و سەنایەکی زۆر بۆ پێشەوا (أحمد حنبل) دەڵێت: (وأن له سبحانه وجها بلا كيف كما قال ( ويبقى وجه ربك ذو الجلال والإكرام )وأن له سبحانه يدين بلا كيف كما قال سبحانه ( خلقت بيدي ) وكما قال ( بل يـداه مبسـوطتان ) وأن لـه سـبحانه عينين بلا كيف كما قال سبحانه ( تجري بأعيننا ) واتە جارێکی تـریش لەم کتێـبەدا بە پێچەوانەی ئەشاعیرەکانی دوای خۆی (يد) و(وجه) بەبێ تأویل کـردن بـۆ اللـە عزوجل ثابت دەکات و ئایەتەکان لەسەری وەکو بەڵگە دەهێنێتەوە ، ناڵێـت دەسـت مەعنای نیعمەت ودەسەڵاتە، یان بڵێـت (وجـە) مەعنـای زاتە و ئەو جـۆرە تەئویـل وگۆڕینە ناکات لە واتای دەقەکاندا. لە ڕاستیدا کتێبی (الإبانة) بە شێویەکی گشـتی پێچەوانەی عەقیدەی ئەشاعیرەیە لەم سەردەمەدا، بەتایبەتی لە مەسەلەی صـفات و

وعلو و ئیمان و مەسەلەی تریش، وەکو ئەوەیە کتێبی زانایەك بێت لە نەیارانی ئەوان لە عەقیدەدا، نەك دامەزرێنەر و پێشەوای مەزهەبی ئەوان بێت.

بێگومان من لێرەدا تەنها دەمەوێت چەند نموونەیەکی کەم بهێنمەوە لە عەقیدەو بیروباوەڕی ئەبولحەسەنی ئەشعەری بە مەبەستی گەیشتن بەوەی ئایا ئاشاعیرە لە سەردەمەکانی پێشوودا و لەم سەردەمەی خۆیشماندا عەقیدەیان وەکو ئەو پێشەوایە بووە یان نا؟

لە ڕاستیشدا عەقیدەی ئەشاعیرە جیاوازە لە عەقیدەی ئەبولحەسەنی ئەشعەری کە ئەو بە پێشەوای خۆیان دەزانن، هەرکەسێکی ئەشعەری کەمێك شارەزایی هەبێت و دوور بێت لە دەمارگیری، دەزانێت کە ئەشاعیرە عەقیدەیان نە لە سیفات و نە لە (استواء) و نە لە ڕەچاوکردنی عەقیدەی سەلەف و پێناسەی ئیماندا، وەکو عەقیدەی ئەشعەری خۆی نییە، لەگەڵ ئەوەشدا با چەند نموونەیەك لە وتەی سەرانی ئەشاعیرەی دوای ئەشعەری بهێنینەوە، ئاخۆ یەك عەقیدەیان هەیە یان دوو عەقیدەی جیاواز:

١ -ابن فورك کە یەکێکە لە زانا گەورەکانی ئەشاعیرە و لە ساڵی ٤٠٦ ی کۆچی وەفاتی کردووە، لە کتێبی (مشكل الحديث وبيانه)دا،دەڵێت: (واعلم أنه ليس ينكر استعمال لفظ اليد على معنى النعمة ، وكذلك استعماله على معنى الملك والقدرة ) بەمەش لە ئەسڵێکی گەورەی پێشەواکەی لایدا و وەکو دیارە بە پێچەوانەی تێگەیشتن و عەقیدەی ئەبولحەسەنی مامۆستای تەئویلی واتای (ید) دەکات وەدەڵێت مەعنای نیعمەتە و دەسەڵاتە. ئەمەش تەنها بۆ نموونە هێناومەتەوە ئەگینا

ئەوە جێگای یەکدەنگییە لەلای ئەشاعیرە کە دەست مەعنای نیعمەت و قـودرەت و ئەو جۆرە واتایانەیە، نەك دەست وەکو لە زاهیری ئایەتەکە دەردەکەویت.

٢ -ئەشاعیرە، بە پێچەوانەی ئەبولحەسەنی ئەشعەری (استواء) جێگیر نـاکەن و بۆ (استولی) دەیگۆڕن، (مجیء) ش دەگۆڕن و دەڵـێن هەرچەنـد اللـه فەرمـوویەتی (وجـاء ربـك) ئەوە مەبەسـت لە هـاتن نیـیە، بەڵکـو واتـای هـاتنی فەرمـانی اللـه دەگەیەنێت نەك بە خۆی بێت، واتە ئەشاعیرە قەیدوشەرت لەسەر واتاکانی قورئـان دادەنێن، ئایەتەکە واتایەکە و تۆ ئەبیت بەپێی مەزهەبـی ئەشـاعیرە بە واتـایەکی تـر لێی تێبگەیت!

الفخر الرازی کە یەکێکە لە گەورەترین زانایانی ئەو مەزهەبە و لە ساڵی ٦٠٦ی کۆچی وەفاتی کردووە، لە کتێبی ( أساس التقدیس )ص ١٠٣ . واتـای هەمـوو ئەو ئایەتـانە وەکـو خـۆی جێگیـر ناکـات و دەیانگۆڕێـت وتەئویلیـان دەکـات و بە پێچەوانەی ئەشعەری لێیان تێدەگات ودەلێـت: (المـراد هـل ینظـرون إلا أن تـأتیهم آیات الله ، فجعل مجيء آیات الله مجیئاً له علی التفخیم لشأن الآیات ، کـما یقـال: جاء الملك إذا جاء جیش عظیم مـن جهتـه . أو یکـون المـراد : هـل ینظـرون إلا أن یأتیهم أمر الله ... أما قوله ( وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفّاً صَفّاً) إما وجاء أمـر ربـك ، أو جاء قهـر ربـك) . واتە (مجـیء) بەهەمـوو شـێوەیەك ڕەت دەکـاتەوە کە لەسـەر حەقیقەتی هاتن بێت و مەعنای تری بۆ دادەنێت.

فخر الدين الرازي لە کتێبی( أساس التقديس) ل ١٥٦، هەروەها الآمدي لە کتێبی (غاية المرام) ل١٤١:دەڵێن مەعنای (الاستواء) بە ( الاستيلاء والقهر ونفاذ القدر وجريان الأحكام الإلهية) واتە بەواتای دەسەڵات و جێبەجێکردنی ویست و قەدەری خۆی دێت، کە ئەمە تەئویل و گۆڕینێکی زۆر ڕاشکاوانەیە بۆ قەولی اللە تعالی و بەتەواوەتی پێچەوانەی وتەو عەقیدەی ئەبولحەسەنی ئەشعەرییە. زانایان و پێشەوایانی گەورەی ئەشاعیرە لە کتێبەکانیاندا واتای ئایەتێکی زۆر تەئویل دەکەن و واتایەکی تری بۆ دادەنێن، کە ئەوەش خاڵێکی جیاوازی گەورەو لێکدابڕانی عەقیدەی ئەهلی سوننەت و ئەشاعیریە.

بەڵکو (ابن حجر الهيتمي) کە یەکێکە لە زانا ناودارو گەورەکانی ئەشاعیرە لەسەردەمانی دوای ئەشعەری خۆیدا، تەکفیری ئەو کەسە دەکات باوەڕی وابێت اللە جیهەتی هەیە و لەسەر عەرش بێت و لە کتێبی: (الفتاوى الحديثية) (ص١٥١ – ١٥٤) دەڵێت: «من اعتقد الجهة في حق الله جل وعلا فهو كافر بالإجماع، ومن توقف في كفره فهو كافر... هەورەها لە کتێبی: «الفتاوى الكبرى الفقهية» (ص١٠) دەڵێت: (وقال جماعة من الأئمة بكفرهم) چونکە ئەوان بە گومان و بۆچوونی خۆیان دەڵێن ئەگەر کەسێك باوەڕی بەوە هەبێت اللە بە زاتی لەسەر عەرشە ئەوە جیهەتی بۆی دیاریکردەوەو هەر کێیش جیهەتی بۆ دیاری بکات کافر دەبێت، بەڵکو ئەوەش کە ئەو کەسە بەکافر نەزانێت وەکو ابن حجر الهيتمي دەڵێت ئەویش هەر کافر دەبێت، بۆیە لە سەیرو سەمەرەکانی عەقیدەی ئەشاعیرە ئەوەیە، کەسی ئەشعەری مەزهەب، دەبێت ئایەتەکە وەکو خۆی بخوێنیتەوە، بەڵام باوەڕی

بەمەعنای تر بێت، جیاواز لە ڕوالەتی ئایەتەکە، نابێت کەسیش ڕەخنەی لێبگرێت لەو تناقض و تێکگیرانە، ئەگینا بە (مجسمة) و بە کۆمەڵێك ناوناتۆرەی تر تۆمەتباری دەکەن.

٣ -ئەشاعیرە (العین) بۆ الله بەهەموو شێوەیەك تأویل دەکەن وبەمەعنای تر لێکی دەدەنەوە، لە کاتێکدا أبو الحسن الأشعري ئیسپاتی دەکات و بەڕاشکاوی دەڵێت مەبەستی چاوە لەسەر حەقیقەت نەك مەعنای تری هەبێت. عبدالقاهر البغدادي کە لە ساڵی ٤٢٩ی کۆچی وەفاتی کردوە، لە کتێبی (أصول الدین) ل١٢٩-١٣٠ بە هەموو شێوەیەك (عین) تأویل دەکات و دەڵێت ئەوە موجەسیمەکانن دەڵێن چاوی هەیە ، ئەگینا دەڵێت چاو مەبەستی بینین و چاودێری کردن و هەندێ واتای ترە. بەهەمان شێوە فخرالدین الرازي لە (أساس التقدیس)دا تأویل ی چاو دەکات بۆ مەعنای تر. ئەمە تەنها بۆ نموونە ئەگینا هەموو سیفاتە خەبەری و ئایەتی تریش تەئویل دەکەن و تەئویل کردن وەکو پێشتریش وتوومە ئەسڵ و بنەمایەکی بنچینەییە لەلای ئەشاعیرە لە مامەڵە کردنیان لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا.

لەم بەراوردانەدا لە نێوان عەقیدەی ئەبولحەسەنی ئەشعەری و عەقیدەی ئەشاعیرەکانی دوای ئەشعەری، وەکو ابن فورك و الجویني و الرازي و البغدادي وزۆری تر، دەردەکەوێت جیاوازییەکی زۆر لە نێوانیاندا هەیە و ئینتیسابی ئەشاعیرەی دوای ئەشعەری بۆ ئەبولحەسەنی ئەشعەری بەو شێوە نییە، بەڵکو ڕاست ئەوەیە وەکو زانایان فەرموویانە بوترێت، ئەوان لەسەر مەزهەبی ئەشعەرین

بەڵام پـێش قۆنـاغی گەڕانەوەی بـۆ عەقیـدەی سـەلەف، لەو کـاتەی کە لەسـەر عەقیدەی ابن کلاب بووە و پێش نوسینی کتێبەکـانی کە گەڕانەوەی تەواوی خـۆی بۆ عەقیدەی سەلەف تێیاندا ڕاگەیاندووە.

لە راستیدا ئەو تەئویلانەی کە ئەشاعیرەکانی وەکو أبو بکـر بـن فـورك لە کتێبـی «التأویلات» و الرازي لە کتێبی «أساس التقـدیس» دەیـکەن - وەکـو ابـن تیمیـة لە الفتوی الحمویة دەڵێـت - هەمـان ئەو تەئـویلانەیە کە موعتەزیلەکـانی وەکـو بشرـ المریسي ـ و أبـو عـلي الجبّـائي، وعبـد الجبـار لهمـذاني، و أبي الحسـین البصرـي دەیانکرد،. بەوەش دەردەکەوێت کە خاڵی هاوبەش لە عەقیدەی ئەشـاعیرەی دوای ئەبولحەسەنی ئەشعەری و عەقیدەی موعتەزیلەدا بوونی هەیە وئەوەش بەڵگەیەکـی ترە لەسەر ئەوەی ئەشاعیرە لەسەر مەزهەبی ئەشعەری نین لە عەقیدەدا، ئەوەندەی کە لە مەزهەبی موعتەزیلەوە نزیکن.

ئەم کورتە باسە سەرەتایەکە، بـۆ زنجیـرە باسـێکی زانسـتی دەربـارەی عەقیـدەو مەنهەجی ئەشاعیرە پێویست بوو باس بکرێت، لەبەر ئەوەی بزانرێت کە مەسـەلەی ئینتیسابی ئەشاعیرە بۆ ئەبولحەسەنی ئەشعەری مەسەلەیەکی زۆر دەقیق نییە وقسـە هەڵدەگرێت، مەگەر بە دانانی مەرج ودیاری کردنی ئەوەی ئەوان ئەشـعەرین بەڵام لەسەر قۆناغی پێش گەڕانەوەی ئەشعەری بۆ مەزهەبی سەلەف، واتە کـوللابین نەك ئەشعەری! چونکە ئەوان پێچەوانەی ئەبولحەسـەنی ئەشـعەرین لەوەی بڕیاریـداوە لە کتیبەکانی (مقالات الإسلامیین و اختلاف المصلین) و (الإبانة في أصول الدیانة) و (رسالة إلی أهـل الثغـر ببـاب الأبـواب) کە بەڕوونـی و بەڕاشـکاوی گەرانەوەی

خـۆی بـۆ مەزهەبـی سـەلەف و شـانازی کردنـی بە پێشـەوا أحمـد بـن حنبـل و شوێنکەوتنی بۆ عەقیدەی سەلەف و بۆ عەقیـدەی ئەو پێشـەوایە بەدیـاری کـراوی ڕادەگەیەنێت.

# ئایا ئەشاعیرە زۆرترینن؟

سەرەتا هەڵەیەکی زانستی و مەنهەجییە، زۆرینە بکرێتە پێوەر بۆ ناسینی حەق، بەڵکو خودی حەق کە خۆی لە قورئان و سوننەت بە تێگەیشتنی سەلەفدا دەبینێتەوە دەبێت بکرێتە پێوەری ناسینی حەق. بۆیە بە پێی قۆناغ وکات وخودی خەڵکی، دەکرێت زۆرینە لەسەر حەق بێت و زۆر جاریش زۆرینە لەسەر ناحەقە.

زۆر جار دەبیسین و دەخوێنینەوە دەوترێت: ئەشاعیرە زۆرترینن! جا بە کورتی، با هەر لە سەرەتاوە بڵێین: ئەوە ئیددیعایەکی بێ بەڵگەیە و قسەیەکە پێویستی بە سەلماندن هەیە.

لێرەدا دوای خوێندنەوە و وردبوونەوە لە قسەی زانایان و ئەوانەی لە ئەنجامی سەرسوڕمانیان لەو بانگەشە بێ بەڵگەیە وەڵامیان داوەتەوە، سەبارەت بەوەی ئایا ئەشاعیرە زۆرینەن یان نا؟ دەڵێم:

١- أبو الحسن الأشعري کە ئەشاعیرە خۆیان دەدەنە پاڵی و لەوەشدا کارەکەیان عەرەب واتەنی: (فیە نظر!) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ئەوە بزانرێت ئەو لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا وەفاتی کردووە و تا ئەو کاتە، واتە: لە هەموو سێ سەدە چاك و پڕ لە خەیرەکەی (القرون المفضلة) نەك کەس ئەشعەری نەبووە، بەڵکو ئەبولحەسەنی ئەشعەری لەو کاتانەدا هەر لەدایکیش نەبووە.

٢ -گەورەترین زانایانی ئوممەتی ئیسلام بە ڕەهایی لەو سەردەمانەدا بوونە کە تـا ئێسـتاش و لەوانەیە تـا ڕۆژی قیـامەتیش دیـن هەر لەوان وەردەگیرێـت، کە لەو سـەردەمانەدا ئەشـعەری جـارێ لەدایکـیش نەبـوو بـوو، ئیـتر چ مەعنـایەك بـۆ باسکردنی زۆرینەی و کەمیـنە دەمێنێـتەوە؟ لە کاتێکـدا یەکێـك لەو زانـا و پێشـەوا گەورانەی سێ سەدەکە کەسیان ئەشعەری نەبوونە و بەڵکو پـێچەوانەی عەقیـدەی ئەشـاعیرەش بـوونە، بـۆ نمـوونە چـوار پێشـەوایانی مەزاهیبەکـان و سـەرانی فەرموودەناسان و خاوەن کتێبەکانی فەرمووده وەکو بوخاری و موسلیم و ئەوانی تر و سـەدان و هەزارانـی تـر لە سـەروەران و پێشـەوایانی ئـوممەت، کە دینیـان لـێ وەردەگیرێت ئەوانە هەموویان لە پێش سەردەمی ئەشعەری ژیاون.

٣ -عەقیدەی ئەشاعیرەو فیرقەکانی تریش بەهەمان شێوە، لەسـەر بنەمـای علـم الکـلام و فەلسـەفە و مشـتومڕ وجەدەلـی دووردورودرێـژو قـوڵ و وشـك و بـێ تـام دامەزراوە، ئەوان لە باسەکانی عەقیدەدا، باسی (جوهر و عرض و القانون الکلي و الکلام النفسي) و دەیان زاراوەی سەیروسەمەرەو نامۆ بە کیتـاب و سـوننەت بـاس دەکەن، کوا خەلکی عەوام کە زۆرینەی خەڵکن، لە هیچ سـەردەمێکدا لەو عەقیـدە قورسەی ئەشاعیرە تێگەیشتوون تاکو بوترێت زۆرینە ئەشعەری بوونە؟! بەڵکـو ئەوە تەنها تاقمێك بوونە لە زانایـان و شـارەزایان لە علـم الکـلام و زاراوەی فەلاسـیفەو ویستوویانە عەقیـدەی ئیسـلامیش وەکـو بـوونی پەروەردگـار و پرسـەکانی تـر بەو ڕێگـانە بسـەلمێنن، کە ئەگەرچـی ئەوان مەبەسـتیان خزمەتـی ئیسـلام وزانسـتیش

بووبێت، بەڵام ڕێگەی ڕاستیان لێ ون بووەو گوایە لە ڕێگەی فەلسەفەو مەنتیق وعلم الكلام بە حەق وئیمانی تەواو بگەن!

ئەگەر بەڵگەشت دەوێت لەسەر نامۆیی ئەو قسەوباس و زاراوانەی بەکاری دەهێنن، ئەتوانیت کتێبەکانی سەرانی ئەشاعیرە بخوێنیتەوە، بزانە چەند وشك و قورسە تێگەیشتنیان؟ هەر بۆ نموونە دەتوانن تەماشایەکی ئەم کتێبانە بکەن بزانە تیگەیشتنیان ئاسانە یان لەئەوپەری وشکی و قورسیدایە چونکە پڕە لە بۆچوون و زاراوەی فەلسەفەو علم الكلام: (أساس التقديس، اصول الدين ، مشكل الحديث وبيانه ، الإرشاد إلى قواطع الأدلة في أصول الاعتقاد ، الإنصاف، الاقتصاد في الإعتقاد، الخريدة، الجوهرة، المواقف ، لمع الاعتقاد، نهاية الإقدام....).

٤ -هەر بە بۆنەی ئەو عەقیدە قورس و نامۆیە کە پێچەوانەی عەقیدە سووك و ئاسان و گونجاو لەگەڵ فیترەتەکەی قورئان وسونەتەدا، کە مەحاڵە خەڵکی عەوام وزۆرینەی زۆری خەڵکی لە هیچ سەردەمێکدا لێی تێگەن، سەرانی ئەشاعیرە خۆیان ناکۆکی لە نێوانیاندا درووست بوو، ئایا ئەو خەڵکە عەوامەی کە لەو عەقیدەی ئەشاعیرە ناتوانن تێبگەن، ئیماندارن سەرەڕای ئەو جەهلەیان، یان بەو جەهلە بێ ئیمان دەبن؟ هەر بۆ نموونە:

-تقي الدين المُقتَرَح کە لە ساڵی ٦١٢ی کۆچی وەفاتی کردووە لە «شرح الإرشاد» (١٤٢/١). هەورەها ابن عرفة کە لەساڵی ٨٠٣ی کۆچی وەفاتی کردووە لە «المختصر الكلامي» لاپەڕە(١١١) و لە زۆر لە کتێبەکانی تری ئەشاعیرە باس لە

خـیلاف کـراوه ئایـا عەوام ئیمانـدارن یـان نـا، یەکێکـیش لە قەولەکـان لە خەڵکـی عەوامدا ئەوەیە کافر دەبن.

لە لای متأخرین ی ئەشاعیرەش بەهەمان شێوە سەبارەت بە عەوامی خەڵکی کە لەو عەقیـدە قورسـە تێنـاگەن خـیلافەکە باسـکراوە و یەکێـك لە ئەگەرەکـان کـافر بوونیـانە، وەکـو عـلي بـن خلیفـة کە لە سـاڵی ١١٧٢ی کـۆچی وەفـاتی کـردووە لە هۆنراوەی (الریاض الخلیفیة)دا دەڵێت:

إذ حرفَة التقليد لا يرضى بها ...... ذو هِمَّةٍ فاسلُك سبيلَ أمانِ

فيه اختلافٌ بينهم في حكمِه ...... بالكُفر والإيمان والعصيانِ

٥ -کەواتە سـەوادی خەڵـك و زۆریـنەی ڕەهـای عەوام، لە هـیچ سـەردەمێکدا لەسەر عەقیدەی ئەشـاعیرە نەبـوونە، چـونکە نەیـانتوانیوەو ئێسـتەش نـاتوانن لەو عەقیدە تێبگەن، ئیتر چۆن دەکرێت پێیان بوترێـت ئەشـعەری؟ لەبەرانبەریشـدا بـێ گومان زۆرینەیان لەسەر عەقیدە ئاسـان وخـاوێنەکەی ئەهلـی سـوننەت وسـەلەف بوونە، کە هەموو کەسێك بەبێ هیچ گرانییەک لێی تێدەگات، چونکە نە فەلسـەفە و نە قوڵبـوونەوە و ڕۆچـوون لە زاراوەکـانی علـم الكـلام و نە هـیچ بەربەسـت و ئاستەنگێک لەو بارەوە لەبەردەم تێگەیشتنیاندا نەبووە، ئێستەش بەهەمـان شـێوەیە، خەڵکـی عەوام و سـەوادی هەرەگەورەی ئەوان لە عەقیـدەی ئەهلـی سـوننەت دەتوانن تێبگەن، نەك لە عەقیدەی فیرقەکان، کە بـۆ ئەوەی بـوونی اللـه بسـەلمێنن، خەریکە مرۆڤ بێ ئیمان ئەکەن و سەری لێ دەشـێوێنن بەباسـی جەوهەر و عەرەزو و قسەی فەلسەفی دوورودرێژ و ناخۆش..

٦ -ئینجا ئەوەی کە دەوترێت فلانە وڵات، یان شارو شوێنێکی دیاری کراو کە زۆرینەی ئەشعەری بوونە، ئەوەش هەر وا نییە، چونکە ئەوە تەنها مەبەست لە کۆمەڵە زانایەکی ئەشعەری بووە کە ناودار بوونە و خەریکی ئەو باسانە بوونە، نەك هەموو خەڵکی ئەو دەڤەرە خەریکی ئەو باس و خواسانەی ئەشاعیرە بووبن! چونکە ئەسڵەن هەر لێی تێنەگەیشتوون تاکو خۆیان بکەن بە خاوەنی و ئینتیسابی بۆ بکەن.

٧ -بەڵکو لە ڕووی مێژوویی و بەبەڵگەی زانستی حاشا هەلنەگرەوە، زۆرینە هیچ سەردەمێك ئەشاعیرە نەبوونە، ئەم حەقیقەتەش لەناو کتێبی چەندین لە سەران و زانایانی بەناوبانگی خودی ئەشاعیرەدا هاتووە، بۆ نموونە:

-ابن عساکر، کە گومان نییە لەوەی یەکێکە لە زانایانی ئەشاعیرە و لە ساڵی ٥٧١ی کۆچی وەفاتی کردوە، لە کتێبی (تبيين كذب المفتري فيما نسب إلى الإمام أبي الحسن الأشعري) لە لاپەڕە (٣٣١)دا دەڵێت: ئەوەی کە بوترێت زۆرینەی خەڵکی لە هەموو سەردەمەکاندا و زۆربەی خەڵکی عەوام لە هەموو شارو وشوێنەکاندا ئەشعەری نین و تەقلیدی ئەشعەری ناکەن و مەزهەبەکەی پەسەند ناکەن و باوەڕیان پێی نییە،کە ئەوانە زۆرینەو سەوادی ئەعزەمن، لە وەڵامدا دەڵێین بە زۆرینە نییە و ئەوانە تێنەگەیشتوون و جاهیلن کە ئەشعەری نین!!...ئەمە وتەی ابن عساکر ە لە کتێبەکەیدا وبەڕوونی باس لەوە دەکات غەیری ئەشاعیرە زۆرینەن و ەشاعیرە کەمینەن، هەر بۆیە دانەری کتێبی (جمع الجيوش والدساكر على ابن عساكر) لە لاپەڕە ٢٨٣دا دەڵێت: ئەو قسەی ابن عساکر سەلمێنەری ئەوەیە کە

وتمان سەبارەت بەوەی لە سەردەمی ئەوو پێش ئەو سەردەمەش غەیری ئەشاعیرە زۆرتر بوونە وئەوان بایەخیان نەبووە، ئینجا ناوی چوار سەد زاناو فەرموودەناس وپێشەوا دەخاتەڕوو ،کە هەموویان نەیاری ئەشاعیرە بوونە وزەمی ئەوانیان کردووە.

-بەڵگەیەکی تریش لە کتێبی زانایەکی مەشهورو بەناوبانگی ئەشاعیرە کە ئەویش (ابو حامد الغزالي) یە کە لە ساڵی ٥٠٥ی کۆچی وەفاتی کردووە، لە کتێبی (إلجام العوام عن علم الكلام)دا دەڵێت: (وأما إثبات موجود في الاعتقاد على ما ذكرناه من المبالغة في التنزيه شديد جداً بل لا يقبله واحد من الألف لا سيما الأمة الأمية) وەکو دەردەکەوێت غەزالی دەڵێت بەشێك لە عەقیدەی ئەشاعیرە لە هەزار یەك کەس قبوڵی ناکات بەتایبەتی خەڵکی ئوممی و نەخوێنەوار، بێگومان لەبەر ئەوە تێناگەن چونکە عەقیدەیەکی قورسە و لەگەڵ فیترەتی مرۆڤەکاندا ناجۆرە.

-هەروەها العز بن عبدالسلام دان بەهەمان حەقیقەتدا دەنێت و لە کتێبی قواعد الأحكام ( ٢٠٢/١ )دا دەڵێت: (فإن اعتقاد موجود ليس بمتحرك ولا ساكن ولا منفصل عن العالم ولا متصل به ،ولا داخل فيه ولا خارج عنه لا يهتدي إليه أحد بأصل الخلقة في العادة ،ولا يهتدي إليه أحد إلا بعد الوقوف على أدلة صعبة المدرك عسرة الفهم) واتە باوەڕهێنان بە مەوجودێك (مەبەستیان الله یە) کە نە جوڵاوەو نە وەستاوە و نە لە جیهان دابڕاوەو نە پەیوەستە پێوەی، نە لەناو جیهاندایە و نە لە دەرەوەی، دەڵێت ئەمە هەموو کەسێك ناتوانێت لێی تێبگات، مەگەر دوای تێکەیشتنی نەبێت لە کۆمەڵە بەڵگەیەکی قورس و ئەستەم بۆ تێگەیشتن. بەدوایدا دانپێدانێکی ڕوونتر دەکات و دەڵێت: ( لأن الشرع إنما عفا

عن المجسمة لغلبة التجسم على الناس) دەڵێت زۆربەی خەڵکی موجەسیمەن، واتە زۆر لە ئەشعەرییەتەوە دوورن و ناتوانن لە عەقیدە ئـاڵۆزەکەی ئەشـاعیرە تێـبگەن، بۆیە شەرع لێیان خۆش دەبێت.

٨- ئەگەریش بڵێین لە هەندێ قۆناغی مێژوویدا زۆرینە بوونە، یان ئێستا زۆرن، هۆکاری ئەوە زۆرییەش پەیوەندی بە ڕاست و درووستی عەقیـدەکەوە نیـیە، بەڵکـو هۆکاری تری لە پشتە، لەوانە:

-لە پاش هەرەس هێنانی فیکری موعتەزیلەکان، ئیتر ئەشاعیرە لەسەر زەمیـنەی واقیعــدا و لەســەر حیســابی ئەوان بڵاوەیــان کــرد و هەر لەو سەروبەندەشــدا ولەبەرانبەر نەیارەکانیان و بەتایبەتی موعتەزیلە خۆیانیان وەکـو ئەهلـی سـوننەت و جەماعەت ناساند.

- لەو ســەردەمانەی کە دەســەڵاتیان بەدەســتەوە بــووە، کە تــاکو ئێســتاش کاریگەرییان لە دەسـەڵاتدا هەر هەیە، زۆر دەمـارگیرانە و بـێ ڕەحـمانە مامەڵەیـان لەگەڵ نەیارەکانیاندا کردووە، هەرچی قوتابخانە و ئیش و کاری فەرمی و پلەوپـایە هەیە بۆ خۆیان و ئەوانەی لایەنگری خۆیانن قۆرخیان کردبـوو، چـاکترین نمـونەو بەڵگەش لەسەر ئەوە، شيخ الإسلام ابن تيمية بوو، لە بەرگی یەکەمی کتێبەکەی ابن حجر العسقلاني (الدرر الكامنة في أعيان المائة الثامنة) بە ڕوونی باس لەو ستەم و زۆرە دەکات کە ابن تيمية بە هۆی فتواو کتێبەکانی لەسەر دەستی ئەشاعیرە تووشی بووە کە بەو هۆیەوە زۆربەی ژیانی لە زیندانەکانی ئەشاعیرەدا بەسەر بردووە. بـۆیە

ئەوان لە ڕێگەی تەرغیب و تەرهیبەوە توانیان نەیارانی خۆیان بترسێنن و خەڵكیش -كورد واتەنی - خۆشیان بێت و ترشیان بێت.بیانكەن بە شوێنكەوتووی خۆیان.

چەند پرسیارێك لە ئەشاعیره!

زانایانی ئەهلی سوننەت لە كۆن و لە هاوچەرخەكاندا، هەندێك پرسیاریان لە ئەشاعیره كردووە بۆ ئەوەی بە هەمان چەكەكەی خۆیان ڕووبەڕوویان ببنەوە و بەو پرسیارانە ڕایان بوەستێنن، من چەند پرسیارێكی ئاسان و ڕوون لەو پرسیارانە هەڵدەبژێرم و ئاراستەی ئەشاعیرەی سەردەمی خۆمانی دەكەم:

١ .ئێوە دەڵێن زاهیری وشەی (استوی) نەشیاوە بۆ الله عزوجل بەكاربێت و دەڵێن پێویستە وشەكە لەسەر ئەو مەعنا لابدەین و بیگۆڕین و تەئویلی بكەین بۆ (استولی)، یان (جاء ربك) دەكەن بە (جاء أمر ربك) یان (ید الله) دەكەن بە (قدرة الله) وضحك و غضب و محبة و زۆربەی سیفاتە خەبەرییەكان و زاهیری زۆر ئایەتی تریشتان بەبەهانەی ئەوەی كە نەشیاوە بۆ زاتی الله بەكار بێت، تأویل تان كردووەو لە زاهیرو ڕواڵەتی ئایەتەكە دوورتان خستووەتەوە، یەعنی بۆ نموونە پێغەمبەر صلی الله علیە و سلم فەرموویەتی(یعجب ربنا ) یضحك ربنا) ئێوە بەزمانی حاڵ دەڵێن شتی وانییە و مەبەستی ئەو وشانە نییە و مەبەستی واتای ترە، بەڵكو لە ئایەتەكاندا الله تعالی ید و وجە و چەندین سیفەتی تری بە ڕاشكاوی بە زمانێكی عەرەبی پاك و پاراو بۆ خۆی جێگیر كردووە، ئێوە دەڵێن مەبەست لەو وشانە نییە كە لەو ئایەت و فەرموودانەدا هاتوون، پرسیارەكە ئەوەیە:

ئایا الله تعالی بۆچی ئایەتەکە بە شێوەیەك دادەبەزێنیت و مەبەستی پێی شتێکی ترە؟ ئەی بۆچی الله تعالی ڕاستەوخۆ مەبەستەکەی خۆی لە ئایەتەکەدا بەیان نەکردووە، بۆ نموونە لەجیاتی ئەوەی ئێمە بڵێین (استوی) مەعنای (استولی)یە و ئەو ناکۆکییە بکەوێتە ناو ئوممەتی ئیسلام لەسەر ئەوە، بۆچی الله تعالی خۆی ڕاستەوخۆ نەیفەرموو الرحمن علی العرش استولی! و جاء امر ربک؟، لە کاتیکدا خۆی فەرموویەتی قورئانی بە زمانێکی پاراوو ئاسان دابەزاندووە هەموان لێی تێدەگەن: (بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ)؟

٢ .بۆچی وارد نەبووە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه و سلم ڕۆژێك لە ڕۆژان بۆ نموونە بە هاوەڵەکانی فەرموبێت، (ید) مەعنای دەست نییە و مەعنای قودرەتە؟ یان استوی مەعنای ئەوە نییە الله بەزاتی خۆی لەسەر عەرشە بەڵکو ئەوە مەعنای دەسەڵاتی الله یە بەسەر عەشدا و...بۆچی هەرگیز ئاماژەی بەوە نەکردووە سیفەتە خەربەرییەکانی الله تعالی هیچیان مەبەست پێیان ڕواڵەتەکانیان نییە و بەڵکو مەبەست پێیان واتای ترە، بۆچی نەیفەرمووە ئەوەی ئێوە وادەزانن کەلامە بە پیت و بە دەمگ نەخێر ئەوە کەلامی نەفسییە و لەناو دەروونی الله دا بوونی هەیە، هتد لە کاتیکدا پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم هەموو شتێکی بۆ هاوەڵان و بۆ ئوممەتەکەی ڕوون دەکردەوە تەنانەت ئادایی چوونە سەر ئاویش؟ ئایا چۆن مەسەلەیەکی وا گەورەو گران وهەستیار ڕوون ناکاتەوە، ئینجا هەموو خاوەن عیلمێك دەزانێت (تأخیر البیان عن وقت الحاجة لا یجوز). لە کاتێکدا نەزانراوە

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕوونکردنەوەی لەو شێوەی بۆ هاوەڵە بەڕێزەکان دابێت.

٣ .پرسیارێکی تریش ئایا بۆچی عەرەب کە بەدوای بچووکترین رەخنە دەگەڕان لەسەر قورئان تۆماری بکەن، ئەم جیاوازییە لە دەربڕین و مەبەستدا کە ئێوە بەزمانی حاڵتان دەڵێن لە قورئاندا هەیە، باسی دەکەن بۆچی ئەوان دەرکیان پێ نەکرد و نەیان کرد بە بیانوویەك ڕەخنەی لە قورئان پێ بگرن؟ بۆچی نەیانوت ئەگەر قورئان بە زمانێکی عەرەبی پاك و پاراوو موبین دابەزیوە بۆچی ئەو ئایەتانە واتاکانیان ناڕوونن؟

٤ .ئەی هاوەڵان الله لێیان ڕازی بێت، بۆچی لە وتووێژە زانستییەکانیاندا ڕۆژێک ئەم عەقیدەو بیروباوەڕانەی ئەشاعیرەیان لە سیفات وبابەتەکانی تردا بەدمدا نەهاتووە ودین وئیمانیان بەبێ فەلسەفەو بێ سەفسەتەو تأویل و گۆڕینی دەقەکانی قورئان وسوننەت خستووەتەڕوو.

٥ .ئێوە کە خۆتان دەدەنە پاڵ ابوالحسن الاشعري ودەڵێن ئێمە لە عەقیدەدا ئەشعەرین، بۆچی موخالەفەی عەقیدەکەی دەکەن وبەقسەی ناکەن، ئەو إثبات ی علو وبەرزی الله تعالی لەسەر عەرشی دەکات وسیفاتەکان تەئویل ناکات وبەشێوەیەکی گشتی لەسەر عەقیدەی سەلەفە؟ وەکو لە کتێبی (الإبانة في أصول الديانة) کە کۆتا کتێبێتی لە ژیانیدا ڕوونی کردووەتەوە، بۆچی لە زۆربەی عەقیدەکەی ئەشعەری لاتانداوەو چوونەتە سەر تێگەیشتنی فخرالدين الرازي وئەوانی تر و لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەڵێن ئێمە ئەشعەرین؟

٦ .لەو هەموو سیفەتانەی الله تعالى کە لە قورئانـدا بە ڕاشـکاوی هـاتووەو ولە سوونەتدا جێگیر بووە، بۆچی تەنها باوەڕتـان بە حەوت سـیفەتی هەیە وەکـو خـۆی وئەوانی تر تەئویل دەکەن ولەواتـا زاهیرییەکـانی خـۆی دووری دەخەنەوە، بـۆچی وەکو چۆن ئەو حەوتەتان جێگیر کـرد وباوەڕتـان پێیەتـی، باوەڕتـان بەوانـی تـریش وەکو خۆی نییە؟

کۆتایی ئەم پرسـیارانەش بە پرسـیارێکی تـر دەهێـنم کە ئاراسـتەی شـارەزایانی ئەشاعیرەی دەکەم و ئەویش ئەوەیە:

بـۆچی کە خۆتـان بە ئەهلـی سـوننەت دەناسـێنن نـاڵێن ئەهلـی سـوننەت و جەماعەت و تەواو؟ بۆچی دەبێت بڵێن ئەهلی سوننەت و جەماعەتی ئەشاعیرە؟ ئەو پاشـکۆیەی بـۆچییە و ئایـا لەبەر ئەوەیە ئەگەر ئەشـاعیرەکەی بـۆ زیـاد نەکەن ڕاسـتەوخۆ بەرانـبەر بەوە تێـدەگات ئەهلـی سـوننەت مەبەسـت لەسـەلەف و شوێنکەوتووانی عەقیدەی سەلەفە؟ یان حیکمەتێکی تری تێدایە؟

# ئایا ئەشاعیرە ئەهلی سوننەتن؟

ئەشاعیرە دەڵێن ئێمە ئەهلی سوننەتین، فیرقەکانی تریش وەکو ماتوریدیەش بە هەمان شێوە هەر وا دەڵێن، لە ڕاستیدا پێش ئەوان موعتەزیلەش هەر هەمان ئەو بانگەشەیان دەکرد ودەیانوت ئێمە ئەهلی سوننەت و جەماعەتین، بەڵام هەموو بانگەشەیەك پێویستی بەبەڵگە هەیە و بەقسە وئیددیعاکردن نابێت.

١ -ئایا ئەشاعیرە ئەهلی سوننەتن یان نا؟ وەڵامەکەی لە دوو ڕوانگەوە دەبێت، لەلایەکەوە بەلێ ئەهلی سوننەتن، لەلایەکی ترەوە نەخێر ئەهلی سوننەت نین و فیرقەیەکن لە فیرقە لادەرە ئیسلامییەکان، بەڵام چۆن؟ بە ئیعتیباری یەکەم ئەگەر لە بەرانبەر شیعەدا حیساب بکرێن، لەو حاڵەتەدا نەك ئەشاعیرە بەڵكو ماتوریدییەو موعتەزیلەش هەر ئەهلی سوننەتن، چونکە هەموویان دان بە خیلافەتی هەر سێ خەلیفەکەدا دەنێن.

بەڵام کاتێك مەنهەجەکەیان لە عەقیدەدا بە مەنهەجی سەلەف بەراورد بکەین و لە ڕۆشنایی دەقەکانی قورئان و سوننەتدا بە تێگەیشتنی سەلەف لێکی بدەینەوە، نەخێر ئەهلی سوننەت نین و جیاوازی جەوهەری و بنچینەییان لە پرسەکانی عەقیدەدا هەیە لەگەڵیاندا، لە جیاوازییە سەرەکییەکانیان لەگەڵ ئەهلی سوننەتدا:

*پێشخستنی عەقڵ لەسەر نەقڵ و ئەمەمان پێشتر باس کردووە.

*نکۆڵی کردنیان لە هەندێ سیفەتەکانی اللە تعالی وەکو استواء و نزول و مجیء و غضب ورضا و زۆر شتی تر.

*جگە لە ئەم سیفەتانە: (الحیاة والعلم والقدرة والإرادة والسمع والبصر والکلام النفسي) سیفەتەکانی تری الله تعالی تەئویل دەکەن و لە واتای ڕواڵەتی قورئان دوور دەخەنەوە.

*ئیمان لەلای ئەشاعیرە باوەڕهێنان و تەسدیقی دڵە، بەمەش لەگەڵ ئەهلی سوننەت جیا دەبنەوە کە کردەوە لە ناو ئیماندا دادەنێن.

*هەروەها مەسەلەی وەرنەگرتنی فەرموودەی ئاحاد لە عەقیدەدا ئەگەر لە بوخاری و موسلیمیشدا بێت و بنچینەی جیاوازی تریشیان هەیە لەگەڵ ئەهلی سوننەتدا.

٢ -تەنانەت خۆیشیان هەست بەوە دەکەن و کاتێك بەخۆیان دەڵێن ئەهلی سوننەت، زاراوەی ئەشعەری بۆ زیاد دەکەن، چونکە ئەگەر وا نەکەن بەرانبەر وا تێدەگات مەبەست لە ئەهلی سوننەت، ئەهلی حدیث و ئەهلی سوننەتە لە پێشینانی چاکی ئەم ئومەتە لەسەر ڕێبازو تیگەیشتنی سێ سەدە چاکەکان.

٣ -لە ئەلفوبێی عەقیدەی ئەهلی سوننەت کە دەبێت هەموو موسوڵمانێك بیزانێت ئەوەیە، لە مەسەلەی ناوو سیفەتە بەرزەکانی اللە عزوجل دا، پێویستە هەمووی وەکو خۆی بە بێ گۆڕین و تەئویل کردن و پەککخستنی واتاکانیان جێگیر بکرێن و نابێت بۆ واتای تر لە زاهیرەکەی دور بخرێنەوە، هەروەها باوەڕ هێنان بە کەلامی الله کە کەلامە لەسەر حەقیقەت بەو شێوەی کە شایستەو شایانە بە اللە تعالی و زۆر مەسەلەی تریش لە بواری قەدەر و لایەنی تری ئەو بیروباوەڕە، کە لە ڕاستیدا نە ئەشاعیرەو نە غەیری ئەوانیش لە فیرقەکانی تری وەکو موعتەزیلەو ماتوردییەو

مورجیئە پێوەی پابەند نین، ئیتر بانگەشە کردنی ئەهلی سوننەت لەلایەن ئەوانەوە بانگەشەیەکی بێ بەڵگەیە و ئیددیعایەکە پێویستی بە سەلماندنە.

٤ -بەڵێ ڕاستە ئەشاعیرە هەرچەند لە زۆرێك لە بوارەکانی عەقیدەدا لەگەڵ ئەهلی سوننەت و عەقیدەی سەلەفدا جیاوازییان هەیە، بەڵام هاوکات لە کۆمەڵێك مەسەلەی تریشدا موافەقەی ئەهلی سوننەتیان کردووەو هەمان تێگەیشتن و بۆچوونیان هەیە، بۆ نموونە هەڵوێستیان لە هاوەڵان الله لێیان ڕازی بێت، بەڵام ئایا عەقیدە بەو شێوە دەبێت بەشێکی وەربگیرێت و بەشێکی بە عەقڵ و بۆچوونی فەیلەسوفەکان ڕەتبکرێتەوە و تەئویل بکرێت؟ بێگومان نەخێر ، تێکەڵکردن لە مەسەلەی عەقیدەدا کارێکی خراپ وناپەسەندە و نیشانەی نەپێکانی حەق و نەدۆزینەوەی مەنهەج و ڕێبازی ڕاستە.

٥ - هەندێك لە زانایانی ئەهلی سوننەت دەڵێن، ئەشاعیرە لەوەندەی کە لەسەر مەزهەبی ئەهلی سوننەتن وحەقیان پێکاوە، بەشێوەیەك لە شێوەکان پێیان دەوترێت ئەهلی سوننەت، لەو بوارانەش کە لە عەقیدەی ئەهلی سوننەت لایانداوە لەوەدا پێیان دەوترێت ئەهلی بیدەع و فیرقەیەکن لە فیرقە لادەرەکان کە لە مەنهەج لایانداوەو ڕێگەی ڕاستیان ون کردووە. شیخ الاسلام ابن تیمة - رحمه الله ، دەفەرموێت: (فلفظ السنة يراد به من أثبت الخلفاء الثلاثة ، فيدخل في ذلك جميع الطوائف إلاّ الرافضة ... )منهاج السنة ٢/ ٢٢١. واتە وشەی سوننەت لە ڕوویەکی گشتییەوە مەبەست پێی هەمو ئەوانەیە کە خیلافەتی أبوبکر و عمر و عثمان الله لێیان ڕازی بێت جێگیر دەکەن و بەو شێوەش هەموو تاقم و تائیفەکان دەگرێتەوە

ڕافیزە نەبێت. بەڵام لە ڕاستیدا مەسەلەی عەقیدە نابێت بەو جۆرە شل بکرێتەوە و لە بەشێکیدا لەسەر حەق بیت و لە بەشێکی تریدا لە حەق لابدەیت، خاڵی جیاوازی ئەشاعیرە لەگەڵ ئەهلی سوننەتدا لە خاڵی هاوبەش زۆرترن وجگە لەوەش لە بوارێکی هەستیاردایە کە ناکرێت سازشی لەسەر بکرێت، اللە تعالی لە چەدین ئایەتدا لە قورئانی پیرۆزدا(إتیان و مجیء وخۆشەویستی و تورەبوون و استواء ونداء و چەندین سیفەتی بۆ خۆی جێگیر کردووە، ئەشاعیرە دەڵێن شتی وا نییە هیچ لەو وشانە نابێت بەڕواڵەتەکەی لێکبدرێتەوە بەڵکو دەبێت ئەو واتایانە دوور بخەینەوەو واتای تریان بۆ دیاری بکرێت، اللە تعالی لە چەندین ئایەتدا فەرموویەتی ئەو لە ئاسمانە، ئەشاعیرە دەڵێن نەخێر اللە لە ئاسمان نییە و جێگای نییە، اللە تعالی (ید و وجە)ی بۆ خۆی جێگیر کردووە لە قورئاندا ئەشاعیرە دەڵێن نەخێر نە ید و نە وجە ی نییە، پیغەمبەر صلی اللە علیە و سلم لە چەندین فەرموودەدا (ضحك و نزول وعجب)بۆ اللە باس کردووە، ئەشاعیرە دەڵێن نەخێر اللە ئەو سیفەتانەی نییە! ئەمانەش هەمووی گومراییە و ڕێگرە لەوەی تاقمێك ئەمە تێگەیشتنیان بێت و دەیان کارەساتی تری وایان هەبێت هێشتا هەر پێیان بوترێت ئەهلی سوننەت.

٦ -بەڵام کێشەیەکی تر دەمێنیت کە ئەهلی عیلم و زانایانی ئەهلی سوننەت باسیان کردووە، ئەویش ئەوەیە: ئایا ئەوە ڕاستە ئەهلی سوننەت بکرێن بە دووبەشەوە؟ بەشێکیان شوێنکەوتووی سەلەف بن و ئەهلی سوننەتی تەواو، بەشێکیشیان بوترێت، ئەمانە ئەشاعیرەن و ئەوانیش هەر ئەهلی سوننەتن، بەڵام

کۆمەڵێك لادان و بیدعەی عەقیدیشیان هەیە وکو تەئویلی سیفات و نکۆڵی کردن لە زۆرێکیان و زاڵکردنی عەقڵ بەسەر نەقڵ لە کاتی تەرجیحدا و وەرنەگرتنی فەرموودەی ئاحاد لە عەقیدەدا و هەروەها لە پێناسەی قورئان و قەدەر و چەندین مەسەلەی تردا جیاواز بن و هەر ئەهلی سوننەتیش بن، وەڵامی ڕاستیش ئەوەیە مەگەر بەو ئیعتیبارەی یەکەم لەبەرانبەر شیعەدا وایان پێ بوترێت، بەهۆی زۆری جیاوازی لە نێوانیاندا بەراورد بەهەڵوێستیان لە عەقیدەی ئەهلی سوننەت، ئەگینا بەڕەهایی دەبێت هەر بوترێت فیرقەیەکن، بەڵام لە فیرقەکانی تر لە ئەهلی سوننەتەوە نزیکتر ن، کە ئەوەش بەداخەوە هیچ سوودێکی بۆ ئەوان نییە، بەڵام ئەوە تەنها لە ڕووی بەراوردەوە لەگەڵ موعتەزیلە و جەهمییە پەتییەکان و شیعە و هەندێ فیرقەی تر، ئەگینا بەراورد بە ئەهلی سوننەتی ڕاستەقینە و بەراورد بە عەقیدەی ئەهلی سوننەتی وەرگیراو لە دوو سەرچاوە سازگارەکەی کیتاب و سوننەت بە تێگەیشتنی سەلەف نەخێر وا نییە.

٧ - هاوەڵان الله لێیان ڕازی بێت تاکو سەردەمی عەلی الله لێی ڕازی بێت هیچ ناکۆکییەکیان تێدا نەبوو، لەو سەردەمەوە ئیتر خەواریج و ئینجا شیعە سەریان هەڵدا و دوای ئەوان کۆمەڵێك نکۆڵییان لە قەدەر کرد بە القدرية ناو بران و دوای ئەوان (الجعد بن درهم ) نکۆڵی لە سیفاتەکانی الله کرد و لەسەر دەستی (خالد القسري) کوژرا و لە دوای ئەو (جهم بن صفوان) ی قوتابی الجعد سەری هەڵدا و بوو بە خاوەنی بیرۆکەی نکۆڵی کردن لە سیفات و خاوەنداریێتی بۆ هەندێ عەقیدەی گومڕای نامۆی تر بە عەقیدەی ئەهلی سوننەت، دواتر موعتەزیلە

سەریان هەڵدا و لە هەموو ئەو ڕێبازە گومڕایانەیان وەرگرت وبوون بە کۆکەرەوەی گومڕاییەکان، لە دوای ئەوان (أبو الحسن الأشعري) ناوی دەرکرد و پاش ئەوەی ساڵانێك لەسەر عەقیدەی موعتەزیلە بوو، تەوبەی کرد و گەڕایەوە سەر مەزهەبی ئەهلی سوننەت، بەڵام نەك بەتەواوی و هەندێ لادان لە عەقیەکەیدا هەر مایەوە و تەنانەت لە کتێبی (الإبانة) کە کۆتا کتێبە نووسیوێتی تا ئێستەش هەر تێیدا ماوەتەوە.

دواتر ئەشاعیرە لە دوای ئەشعەری بەردەوامییان هەبوو، بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی سەردەم و سەدەکاندا لە عەقیدەی ئەشعەری کە عەقیدەیەکی زۆر نزیك بوو لە عەقیدەی سەلەفەوە، دوورتر دەکەوتنەوەو زیاتر مەزهەبەکەیان بوو بە ڕەنگدانەوە بۆ مەزهەب و تێگەیشتن و بۆچوونەکانی الفخر الرازي و ابن فورك و متأخرين ی ئەشاعیرە کە مەودای نێوانیان لەگەڵ ئەبو حەسەنی ئەشعەریدا هەر زۆر دوور و فراوان بوویەوە بە ئێستاشەوە، بەڵکو نەك هەر لە عەقیدەی ئەهلی سوننەت دوور کەوتوونەتەوە، بەڵکو لە عەقیدەی أبو الحسن الأشعري ش زۆر دوور کەوتوونەتەوە.

٨- لەم بارەوە مەسەلەیەکی زۆر گرنگ هەیە ئەویش ئەوەیە، ئەشاعیرە هەموویان یەك چین و جۆر و بیرکردنەوە نین، بەڵکو جیاوازییان لە نێوان خۆیشیاندا زۆرە، ئەگەرچی کامیان لەوانی تر باشترن لە عەقیدەی ئەهلی سوننەتەوە هەر زۆر نزیك نین و جیاوازییان جیاوازییەکی گەورەو جەوهەریە، بەڵام دوا جار ئەوە واقیعە و جۆرەکانیان جیاوازن.

٩ - هەندێك لە زانا گەورەكان بۆ نموونە النووي و ابن حجر العسقلاني والبيهقي وابن الجوزي و زانای تر، لە هەندێك هەڵە و لادانەكانی ئەشاعیرەدا وەكو تەئویل كردن موافەقەی ئەشاعیرەیان كردووەو هاوبۆچوون بوونە لە گەڵیاندا، ئەوانە لەبەر ئەو هاوبۆچوونیە ناكرێت هەمان حیسابی ئەوانیان بۆ بكرێت كە بە كۆمەڵێك بنەمای جۆراوجۆر لە عەقیدەی ئەهلی سوننەت جیابوونەتەوە، چونكە لەیەك بنەما لە بنەماكانی ئەشاعیرەدا هاوبۆچوون بوونە و لە بۆچوون و عەقیدكانی تریاندا ناكۆك بوونە لە گەڵیاندا و هەمان عەقیدەی ئەهلی سوننەتیان هەبووە، بۆیە ئەوانە ئەگەرچی لەسەر خۆیانیان حیساب دەكەن، بەڵام لە ڕاستیدا خاڵی جیاوازییان لەگەڵ ئەشاعیرەدا زۆرترە تاكو خاڵی هاوبەش وتەبایی.

١٠- ئەشاعیرە زۆر جار بە خۆیان ئیعتیراف دەكەن كە لەگەڵ ئەهلی سوننەت جیاوازن و كار بە تێگەیشتنی سەلەف بۆ أسماء و صفات و پرسەكانی عەقیدە ناكەن، یەكێك لە بنچینە مەشهورەكانیان لە عەقیدەدا ئەم بنچینەیە: "مذهب السلف أسلم، ومذهب الخلف أعلم وأحكم" واتە مەزهەبی سەلەف سەلامەتترە، بەلام مەزهەبی خەلەف واتە پاشینان و ئەشاعیرە زانستیتر و تۆكمەترە! واتە مەزهەبی ڕازی و ابن فورك و الغزالي و الشهرستانی لە مەزهەبی أحمد بن حنبل و سفیان الثوري و سەرانی سەلەف زانستیتر و تۆكمەترە!

١١- بەهۆی ئەوەی كە زۆرێك لە زانایانی ئەشاعیرە ناڕاستی ڕێبازی خۆیان لە مەسائیلی عەقیدەدا بۆ دەركەوت و لە گوماندا دژیان، بۆیە لە كۆتایی ژیانیاندا لە ڕێبازەكەی خۆیان لە علم الكلام و تێكەڵ كردنی فەلسەفە بە عەقیدە پەشیمان

دەبووونەوە، عبد الرحمن المعلمي لە کتێبی (القائد إلى العقائد) باسی پاشگەزبوونەوەی الجويني والغزالي و الفخر الرازي و پێش ئەوانیش ابو الحسن الأشعري دەکات و دەڵێت: (قد أبلغ الله تبارك وتعالى في إقامة الحجة على اختلال النظر المتعمق في الإلهيات بأن يسر لبعض أكابر النظار المشهورين بالاستقلال أن يرجعوا قبيل موتهم إلى تمني الحال التي عليها عامة المسلمين ، فمنهم الشيخ أبو الحسن الأشعري، وأبو المعالي ابن الجويني الملقب إمام الحرمين، وتلميذه الغزالي، والفخر الرازي ...) جوێنی لە نەخۆشی سەرەمەرگدا دەیوت شایەت بن گەڕاومەتەوە سەر عەقیدەی سەلەف و خۆزگەی بە دینی پیرەژنان دەخواست کە دینداری بە نەزانی دەکەن، واتە خۆزگەی دەخواست لە فەلسەفەو علم الكلام و ئەو باسانە هەرگیز ئیشی نەکردایە، ئەگەر چی وەکو هەندێك لە لێکۆڵەرەوان دەڵێن ئەوان بۆ مەزهەبی سەلەف نەگراونەتەوە، بەڵکو بۆ مەزهەبی التفويض گەڕاونەتەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ناراستی و هەڵەی مەزهەبەکەی حۆیانیان بۆ دەرکەوتووە.

# بۆچی ئەشاعیره زۆرترن؟ (ابن حجر العسقلاني) وەڵام دەداتەوە

له کتێبی (الدرر الكامنة في أعيان المائة الثامنة) که کتێبێکی گرنگی مێژوونووس و فەرموودەناسی بەناوبانگ (ابن حجر العسقلاني) یە، دەربارەی مێژوو و ژیاننامەی ئەو زانا و ناودارانەی که له سەدەی هەشتەمی کۆچیدا ژیاون و یەکێك لەوانە زانای گەورەو پایەدار ابن تيمية یە، نەك تەنها زۆر حەقیقەتی سەرنجڕاکێشی دەربارەی ئەو زانا خستووەتەڕوو، بەڵکو چەند حەقیقەتێکی زۆر گرنگی دەربارەی ئەشعەرییەکانیش باس دەکات که ناحەز و نەیاری ابن تيمية بوونه و ئەوە دەردەخات که چۆن عەقیدەی خۆیان بە تۆپزی و بە هێزی دەسەڵات سەپاندووەته سەر خەڵکیدا، لێرەدا چەند خاڵێك لەو بارەوە دەخەمە روو:

١ -ئەوەی که دەوترێت زانایان لەسەر مەزهەبی (ابن تيمية) نەبوونه و زۆربەیان ئەشعەری بوونه لەو کتێبەی (ابن حجر) دا دەردەکەوێت که وا نییه و ئەو قسەی ئەوان خیانەتێکه له مێژوو کردوویانه.

(ابن تيمية) که مونازەری لەگەڵ دەکردن و سەریش دەکەوته سەریاندا وەکو ئەو مونازەری که لەگەڵ الزملكاني ئەنجامیدا، دواتر قازی شافیعی که شافیعییەکان ئەشعەری بوون، یان قازی حەنەفی بانگیان دەکرد و زیندانیان دەکرد و هەندێ جار بەبەرچاوی خەڵکەوە لێیان دەدا و سووکایەتییان پێ دەکرد.

٢ -ئەشعەرییەکان کە خاوەنی دەسەڵات بوون لەو سەردەمەدا، لەگەڵ (ابن تیمیة) و قوتابییەکانی - وەکو ابن حجر دەڵێت - هەمیشە بە زەبری هێزو دەسەڵات مامەڵەیان کردووە، فەرمانیان دەرکردووە بە قەدەغەکردنی قسەو فەتوادان لەسەریان، زیندانیان کردوون، هەروەها قازێکانی سەربەخۆیان لە ئەشاعیرە و جەهمییەکان ئەوانیان لەسەر عەقیدەو بیروڕاکانیان تەعزیر کردووە. ئەشاعیرە بەم شێوە لەو سەردەمەدا مەزهەبی خۆیان بڵاودەکردەوە.

٣ -لە میسریش بەهەمان شێوە حەنبەلییەکان کە مەبەست پێیان شوێنکەوتووانی فەرموودەو سوننەتە، زۆر لەسەر دەستی دەسەڵاتی ئەشاعیرە ئازار دەدران و سووکایەتییان پێ دەکرا، تەنانەت (ابن حجر ) لەو کتێبەیدا دەڵێت بە زللە لەبەرچاوی خەڵکیدا لێیان دەدرا.

٤ -لەو سەردەمەدا هەر مەزهەبێك و قازی خۆیان بووە، وەکو ئەوەی چوار دین بێت و تەنها ئیسلام دینی هەموو لایەك نەبێت، زۆربەی سەرانی هەرسێ مەزهەبی حەنەفی و شافیعی و مالیکی جیاوازییان نەبووە لە مەسەلەی سەرخستنی فیکر و عەقیدەی ئەشاعیرە و هەموویشان خاوەن دەسەڵات بوونە، (ابن حجر) دەڵێت جارێکیان قازییەکی مالیکی ناردی بەشوێن (ابن تیمیة)دا و لەسەر هەندێك لە قسەو فەتواکانی، ئەویش ڕازی نەبوو بچێتە بەردەمی و وتی ئەو دوژمنمە چۆن ئەبێت ببێتە دادوەر بەسەرمەوە، بەڵام ئەو فەرمانی زیندانی بۆ دەرکرد.

٥ -(ابن حجر) دەڵێت بە فەرمانی دادوەرە مالیکییەکە (ابن تیمیة) لە بورجێکدا زیندانی کرا، بەڵام خەڵکی سەردانیان دەکرد و ئەویش قسەو وانەی

هەبوو بۆیان، (ابن حجر) دەڵێت کاتێك قـازی لەوە ئـاگەدار کـرایەوە، وتـی ئەگەر (ابن تیمیة) نەشکوژرێت (چونکە تەکفیـری کردبـوو و خـوینی بە حەڵاڵ دەزانـی) دەبێت سەغڵەت بکرێت و ڕێگە نەدرێت قسە بـۆ خەڵکـی بکـات، ئەوەش بەڵـگەیە لەسەر ئەوەی ئەشاعیرە چۆن عەقیـدەی خۆیـان بە زۆر و بە پشـتگیری دەسـەڵات بڵاو کردووەتەوە.

٦ -هەر لەو کتێبەی (الدرر الکامنة) دا داهاتووە، لەناو شاری دیمەشقدا، جـاڕ درا، کێ باوەڕی بە ابن تیمیة هەبێت و لەسەر عەقیـدەی ئەو بێـت خـوێنی حەڵاڵە، هەموو ئەم ڕێوشوێنە ناشەرعی و پـڕ لە دەمـارگیری و نامیهربـانییەی کە ئەشـاعیرە دەیانکرد لە رێگەی قازی و کاربەدەسـتەکانیانەوە ئەنجامیـان دەدا، ئەمەش تیشـك دەخـاتە سـەر ئەو قسـەی ئەوان کە دەڵـێن ئەشـاعیرە زۆر بـوونە، چـونکە بـئەوان بانگەشـەی ئەوە دەکەن ك بەڵـگەی زانسـتی و حەق لەلای ئەوان بـووە و ئەوەش دەردەخات کە مەسەلەکە وا نەبووە، بەڵکـو نهێنـی ئەو پرسـە ئەوە بـووە کە ئەوان هەمیشـە چەقـۆی بـێ ئینسـافی و بـێ ویژدانیـان لە دژی (ابـن تیمیـة) و (أهـل الحدیث)دا لەبەرکار و تیژ بووە.

٧- ئەشاعیرە دەڵێن ئێمە بەڵگەی زانستیمان پییە و زانایـان لەگەڵ ئـێمەن بـۆیە زۆرترین، بەڵام وەکو بانگخوازێکی بەڕێز لە کاتی باسکردنی ژیاننامەی

(ابن تیمیة) لە کتێبی (الدرر الکامنة)دەلێت، ئاخر ئێوە خوێنی زانایانی ترتان لە غەیری خۆتان حەڵاڵ کرد و بە زەبری دەسەڵات و زیندانی کردنـی نەیارەکانتـان هەمیشە ڕەفتارتان کردووە، ئیتر ئەوە چ بەڵـگەو زانسـتێکە باسـی دەکەن. تەنـانەت

ئەوانەش کە باوەڕیان وەکو عەقیدە و باوەڕی ئێوە نەبوو ، ترسان و خۆیان لە شەڕو خراپەی ئێوە پاراست و نەیانتوانی قسە بکەن.

٨ - لەو سەردەمەی کە (ابن حجر) باسی دەکات بە زۆر ئەوانەی لەسەر مەزهەبی حەنبەلی بوون کۆ دەکرانەوە بە زۆر و هەڕەشەی کوشتن مەزهەبیان پێ دەگۆڕدرا و دەکرانە شافیعی، مەزهەبی شافعیش لە بیروباوەڕدا ئەوەش جۆرێك بوو لە شێواندنی حەق و ڕاستی چونکە مەبەستیان پێی عەقیدەی ئەشاعیرە بوو نەك ئەشعەری خۆیشی، چونکە مەعلومە کە ئەبو حەسەنی ئەشعەری لە کۆتایی ژیانیدا لە زۆرێك لە بیروباوەڕەکانی گەڕایەوەو چووە سەر عەقیدەو بیروباوەڕی ئەحمەدی کوڕی حەمبەل.

٩ -ئەوەشی باسکردووە کە ئەوەی ڕێگر بوو لە کوشتنی ا (ابن تيمية) ئەوەبوو، هەندێ جار لەناو قازییەکاندا یەکێکیان ئیتر لەبەر هەر هۆکارێك بێت ڕێگر دەبوون لە دەرکردنی ئەو بڕیارە، ئەگینا ئەوان کوشتنیان لە زیندانی کردنی پێ باشتر بوو.

١٠ -یەکێکی تر لە هۆکارەکانی ئازار و ئەشکەنجەی (ابن تيمية) ئەوە بوو ڕووبەڕووی هەموو موبتەدیعێك دەبوویەوە، (ابن حجر) لەو کتێبەیدا باس لە کەسێك دەکات بەناوی (نصر بن منبج) کە شوێنکەوتوی (ابن عربي الطائي) سۆفی بووە و (ابن تيمية) ش ئەوی تەکفیر کردبوو. بۆیە ئەو نەسری کوڕی مەنبەجە دەچێتە لای بەیبەرسی سوڵتانی میسر کە نزیك دەبێت لێی و لە دژی (ابن تيمية) هانی دەدات، لەڕاستیدا ئەوە پیشەی هەمیشەیی جەهمی و ئەشعەرییەکان بووە کە پەنایان بۆ ئەو جۆرە کارە دزێوو ناشیرینە لە دژی نەیارەکانیان بردووە ، ئەوەش بوو بە مایەی

ئەوەی قـازی مالکییەکـان ڕاسـپێردرا و ئـازاری زۆری شـوێنکەوتوانی مەزهەبـی حەنبەلیدا، ئەوەشی سەرنجڕاکێشە قازییەکی حەنبەلیش هەبوو کە (ابـن حجـر ) بە جاهیل ناوی دەبات، ئەڵێت ئەویش ڕازی بوو لەسەر ئەو ڕێوشـوێنە سـتەمکارانەی لە دژی (ابن تيمية) و حەنبەلییەکان گیراوەبەر، بێگومان دەسەڵاتی ئەوکاتەش ئەو قازییەی لەبەر ئەو لاوازی زانست و کەسایەتییەی لەو جیگەیە داناوە.

١١ -بەڵام خەڵکی حەقبێژ و خاوەن ئینساف لە ئوممەتی ئیسـلام نابڕێـت، بـۆیە (ابن حجر) باسی ئەوە دەکات کە لە شمس الدين الحريري کە قازی حەنەفییەکان بووە لە دیمەشق و دانی بەوەدا ناوە کە ابن تيمية زانـایەکی گەورەیە و سـێ سـەد ساڵیش دەبێت دونیا زانای وای بەخۆیەوە نەبینیوە، ئەمەش بوو بە هۆکـاری ئەوەی ئەشاعیرەکان ئەو قازییە بە هۆی ئەو قسە حەقەی دەربـارەی ابـن تيميـة کـردی لە سەر کارەکەی لابدەن، تاوانی ئەو قازییە تەنها ئەوەبوو پشـتگیری لە (ابـن تيميـة) کـرد! ئینجـا دەشـڵێن ئـێمە بەهـۆی زانسـت و بەبەڵـگەی شـەرعی زۆربـووینە و سەرکەوتووینەتە سەر نەیارەکانماندا.

١٢ -لەو سـەردەمانەدا قوتابخانەکـان بە دەسـتی ئەشـاعیرە خۆیـانەوە بـوو بە حـوکمی ئەوەی خـاوەن دەسـەڵات بـوون، بـۆیە بەڕێـوەبردنی هەمـووی بە کەسـی ئەشـعەری سەرسەخـت دەسـپێردرا، هەروەهـا مـزگەوت و دادوەرەکـانیش هەر خۆیان دایاندەمەزرانـد، جـگە لەوەش خانەقایـان هەبـوو بەهەمـان شـێوە دەدرا بە دەستی کەسانی ئەشـعەری و ئەوانـیش دەبـوون بە خـاوەن کـاریگەری زۆر لەنـاو

کۆمەڵگـادا و بەم شـێوە نەك بە هـۆی زانسـت و بەڵـگەی زانسـتییەوە مەزهەبـی ئەشاعیرە بڵاو بوویەوە.

١٣- (ابن تیمیة) زۆر کات زیندان دەکرا، دەوری چل ساڵ ئەو زانا بەرێـزە هەر زیندان دەکرا و ئازاد دەکرا و جارێکی تر زیندان دەکرایەوە، ئیتر ناوبەناو قازییەك خاوەن ویژدان پشتگیری لێ دەکرد و داوای ئـازادبوونی دەکـرد ئەشـعەرییەکانیش دەیانوت بەڵێ باشە، بەڵام با تەنازول لە عەقیدەکەی بکات بڵێت پەشیمانم، یان هیچ نەبێت لە هەندێ لە بیروباوەڕەکانی بگەڕێتەوە.

جارێکیان کە بە تکای کەسـایەتی پایەدارێـك ئـازاد دەکرێـت، بانـگ دەکـرێتە قەلعەی دیمەشق و وەکو لە کتێبی (الدرر الکامنة) دا هـاتووە، وا بـڵاو دەکـرێتەوە کە (ابن تیمیـة) وتـوویەتی بـووم بە ئەشـعەری کە بێگومـان وا نیـیە، لەبەر ئەوەی پێشەوایەکی گەورەی وەکو ابـن تیمیـة هەمـوو ژیـانی و کتێـبە زۆرەکـانی شـایەتن لەسـەر پـێچەوانەی ئەو بانگەشـەیە، بەڵام ئیـتر ئەوەش جۆرێـك بـوو لە جەنگـی دەروونی لە دژی خۆی و شوێنکەوتوانی.

١٤ -دوای ئازادکردنی لە قاهیرە نیشتەجێ بـوو، مـاوەیەکی زۆری پـێ نەچـوو سۆفییەکان لە قەلعەی دیمەشق سکاڵایان لەسەر (ابن تیمیة) تۆمار کرد و وتیـان قسە بە مامۆستا و مەشایخەکانمان دەڵێت و هەروەها دەڵێت درووست نیـیە هـاوار بە پێغەمـبەر صـلی اللـه علیـه و سـلم بکرێـت! بـۆیە جـارێکی تـر فەرمـانی دەستگیرکردنی بۆ دەرچوو و بۆ زیندانێك لە شاری ئیسکەندەرییە و پاش مـاوەیەك ئازاد کرا.

١٥ -جارێکی تر بە هـۆی ئەوەی ابـن تیمیـة بەڕەحـمەت بێـت فەتـوای لەسـەر ئەوەبـوو کە تەڵاقـی سـێ بە سـێ یەك دانەی دەکەوێـت نەك هەرسـێکی، دیسـان مەلاکانی ئەو سەردەمە کە زۆربەیان ئەشعەری و سەر بەدەسەڵات بـوون، لە سـاڵی ٧١٩ ی کۆچی لە دژی (ابن تیمیة) هەڵسانەوەو سـکاڵایان لەسـەری تۆمـار کـرد، ئەمەش بە هەمان شێوە لەبەر ئەو بۆچوونە جیاوازەی بـوو لەگەڵیـان کە هەنـدێ لە هاوەڵانیش لەسەر ئەو بۆچوونە بوونە، دیسان زیندان کرایەوە.

١٦ -جارێکی تر مەلاکانی ئەوکـاتە لەسـەری هەڵسـان بە هـۆی فەتـوایەکی کە تێیدا وتبووی زیارەتی قەبری پێغەمبەر صلی الله علیه و سـلم یەکـێکە لە (قربـات) بەڵام درووست نییە بەتایبەت سەفەری بۆ بکرێت، بەڵکو ئەگەر کەسەکە خۆی ڕێی کەوتە مەدینە بۆ ئیشی خۆی دەتوانێـت سـەردانی قەبـرەکە بکـات، لەسـەر ئەوەش دیسان سەرانی ئەشاعیرە هەڵسان بە زیندانی کردنی.

لەبەر ئەوەی نەیارەکـــانی ابـــن تیمیـــة دەیـــانزانی دەســـەڵات بە دەســـتی ئەشعەرییەکانەوەیە و دڵنیاش بوون لە هەڵوێستی ئەوان لە دژی (ابن تیمیة)، بـۆیە هەمیشە لە جیاتی ئەوەی گفتوگۆی زانستی لەگەڵ بکەن و قسە و بۆچوونەکانی بە بەڵگە بەرپەرچ بـدەنەوە، بەردەوام پەنایـان بـۆ دەسـەڵات دەبـرد و ئەوانـیش خێـرا فەرمانی دەستگیرکردنیان بۆ دەردەکرد !

(ابن تیمیة) زۆربەی ژیانە پر لە پێزەکەی لە زینـدانی ئەشـاعیرە جەهمییەکانـدا بردەسـەر، تەنهـا لەسـەر ئەوەی عەقیـدەیەکی ڕاسـت و درووسـتی هەبـوو و بەو لادانانەی ئەوان لە ئەسمائوسیفات و قەدەر و بابەتەکـانی تـری فیقهـو شـەریعەتدا

لەگەڵیان ناکۆك بوو ڕقیان لێ بوو،، (ابن تیمیة) لەسەر بنەمای کیتاب و سوننەت و تێگەیشتنی سەلەف بوو و بە مەزن رایدەگرتن، زانایەکی حەقبێژ و بەغیرەت بوو لەسەر دینەکەی، وەکو ئەوان نانی بە زانستی شەرعییەوە نەدەخوارد و بڕیاری کۆتایی دابوو خۆی بە هەموو ساتێکی ژیانیەوە بە قوربانی ئیسلام بکات و تا دوا هەناسە بەرگری لە عەقیدەو لە شەریعەتەکەی بکات، بۆیە زیندانی بە گەشت وگوزار دەزانی و دەیفەرموو چیم لێ دەکەن؟ من بەهەشتەکەم لەناو دڵ و سنگمدایە، هەزاران جار لە زینداندا قورئانی خەتم کرد و سەدان کتێبی نووسی و وەڵامی هەزاران پرسیاری دایەوە کە تاکو ئێستا وەکو مەشخەڵێکە بۆ موسوڵمانان، بۆیە دواجاریش هەر لە زینداندا وەفاتی کرد و الله بە کوێرایی چاوی ناحەزەکانی ناوی بەرز کردەوە و کردی بە پێشەوایەکی هەرە خۆشەویستی موسوڵمانان لە هەموو سەدەکاندا و کردی بە پێشەنگ و سونبولێك بۆ هەمووئیماندار و موەحیدێك.

١٧ -لەو وتانەی (ابن حجر) لە کتێبی (الدرر الکامنة)دا دەردەکەوێت کە ئەشاعیرە لە دژی (ابن تیمیة) کە کەسایەتییەکی ئیسلامی زۆر زانا و کاریگەر بووە، هەروەها لە دژی شوێنکەوتوانی و شوێنکەوتوانی مەزهەبی حەنبەلی کە ئەهلی فەرموودەو سوننەت بوونە، هەموو ڕێگەیەکی ناشەرعی و ستەمکارانە وتوندیان لە دژیان بەکارهێناوە و خەڵکیشیان ترساندووە و وتوویانە هەرکێ نەبێتە ئەشعەری حاڵی بە حاڵی ئەوان دەبێت، لە قسەکانی (ابن حجر )دەردەکەوێت کە ئەشاعیرە هەڕەشە و لێدان و زیندانیکردن و خوێن حەڵاڵ کردن و سووکایەتی کردنیان لە دژی نەیارەکانیان بەکارهێناوە.

١٨- بەڵگەی هەمو ئەم مەسەلانە و لەمانە زیاتریش لە کتێبـی (الـدرر الكامنـة) دا هـاتووە بـۆ کەسـێك بیەوێـت بیخـوێنێتەوە، لە یوتیـوبیش ڤیـدیۆیەك لەلایەن بانگخوازیکەوە تۆمار کراوە کە من سوودم لێ بینی باس لەم مەسەلە دەکات، بەڵام من خۆم بۆ بەرگی یەکەمی ئەو کتیبە گەڕامەوە و قسەکانی ا(بن حجر) م خوێندەوە کە لە لاپەڕە ١٤٤ بەداوە باسی ابن تیمیة دەکات و ئەو بەسەرهاتانە دەگێڕێتەوە؟

# ناوەڕۆک